- **تاعوون**
- نووسینی: ئەلبێر کامۆ
- وەرگێڕانی بۆ فارسی: رەزا سەید حوسێنی
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: رەسووڵ سوڵتانی
- نەخشەسازی ناوەوە:
- بەرگ: ئاکار جەلیل کاکەوەیس
- چاپی سێیەم: ٢٠١٥
- تیراژ:
- نرخ:
- چاپخانەی رۆژهەڵات
- ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی ی ساڵی ٢٠١١ پێدراوە.



# پێشەکی

## بە پێنووسی: فەرهاد پیربال

**راستییەکان دزێون،**
**ئێمە هونەرمان هەیە بۆ ئەوەی**
**هەر بە دیار راستییە ناشیرینەکانەوە نەڕزێینەوە.**

فرێدریك نیچە ١٨٨٨

ساڵی ١٩٩٢ کاتێ لە پاریس فیلمی (تاعوون)ی ئەلبێر کامۆم بینی، کە لە دەرهێنانی ڕێژیسۆرێکی ئەرژەنتینی بوو، لە کانگای دڵمەوە گریام و فرمێسك بە چاوانمدا هاتنە خوارەوە. هیوادارم لە دوای خوێندنەوەی ئەم وەرگێڕانە کوردییەی بەردەستت، بەهەمان شێوە، کاکی وەرگێڕ توانیبێتی ڕۆحی ڕۆمانەکە و رەهەندە ئێستێتیکییەکانی بەرهەمەکە، وەك کامۆ خۆی دەیەوێ، گواستبێتەوە.
گریانی دوای خوێندنەوەی ڕۆمانی (تاعوون) گریانی مرۆڤە بۆ دەستەوەستانیی "هەموو مرۆڤایەتی" لە هەمبەر چارەنووس و قەدەر. ژیان تراژیدیایە، بێهوودەییە. ئەمەیە ئەو ئاوێنەیەی کە کامۆ رووبەڕووی خوێنەری خۆی دەکاتەوە. با باوەڕ بهێنین بە هەبوونی ئەم بێهوودەییو تراژیدیایەی ژیان، پاش ئەمە هەر کەسێك ئەگەر توانیی قەدەرو دۆخ و چارەنووسی خۆی بگۆڕێ، با بیکا.

ژیان بیهوودەیە، کەواتە با لەدەست ئەم بێهوودەییە رزگاری بکەین...

ژیان ناماقووڵە، کەواتە با مەعقوولییەتێك ببەخشینە ژیان...

ژیان بێ مەعنایە، کەواتە دەبێ مەعنایەکی بۆ بدۆزینەوە...

ئەم لێکدانەوەیە لە بەهای ئێستێتیکیی دیدی کامۆ کەم ناکاتەوە، وەك چۆن لێکدانەوە مارکسی و ماتێریالیستە تەنگنەزەرەکانیش نەیاتوانی تۆزقاڵێك چییە لە هونەری ئەم نووسەر مەزنە کەم بکەنەوە، ئەو نووسەرەی کە تا مردیش، قەڵەمەکەی، بەردەوام خوێن دەگریا لە پێناو حاڵی بەدبەختیی مرۆڤ و تراژیدیای مرۆڤایەتیدا.

تا ساڵانی هەشتاکانیش باو بوو دەیانگوت" ئەلبێر کامۆ عەبەسییە و فەلسەفەی پووچی و بێهوودەیی بۆرژۆوا بڵاو دەکاتەوە". ئەمە لە کاتێکدا من ئەوساش، پێم وابوو: هیچ رۆماننوسێك نیە کە هێندەی ئەلبێر کامۆ گەشبین بێت!

ئەم وەرگێڕانە شیرینەی برای وەرگێڕ ( رەسووڵ سوڵتانی)، لەپاڵ وەرگرتنی چێژ لە چیرۆکەکە (وەرگرتنی چێژ لە دیڕ بە دێڕی شێوازی ئەلبێر کامۆ) هەڵبەتە یارمەتیی ئەوەشمان دەدا کە خۆمان راستەوخۆ کامۆ بناسین: نەك لە رێگەی ئەو حوکمدانە ئایدۆلۆژییانەی کە دەیانەوێ بەهرەی یەکێك لە گەورەترین رۆماننووسەکانی سەدەی بیستەم کەم بکانەوە، ئەو رۆماننووسەی کە فەلسەفەیەکی خەمخۆر و دڵسۆز بۆ مرۆڤایەتی، لە پشتەوەی هەموو رۆمانێکی بوو.

راستە، ئەلبێر کامۆ لەو رۆماننووسانەیە ( وەك ژان پۆڵ سارتر) کە فەلسەفە لە رێگەی رۆمان و شانۆنامەکانیەوە دەردەبڕێ، بەڵام ـ راستییەکەی ـ خۆ هونەری رۆماننووسینیش هەر دەبێ وابێ: رۆمانێك ئەگەر فەلسەفەیەکی شەخسی یا دیدێکی قووڵی تێدا نەبێ بە هیچ شێوەیەك ناگاتە ئاستی هونەر.

من بۆخۆیشم لە ئەلبێر کامۆوە فێر بووم: نەك تەنیا رۆمان و شانۆنامە و چیرۆك، بەڵکو وتارێکیش، تەنانەت یەك رستەی ناو هەر نووسینێکیش پێویست وایە بارگاوی کرابێ بە قووڵترین هەست و نەست و فیکری شەخسی، ئنجا بکەوێتە سەر کاغەز.

زۆر شتی دیکەش...

زۆر شتی دیکەش لە ئەلبێر کامۆوە فێر دەبین...

ئەم لاپەڕە جوانانەی لێرە بەملاوە هاوڕێتان دەبن، هاوڕێتان دەبن...

**فەرهاد پیرباڵ**

**هەر گەل و نەتەوە و تاقم و دەستەیەك، دووبەرەكێیان تێكەوت و پێك نەهاتن، هەر شار و وڵاتێك بیرکردنەوە و هاریکاری و مشوورخواردنی یەكتر و خۆشەویستیی تێدا نەما، تاعوونی بەسەردا دێ و بە نازڵبوونی تاعوون لەوانەیە بیر لە ئەڤین و خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی بكەنەوە. تاعوون نەبێ هەمووان بۆگەن دەبن. كەس دەستی كەس ناگرێ كەس پێناكەنێ و كەس نازانێ تامی خۆشەویستی چییە. تاعوون مانای بەهار دەگەڕێنێتەوە بۆ بزە و ناهێڵێ لەبیر بچێتەوە. كوردیش وەك نەتەوەیەك تەنیا لە سەردەمەكانی تاعووندا بیری لەو شتانە كردووەتەوە. ئەو كاتەی تاعوونەكەی ئەنفال و كیمیابارنەكەی هەڵەبجە و كوردقڕانەكانی ڕۆژهەڵاتی كوردستان لە گۆڕێ بوون، هەموومان بە زارێك هاوارمان دەكرد و بە چاوێك دەگریاین.**

**ڕەسووڵ**

ئەو رووداوە سەیروسەمەرانەی وا بوونەتە هەوێنی ئەم سەربردە و رووداونامەیە، ساڵی هەزارونۆسەد و چل و... لە ئەران قەومان. هەمووان پێیان وابوو ئەو رووداوانە کە تا ڕادەیەك نائاسایی بوون، لە خۆڕا بەسەر ئەو شارە هاتبوون. چونکە، یەکەم، ئەران شارێکی ئاساییە و هەر ئەوەندەیە میرنشینێکی فەڕەنسییە لە کەناری ئەلجەزایر.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە شارەکە هەر خۆی ناشیرینە. دیمەنێکی هێمنی هەیە و زۆری دەوێ بزانی چ شتێك ئەم شارە لە هەموو شارە بازرگانیەکانی تری شوێنە جۆراوجۆرەکانی دنیا جیا دەکاتەوە.

بۆ وێنە چۆن دەکرێ شارێك بێنیتە بەرچاوی خۆت، نە کۆترێکی تێدابێ و نە درەختێك و نە باخێك و، نە فڕەی باڵی باڵندەیەکی لێوە بێ و نە خشەخشی گەڵایەك. کورتی بڕینەوە شوێنێکە رووت و رەبەن. ئاسمانت لێ دیار نەبێ، هەر ناشزانی کەی وەرزەکانی ساڵ دەگۆڕێن. هەتا کەشوهەواکەی نەگۆڕێ و منداڵە گوڵفرۆشەکان نەبینی کە لە دەوروبەری شارەوە گوڵ دێننە شاری، هەر نازانی بەهار هاتووە. ئەوە بەهارێکە، کە لە بازاڕەکاندا دەیفرۆشن. هاوینانە، خۆر خانووە وشك و برینگەکان هەڵدەگرێنێ و دیوارەکان بە خۆڵەمێشێکی تۆخ دادەپۆشێ. ئیتر وای لێ دێ، لەودیو پەنجەرە داخراوەکانەوە نەبێ، کەس ناژی. بەپێچەوانەوە پاییزان لێشاوی قوڕ و لیتە دەکەوێتە رێ. تەنیا رۆژەکانی زستان خۆشن.

رێیەکی سادە بۆ ناسینی شارێك ئەوەیە، کە بزانی خەڵکی ئەو شارە چۆن کار دەکەن، چۆن خۆشەویستی دەکەن و چۆن دەمرن. لە شارە بچکۆلانەکەی ئێمەدا، دەڵێن لە سۆنگەی کەشوهەواکەوەیە، کە ئەو سێ شتە، هەر سێکیان بە کەفوکوڵ و وڕی و کاسی دەکرێن. واتە بنیادەم، هەم بێتاقەت دەبێ و هەمیش هەوڵ دەدا لەگەڵی رابێ. خەڵکەکەی ئێمە خۆیان بەکارەوە کوشتووە، بەڵام تەنیا و تەنیا بۆ ئەوەی دەوڵەمەند بن.

بەتایبەتی حەزیان لە بازرگانیە و خۆیان واتەنی بازرگانییان لە هەموو شتێك پێ باشترە. دیارە هەندێ شتی خۆشیشیان حەز لێیە: ژن و سینەما و مەلەی نێو دەریایان زۆر پێ خۆشە. بەڵام ژیرانە ئەو شتە لاوەکیانە هەڵدەگرن بۆ شەممە و یەکشەممە و، باقی رۆژەکانی دیکەی حەفتە هەوڵ دەدەن پارەی زۆر کۆ بکەنەوە. ئێواران کە لە ئیدارە دێنە دەرێ، لە سەعاتێکی دیاریکراودا لە کافتریاکان کۆ دەبنەوە یان هەر لەو پیادەڕێیە پیاسەی دەکەن، یان ئەوەتا دێنە سەر بانیژەکان. ئەوانەی گەنجترن، تاسەبارتر و تامەزرۆترن، بەڵام زووتر واز دێنن، کەچی حەز و هۆگریی گەورەکان لە دەستەی تەقڵە و جلیتبازی و کۆڕی میوانیی شەوانە و ئەو کۆڕانە ناترازێ، کە لەوێدا چارەنووسی کۆڵێك پارە بە دەستی رێکەوت دەسپێرن.

لەوانەیە بڵێن، جا خۆ هەر شارەکەی ئێوە وا نیە، بە گشتی خەڵکی ئەم دەوروزەمانەیە هەر هەموو ئاوان. لەوانەیە ئەمڕۆکە هیچ شتێك لەوە ئاساییتر نەبێ کە سەیر بکەین ئەوا خەڵك لە کەڕەی بەیانیەوە تا شەوێ کار دەکەن، بۆ ئەوەی، باقیی ئەو کات و ساتەی ناویان ناوە ژیان، لە قومار و کافتریا و چەنەوەڕیدا بەفیڕۆی بدەن. بەڵام شار و وڵاتی وایش هەن، کە خەڵکەکەیان فکری شتی دیکەشیان بە زەینیدا دێ.

بە گشتی، ئەو شتە ژیانیان ناگۆڕێ، ئەوە هەر بیرۆکەیەکە و هیچی دی. ئەران، بەپێچەوانەوە لە شارێك دەچێ بیرکردنەوەی تێدا نەبێ. یانی شارێکی تەواو نوێیە. کەواتە هیچ پێویست نیە لە بنی کوولەکەی بدەم، کە خەڵکی شارەکەی ئێمە چۆن دڵداری دەکەن. ژن و پیاو، بەو شتەی ناویان ناوە ئەشق، یەکتر هەڵدەلووشن، یان خۆیان دەدەنە دەست حەز و متوویەکی دوورودرێژی دوولایەنە. لە نێوان ئەو دوو زێدەڕۆییەدا، زۆربەی جاران ئاستێکی نێونج نیە. ئەوەش بێ پێشینە نیە. لە ئەرانیش هەر وەك شوێنەکانی دی، لەبەر نەبوونی کات و بیرکردنەوە، بنیادەم ناچارە بەبێ ئەوەی بزانێ بۆچی، خۆشەویستی بکا.

ئەوەی لە شارەکەی ئێمەدا نوێیە ئەو حاڵەتانەیە کە بۆ مردن دێنە پێش. لێرەدا وشەی "حاڵەت" وشەیەکی گونجاو نیە و ئەگەر لەبری ئەو، وشەی "ئازار" دەکار بێنین راستتر دەبێ. نەخۆشبوون شتێکی خۆش نیە، بەڵام شار و وڵاتی وا هەن کە لە کاتی نەخۆشیندا پشتگیریت لێ دەکەن و لەوێدا مرۆڤ دەتوانێ بە شێوەیەك خۆ بداتە دەست نەخۆشینەوە. هەموو نەخۆشێك پێویستی بە دلۆڤانی و بەزەیی هەیە و حەزی لێیە پشت و پەنایەکی هەبێ. ئەوەش سروشتییە، بەڵام لە ئۆران گەرمای هەوا، گرینگیی ئەو ساتوسەودایەی کە دەکرێ و پووچبوونی دیمەن (.........) و خێرایی زەردەپەڕ و چۆنێتی مەیل و حەزەکان لەسەر یەك پێویستییان بە لەشساغیە. مرۆڤی نەخۆش لەوێ خۆی بە لێقەوماو دەزانێ. بینادەمێك بێننە بەرچاوتان کە لە سەرەمەرگدایە و لە بازنەی سەدان دیواردا کە لەبەر تەوژمی گەرما خەریکن شەقار شەقار دەبن، قەتیس ماوەتەوە و رێك لەو کاتەشدا تەواوی خەڵکی شار لە تەنیشت تەلەفۆنەوە یا لە کافتریاکاندا باسی سوود و بەرنامەی گواستنەوەی بار و قازانج دەکەن. بەو شێوەیە دەکرێ بزانین مەرگ چەندی مۆدێرنیش بێ، لەوەها شارێکی قاقڕدا چەندە ناخۆشە.

لەوانەیە ئەم چەند ئاماژەیە بتوانێ وێنەیەکی روون لە شارەکەی ئێمە بە دەستەوە بدات. لەسەریەك نابێ زۆری پێوە بنێین. ئەوەی شیاوی باسکردنە، دیمەنی ناشیرنی ژیان و شارەکەیە، بەڵام مرۆڤ هەر ئەوەندەی خووی پێوە گرت، ئیتر رۆژ و ژیانی بەبێ چەرمەسەری تێدەپەڕێ. ئێستێ کە شارەکەمان بۆ خووپێوەگرتن لەبارە، دەکرێ بڵێین هەموو شتێك چۆنی دڵ دەخوازێ وایە. لەوانەیە ژیان ئاواش زۆر هەژێنەر نەبێ، بەڵام لانیکەم نارێکی و بێ سەروبەرەییش لە گۆڕێ نیە و خەڵکە راستگۆ و خۆشەویست و چالاکەکەی ئێمە، بەردەوام سەرنجی گەشتیارانیان راکێشاوە. ئەم شارە بێبەری لە جوانی و سەوزەڵان و بێگیانە، هێورکەرەوە دیارە و مرۆڤ دەتوانێ تێیدا بنوێ، بەڵام شیاوی ئەوەیە کە ئەمەشی لێ زیاد بکەین کە شارەکەی ئێمە لەسەر دیمەنێکی بێوێنە دامەزراوە. کەوتووەتە نێوان پێدەشتێکی رووتەن کە دەوراندەوری بە تەپۆڵکە و گردی درەوشاوە گیراوە و کەنداوێکی جوانی بە بەرەوەیە. دەبێ خەفەت لەوە بخۆی،

که شارەکە پشت بەو کەنداوە دروست کراوە، کەوابوو ناکرێ دەریا ببینی و بەردەوام دەبێ چاوی بەدوودا بگێڕیت.

هەتا ئێرە بە ئاسانی دەکرێ بڵێین هیچ شتێك لە گۆڕێ نەبوو کە خەڵکەکەی ئێمە چاوەڕوانی ئەو ڕووداوانە بن وا لە بەهاری ئەو ساڵەدا ڕوویان دا. دواتر زانیمان ئەم ڕووداوانە یەکەمین دەرکەوتە و نیشانەکانی ئەو زنجیرە ڕووداوە کارەساتبارانە بوون کە بڕیارە لێرەدا تیشکیان بخەمە سەر. ئەم ڕووداوانە بە لای هێندێ کەسەوە شتێکی ئاسایی و سرووشتین و خەڵکێکیش هەر بڕوا ناکەن، بەڵام سەرەڕای ئەوانەش نووسەری ڕووداوەکان، ناتوانێ گرینگی بەو لێکدژییانە بدا. ڕووداونووس، وەختێك بزانێ بە ڕاستی شتێك قەوماوە و کاری کردووەتە سەر ژیانی نەتەوەی و، بلێی و نەڵێی هەزاران کەسی شایەتی ڕووداوەکەش ئامادەن لە دڵەوە قسەکانی پشتڕاست بکەنەوە، ئیدی لەسەریەتی بڵێ "ئەم ڕووداوە قەوماوە."

جگە لەوەش، گێڕەرەوە (ئەوەی ڕووداوەکەتان بۆ دەگێڕێتەوە) کە دواتر دەیناسن، ئەگەر لەوەدا شانسی نەبوایە کە هێندێ کەس بە شایەت بگرێ و ئەگەر ڕەوتی ڕووداوەکانیش نەیانخستبایەتە نێو جەرگەی ئەو شتەوە وا دەیەوێ بیگێڕێتەوە، بایی ئەوە نەبوو وەها شتێك بگێڕێتەوە. هەر ئەوەشە ئەو ئیزنەی پێ دەدا وەکوو مێژوونووسێك هەڵسوکەوت بکا. هەموان دەزانن مێژوونووس تەنانەت ئەگەر بۆ دڵی خۆیشی مێژوو بنووسێتەوە، بەردەوام کۆمەڵێك سەرچاوەی لەبەردەست دایە. ئەوەی ئەم چیرۆکەشتان بۆ دەگێڕێتەوە، هێندێ سەرچاوەی لەبەر دەستدا هەن:

لەپێشدا ئەوەی بە چاوی خۆی دیتوونی، لە پاشان ئەو شتانەی خەڵکی دیکە بینیویانن! چونکە لە سۆنگەی پیشەکەی خۆیەوە، ناچار بوو گوێ لە دەردەدڵی تەواوی ئەوانە ڕاگرێ وا ئەو ڕووداوەیان بە چاوی خۆیان بینیوە و، لە کۆتاییدا کۆمەڵێك بەڵگەی نووسراوی وەدەست کەوتن و ئێستاش دەیەوێ لە هەر جێیەك پێویست بوو بیانخاتە ڕوو و، بە هەر شێوەیەك دڵی بخوازێ کەڵکیان لێوەرگرێ. دەشیهەوێ..، بەڵام لەوانەیە کاتی ئەوە بێ کە ڕوونکردنەوە و

قسەکردن وەلاوە بنێین و بچینە سەر چیرۆکەکە. باسی ڕووداوەکانی یەکەم ڕۆژەکان تا ڕادەیەك پێویستیی بە مووئەنگێوی[1] و لێوردبوونەوە هەیە.

[1] وردبینی، حاجی قادر دەڵێ: مووی دەئەنگاوت بە تیرەکی فیکری

## (٢)

سەر لە بەیانیی رۆژی ١٦ی ئەپریل، دوکتۆر بێرنارد ریڤۆ لە عەیادەکەی خۆی هاتە دەرێ و لە نێوەڕاستی پێگۆڕکە*ی پلیکانەکان تووشی مشکێکی تۆپیو هات. لەو کاتەدا بەبێ ئەوەی بەلایەوە گرنگ بێ، بە نووکە شەقێك لای دا و لە پێپلیکانەکان رۆیشتە خوارێ، بەڵام کاتێك گەیشتە کۆڵانەکە بە بیریدا هات کە ئەو مشکە نەدەبوو لەوێ بێت و گەڕاوە بۆ ئەوەی فەڕاشەکە ئاگادار بکاتەوە. کەچی بە دیتنی دژکردەوەی فەڕاشە بەساڵاچووەکە واتە"میشێل"، ، پتر لێی روون بۆوە، کە دۆزینەوەکەی شتێکی نائاساییە. بە لای ئەوەوە مشکێکی تۆپیو لەوێ، تەنیا شتێکی سەیروسەمەرە بوو، کەچی بە لای فەڕاشەکەوە هەر کارەساتێك بوو. جگە لەوەش فەڕاشەکە لەخۆڕادیتوانە قسەی دەکرد: ئەو دڵنیا بوو لەوەی، ئەم ماڵە قەت مشکی نەبووە. دوکتۆر لە خۆڕایی دەیویست قایلی بکات کە لە پێگۆڕکەی پلیکانەکانی نهۆمی یەکەم مشکێکی لێیە و لەوانەشە تۆپیبێ. ئاغای میشێل لە باوەڕەکەی خۆی دانەدەبەزی: ئەو بینایە مشکی نەبووە و بە دڵنیاییەوە ئەو مشکەیان لە دەرەوەڕا هێناوە. بە کورتی تیتاڵێك لە ئارادا بوو.

هەر ئەو شەوە بێرنارد ریڤۆ لە دالانی ماڵەکەی راوەستابوو و بەر لەوەی لە پلیکانەکان وەسەر کەوێ بە شوێن کلیلەکانیدا دەگەڕا. لەو دەمەدا چاوی بە جرجە مشکێك کەوت کە ئۆقرەلێبڕاو و بە تووکە خووساوەکانیەوە لە ناخی تاریکایی دالانەکەوە هاتە دەرێ. ئاژەڵەکە هەڵۆێستەیەکی کرد، دیار بوو دەیەوێ خۆی بەسەر پێوە راگرێ، دواتر بەرەو لای دوکتۆر رای

* پێگۆڕکە، ئەو وشوێنەی کە پێپلیکانەی نهۆمێك دەسووڕێتەوە بۆ نهۆمێکی دیکە.

کرد و خولێکی بەدەوری خۆیدا لێدا و زیقەیەکی لێ هات و لە کاتێکدا کە خوێن لە نێو زارە داپچڕاوەکەیەوە فیشقەی دەکرد، بەلادا‌هات. دوکتۆر ساتێك لە مشکەکە ورد بۆوە و دوایی بە پلیکانەکاندا سەر کەوت و بەرەو باڵەخانەکەی خۆی کەوتە رێ.

بیری لە مشکەکە نەدەکردەوە. ئەو خوێنەی فیشقەی کردبوو، نیگەرانیەکانی خۆی وەبیر دێناوە. ژنەکەی کە لە ساڵی رابردۆوە نەخۆش بوو، دەبوایە سبەینێ بۆ پشوودان بچێتە هاوینەهەوارێك. هەر بەو جۆرەی پێشتر پێی وتبوو لە ژوورەکەی خۆیان لە نێو جێوبانەکەیدا راکشابوو. ژنەکەی ئاوا خۆی بۆ ماندوویی و شەکەتییەکانی سەفەر ئامادە دەکرد. بە بزەیەکەوە وتی:

ـ زۆر باشترم.

دوکتۆر چاوی لەو روخسارە دەکرد کە لە بەرە تیشکی چراکە بەرەو لای وی وەرسووڕابوو. ئەم روخسارە سی ساڵانەیە، لە بەرچاوی ریڤۆ سەرەڕای ئەوەی پێوەی دیار بوو نەخۆشە، بەڵام هەر روخسارەکەی سەردەمی لاوەتی بوو: لەوانەیە لە سۆنگەی ئەو بزەیەوە بێ وا، هەموو شتێکی دیکەی لە خۆیدا دەتواندەوە. گوتی:

ـ ئەگەر دەتوانی بخەوە. پەرستارەکە سەعات یازدە دێ و ئەمن بە شەمەندەفەری دوانیوەڕۆ دەتگەیەنمێ.

نێوچاوانە تۆزێك شێدارەکەی ماچ کرد. بزە، هەتا بەر دەرگا بەڕێی کرد.

بەیانیی رۆژی ١٧ ی ئەپریل، سەعات هەشت، فەڕاشەکە پێشی بە دوکتۆر گرت و تاوانەکەی خستە ئەستۆی خەڵکێکی مێملێ و نارەسەن کە سێ مشکی مردوویان فڕێدابووە نێوەڕاستی داڵانەکەوە. بە دڵنیاییەوە ئەم مشکانەیان بە تەڵەی گەورە گرتبوو، چونکە هەرسێکیان شەلاڵی خوێن بوون. فەڕاشەکە بۆ ماوەیەك لاقی مشکەکانی گرتبوو و، هەر لەوێ لە بەر دەرگا راوەستابوو بەشکم ئەوانەی وایان کردووە، بە دەم گاڵتەوە خۆیان ئاشکرا بکەن، بەڵام هیچ شتێك دەرنەکەوتبوو. ئاغای میشێل دەیگوت:

ـ ئاخ، ئاخرییەکەی ئەوانە دەکەونە بەردەستم.

ریڤۆ کە سەری سوور مابوو، بڕیاری دا بچێتە سەردانی نەخۆشەکانی خۆی لە گەڕەکانی دەرەوەی شار، کە هەژارترین مشتەرییەکانی لەوێ دەژیان. لەو گەڕەکانەدا زبڵوزاڵ زۆر بە درەنگییەوە کۆ دەکرانەوە و کە ترۆمبێل بە ڕێگە راست و پڕ لە خۆڵوخاکەکانی ئەو گەڕەکانەدا تێدەپەڕی،، لەو زبڵدانانە دەخشکا، کە لە قەراغ شۆستەکە دانرابوون. لە یەکێك لەو جۆرە کۆڵانانەدا دوکتۆر دوازدە مشکی ژمارد، کە فڕێ درابوونە نێو وردە سەوزە و پەڕۆوپاڵە پیس و کۆنەکانەوە.

یەکەم نەخۆشی لە نێو جێوبانەکەیدا و لە ژوورێکی کە دەیڕوانیە کۆڵان و، هەم ژووری نوستن بوو و هەمیش نانی نیوەڕۆیان تێدا دەخوارد، بەسەر کردەوە. پیرە مێردێکی ئیسپانیایی بوو کە روخسارێکی چرچ لۆچ و مرچومۆنی هەبوو. دوو قابڵەمەی پڕ لە نۆك، لەسەر لێفەکەی دانرابوو. کە دوکتۆر وەژوور کەوت، پیرەنەخۆش ئاخێزی* کردبوو و سەری بەرەو دواوە دەبرد، هەوڵی دەدا هەناسەی بە لرخەی پشووسوارییەکەی وەبەر بێتەوە. ژنەکەی تەشتۆکەیەکی بۆ هێنا. لە جەنگەی دەرزی لێدانیدا نەخۆشە گوتی:

ـ ئەها دوکتۆر، خەریکن دێنە دەرێ.دیتووتن؟

ژنە گوتی:

ـ بەڵێ جیرانەکەمان سێی گرتوون.

پیرەمێرد دەستی رێك دەخشاندن:

ـ دێنە دەرێ. زبڵدانەکان هەموو پڕ بوون. لە برسانە.

زۆری نەبرد کە ریڤۆ لێی روون بۆوە، تەواوی خەڵکی گەڕەك باسی مشکان دەکەن. کە چاوپێکەوتنەکانی تەواو بوون و گەڕاوە ماڵێ، ئاغای میشێل گوتی:

ـ تەلەگرافێکت بۆ هاتووە، لە سەرێیە.

دوکتۆر لێی پرسی: ئاخۆ دیسان مشکی دیتووە؟

فەڕاشەکە گوتی:

ـ همم، نەخێر، ئەو بێشەرەفانە دەزانن خۆم لێ گرتوون، ئیتر ناوێرن.

---

* ئاخێز : واتە هەستان بە نیشانەی حورمەت هەستانی بە نیوە. بە حاستەم قوون بزاوتن بە نیشانەی رێز

لە تەلەگرافەکەدا نووسرابوو سبەینێ دایکی ریڤۆ دێ. دەهات بۆ ئەوەی لە نەبوونی بووکەکەیدا بە ماڵ و حاڵی کوڕەکەی رابگا. کە دوکتۆر گەیشتەوە ماڵەکەی، پەرستارەکە لەوێ بوو. ریڤۆ سەیری کرد ژنەکەی بە پێوە وەستاوە. چاکەت و تەنوورەکەی پۆشیوە و خۆی جوان کردووە. دوکتۆر بە بزەیەکەوە گوتی:

ـ باشە! زۆر باشە.

ساتێك دواتر لە وێستگەی شەمەندەفەر ژنەکەی لە فارگۆنێکدا کە تەختی خەوی تێدابوو، دادەنیشاند. ژنەکەی چاوی بە فارگۆنەکەدا دەگێڕا و دەیگوت:

ـ ئەوە بۆ ئێمە زۆر گران دەکەوێ. وا نیە؟

ریڤۆ گوتی:

ـ چارە نیە.

ـ مەسەلەی ئەو مشکانە چییە؟

ـ نازانم. سەیرە، بەڵام تەواو دەبێ.

دواتر بە پەلەپەل داوای لێبوردنی لە ژنەکەی کرد و پێی گوت، دەبوایە خۆم چاوم بەسەرتەوە بێ، بەبووره زۆرم کەمتەرخەمی کردووە. ژنەکەی جۆرێك سەری بۆ راوەشاند کە وەك بڵێی داوای لێ دەکا بێ دەنگ بێت، بەڵام ریڤۆ لەسەری رۆیشت:

تا دەگەڕێیەوە هەموو شتێك چاك دەبێ. دیسان ژیان دەست پێ دەکەینەوە.

چاوی ژنە گەش گەش بوونەوە. گوتی:

ـ بەڵێ دەست پێ دەکەینەوە.

ساتێك دواتر ژنە پشتی تێ کرد و لە پەنجەرەکەوە لە دەرەوەی روانی. خەڵك لە وێستگەکەدا بە پەلە بوون و پاڵەپەستۆیان بوو. دەنگی شەمەندەفەرکە دەگەیشتە ئەوێ. ریڤۆ ژنەکەی بە ناوی خۆیەوە بانگ کرد. کاتێك ژنەکەی ئاوڕی دایەوە ریڤۆ دیتی، روخساری نوقمی فرمێسکە. لەسەرخۆ گوتی:

ـ نەخێر.

لە بن لووزەوی فرمێسکانەوە، بزەیەك بە لێوەلەرزەوە دەرکەوت. ژنە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی:

ـ برۆ. چاك دەبێ. ریڤۆ توند لە باوەشی گرت و ساتێك دواتر لە سەر سەکۆکەوە تەنیا بزەکەی لەودیو جامەکەوە دەبینی. گوتی:

ـ تکات لێدەکەم ئاگات لە خۆت بێ.

بەڵام ئیتر ژنەکەی گوێی لە دەنگی نەدەبوو.

لە نزیك دەرگای چوونەدەرەوە لەسەر سەکۆی وێستگەکە، ریڤۆ تووشی ئۆسۆنی لێکۆڵەر بوو، کە دەستی کورە منداڵەکەی گرتبوو. ریڤۆ لێی پرسی ئەوە دەچیە سەفەر؟ بەڕێز ئۆسۆن کە قەڵافەتێکی درێژ و رەشتاڵەی هەبوو و برێك لە کۆنە بەگ و برێکیش لە مردووشۆران* دەچوو، بە راوێژێکی خۆمانەوە، بەڵام بە کورتی وەڵامی داوە:

ـ چاوەڕێی یای ئۆسۆنین**، چووبوو سەرێکی ماڵی باوکم بدات.

ـ شەمەندەفەرەکە لووراندی. لێکۆڵەر گوتی:

ـ مشك....

ریڤۆ بە ئاراستەی شەمەندەفەرەکەدا بەرەو لای دەرگای چوونەدەرەوە رۆیشت و گوتی:

ـ وایە، چ نیە.

تاقە شتێکی ئەم دەموساتەی لە زەیندا مایەوە، ئەویش رابردنی یەکێك لە کرێکارەکانی هێڵی شەمەندەفەر بوو، کە سندووقێکی پڕ لە مشکی تۆپیوی لە بن هەنگڵدا بوو.

---

* لێرەدا وەرگێڕ دەڵێ وەك ئەو کەسانە دەچێ کە مردووان دەبەنە قەبران. مردوو کێش. ئەمن وشەی مردووشۆرم بۆ دانا کە ئاشناترەو لە باری مانابیشەوە لە مردووکێش نزیکە.و.ك.

** (ژنەکەی ئاغای ئۆسۆن کە بە شۆرەتی مێردەکەی ناوی هاتووە،و.ك)

## (٣)

دوانیوەڕۆی هەر ئەو ڕۆژە تازە شوێنی کارەکەی (عیادە) ی کردبۆوە، کە پیاوێکی گەنج هاتە لای. گوتیان ڕۆژنامەنووسە. هەر بەیانیی ئەو ڕۆژەش هاتبوو. ناوی رەیمۆند رامبێر بوو. کورتەبالا و نێوشان پان و روخسارێکی شێلگیر و چاوی زیت و گەش بوون. پیاوێکی زیرەك دیار بوو. جلوبەرگەکەی کەشخە بوو و، پێوەی دیار بوو ژیانی خۆشە. یەکسەر گوتی بۆچی هاتووە: بۆ یەکێك لە ڕۆژنامەکانی پاریس خەریکی ئامادەکردنی وتارێکی بوو، لەسەر رەوشی ژیانی عارەبان. هاتبوو کۆمەڵێك زانیاریی لەسەر چۆنێتیی وەزعی پاکوخاوێنی و تەندروستیی ئەوان دەویست. ریڤۆ پێی گوت کە باری تەندروستی و پاکوخاوێنیی عەرەبان زۆر باش نیە، بەڵام بەر لەوەی پتری لەسەر بڕوا، دەیەوێ بزانێ کە ئەم ڕۆژنامەنووسە دەتوانێ باسی حەقیقەت بکا یان نا؟

ڕۆژنامەنووسەکە گوتی:

ـ بە دڵنیاییەوە.

ـ دەمەوێ بڵێم ئاخۆ دەتوانن لێبڕاوانە ئیدانە بکەن؟

ـ دەبێ بڵێم بە تەواوی نا! پێموایە حوکمێکی ئەوها بێ بنەما دەردەچێ.

ریڤۆ بە لەسەرەخۆییەوە گوتی: بە راستی وەها حوکمێك بێ بنەما دەردەچێ، بەڵام ئەو پرسیارەی بۆیە کرد تا بزانێ شایەتیدانی رامبێر بە بێ تێبینی و خۆپارێزی دەبێ یان نا؟ جا گوتی:

ـ من تەنیا ئەو شایەتییانەم قەبوولن کە لە پارێز و خۆدزینەوە، بەدوور بن. ئەگەر وا نەبێ بە زانیارییەکانی خۆم شایەتییەکانی ئێوە پشتئەستوور و بەهێز ناکەم.

ڕۆژنامەنووسەکە بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ ئەوە قسەی سەنت ژوستــە*.

ریقۆ بە بێ ئەوەی دەنگی پتر هەڵێنێ، گوتی ئاگای لەو مەسەلەیە نیە، بەڵام ئەوە قسەی کەسێکە کە لە دنیای خۆی بێزار بووە، کەچی لە بازنەی سەلیقەی هاوڕەگەزەکانیدا گیری خواردوە و لێبڕاوە چەندی پێی دەکرێ دژی نادادپەروەری و ئیمتیازی بێجێ بوەستێ.

رامبێر سەری بردبۆوە نێو قەپیلکی خۆیەوە و لە دوکتۆری دەڕوانی. ئاخری لە جێی خۆی هەستا سەرپێ و گوتی:

ـ پێم وایە لێت تێدەگەم.

دوکتۆر هەتا بەردەرگای بەڕێ کرد و گوتی:

ـ سوپاست دەکەم کە ئاوا لە مەسەلەکان تێدەگەی.

رامبێر دەسبەجێ گوتی:

ـ بەڵێ تێدەگەم . ببووره لەوەی ئەزیەتم دای.

دوکتۆر دەستی گوشی و گوتی، ئەگەر لەسەر ئەو مشکە تۆپیوانەی کە ماوەیەکە لە شاریدا دەرکەوتوون، ریپۆرتاژێك ئامادە بکەی، زۆر سەرنجڕاکێش دەبێ.

رامبێر بە روویەکی گەشەوە گوتی:

ـ بەڵێ پێم شتێکی باشە.

سەعات پێنجی دوانیوەڕۆ کە دوکتۆر بۆ چاوپێکەوتنی نەخۆشە تازەکان دەچووە دەرێ، لەسەر پلیکانەکان کابرایەکی دیت هێشتا گەنج بوو و، قەڵافەتێکی قورس و روخسارێکی رەقەڵە و جووتێ برۆی کوڵکنی هەبوو. ئەم پیاوەی چەند جارێك لە لای ئەو سەماکەرە ئیئیسپانیانەی لە دوایین نهۆمی بیناکەدا دەژیان، دیتبوو. ژان تارۆ Jean Tarrou بە سەرنج و وردبینیەوە جگەرەی بە بادا دەکرد و چاوی بڕیبووە دوایین موچڕکە و پەلەقاژەی ئەو مشکەی لەسەر یەکێك لە پلیکانەکان گیانی دەردەچوو. نیگا هێمن و بڕێك تیژی چاوە

---

* Saint- Just قارەمانی شۆڕشی مەزنی فەرەنسا کە لەگەڵ رۆبسپیر لە یەك رۆژدا ئیعدام کران.

خۆڵەمێشییەکانی بەرەو دوکتۆر وەرگێڕا، سڵاوی لێکرد و گوتی، دەرکەوتنی ئەو مشکانە شتێکی سەیر و سەرنجڕاکێشە.

دوکتۆر گوتی:

ـ بەڵێ، بەڵام وردە وردە بێزارمان دەکا.

ـ لە یەك لایەنەوە دوکتۆر، تەنیا لە یەك لایەنەوە. ئێمە شتی وامان قەت نەدیوە، هەر ئەوە، بەڵام بۆ من سەرنجڕاکێشە. زۆر زۆر سەرنجڕاکێشە و کارم تێدەکا.

تارۆ دەستێکی بە سەر و کاکۆڵیدا هێنا و بەرەو دواوەی برد. دیسان لە مشکەکەی روانیەوە کە ئیتر جووڵەی لێ بڕابوو. دوایی بە بزەیەکەوە بە دوکتۆری گوت:

ـ بەڵام بە گشتی ئەم ئیدی ئەوە ئیشی فەڕاشەکەیە.

دوکتۆر فەڕاشەکەی لەبەر دەرگای ماڵێ دی، پاڵی وەدیوارێکەوە دابوو. روخسارە هەمیشە گرژ و مۆنەکەی شەکەتییەکی پێوە دیار بوو. مێشیلی بەساڵاچوو کە هەواڵێکی نوێی بەدەست کەوتبوو، بە دوکتۆری گوت:

ـ بەڵێ دەزانم ئیدی ئەمجارە دوو دوو و سێ سێ دێنە دەرێ. لە ماڵەکانی دیکەشدا هەر وایە.

ژاکاو و خەفەتبار دیار بوو. هەر لە خۆوە شان و ملی خۆی دادەماڵی. ریڤۆ پێی گوت چۆنی. دیارە فەڕاشەکە نەیدەتوانی بڵێ باش نیە. هەر ئەوەندە هەستی دەکرد ناساغە. پێی وابوو ئازاری دەروونیی هەیە. ئەو مشکانە زەبرێکیان پێ گەیاندبوو و ئەگەر جووقەواریان بڕابایە، ئەو باشتر دەبۆوە.

بەڵام هەر سبەی بەیانی، ١٨ی ئەپریل دوکتۆر کە لە وێستگەی شەمەندەفەرەوە دایکی بەرە و ماڵێ دەبردەوە، ئاغای میشێلی بە روخسارێکی شڵەژاو و چرژاوترەوە بینی. لە ژێرزەمینەکەوە هەتا نهۆمی سەرەوە دە دوازدە مشك سەر پێپلیکانەکانیان داپۆشیبوو. زبڵدانی دەر و جیرانان پڕ بوون لە مشکی تۆپیو. دایکی دوکتۆر هەواڵەکەی بیست و هیچ شلوێ نەبوو و گوتی:

ـ جار جارە شتی وا هەر دەبێ دەبێ.

ژنێكی وردیلەی قژ كەوەی چاوڕەشی مێهرەبان بوو. دەیگوت:

ـ چاوو دڵم پێت روون بۆوە بێرنارد. مشك ئەو شادی و خۆشییەم لێ تاڵ ناكەن.

دكتۆریش دەیگوت وایە. بەڕاستی لەگەڵ ئەودا هەموو شتێك سووك و سانا دیار بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا ریۆ تەلەفۆنی بۆ ئیدارەی " قەلاچۆی مشكان" كرد، كە بەرپرسەكەی دەناسی و لێی پرسی ئاخۆ هەواڵی رووداوی ئەو مشكانەی بیستووە وا پۆل پۆل دێن بۆ ئەوەی لە دەرێ بمرن؟ مێرسییەر، بەرپرسی ئیدارەكە ئەو رووداوەی بیستبۆوە و، لە ئیدارەش كە لە نزیك شوێنەكانی بارخستن بوو، چل پەنجا مشكیان دۆزیبۆوە. بەو حاڵەشەوە نەیدەزانی ئاخۆ ئەو مەسەلەیە گرینگە یان نا؟ ریۆ نەیدەتوانی بڵێ چی، بەلام بە بیریدا هات كە ئیدارەی قەلاچۆی مشكان هەر دەبێ قۆڵی لێ هەڵماڵێ.

مێرسییەر گوتی:

ـ بەڵێ، بەلام بە بڕیاری فەرمی. ئەگەر تۆ پێت وایە كە بە راستی بایی زەحمەتەكەی دەبێ، ئەمن دەتوانم بڕیارەكەی وەرگرم.

ریۆ گوتی:

ـ دیارە ئەوەندەی دێنێ.

خزمەتكارەكەی باسی ئەوەی بۆ كردبوو، كە لەو كارخانەی مێردەكەی كاری لێ دەكا، سەدان مشكی تۆپیویان كۆ كردوونەوە.

هەرچۆنێك بێ، هەر لەو سەروبەندەدا بوو، كە هاوولاتییەكانی ئێمە وردەوردە ترسیان رێ-دەنیشت. چونكە لە رۆژی هەژدەیەمەوە كارخانە و عەمبارەكان پڕ بوون لە كەلاكی مشك. جاری واش بوو ناچار دەبوون خۆیان ئەو مشكانە بكوژن كە بە سەختی گیانیان دەردەچوو. لە گەڕەكەكانی دەرەوەڕا بگرە هەتا نێوەندی شار دوكتۆر ریۆ بە هەر كوێدا دەڕۆیشت، لە هەر شوێنێ كە هاوولاتییەكانی ئێمە كۆ دەبوونەوە، مشكەكان پۆل پۆل لە زبڵدانەكاندا و بە ریزی دووروودرێژ لە نێو جۆگەلەكاندا وەبەرچاو دەهاتن. هەر لەو رۆژەوە، رۆژنامەكانی دوانیوەڕۆ* لە هەرایان دا و، پرسیان ئەرێ شارەوانی دەیەوێ كارێك بكا یان نا؟ ئەرێ بۆ پاراستنی خەڵكی

---

* لە زۆر ولاتان كۆمەڵێك رۆژنامە بەیانیان دەردەچن و هەندێ رۆژنامەش دانی دوانیوەڕۆیان دەردەچن.

شار لەم هێرشە قێزەونە، هەوڵێکی دەسبەجێ دەدات یان نا؟ شارەوانی بیری ل هیچ نەکردبۆوە و هیچ بڕیارێکیشی نەدابوو، بەڵام بۆ راوێژ و پرس‌وڕا کۆبوونەوەیەکی گرت. فەرمان بە ئیدارەی قەڵاچۆی مشکان درا، هەموو بەیانیان مشکە تۆپیوەکان کۆ بکاتەوە. لە کۆتایی کۆکردنەوەیاندا دەبوو دوو لۆریی ئەو ئیدارەیە، مشکەکان بباتە کارخانەی زبڵسووتاندن بۆ ئەوەی لەوێ بسووتێنرێن.

بەڵام لە رۆژانی دواییدا وەزعەکە خراپتر بوو. ژمارەی مشکە کۆکراوەکان زیادی دەکرد و هەموو بەیانیەك مشکێکی زۆریان کۆ دەکردەوە. لە رۆژی چوارشەممەوە مشك پۆل پۆل بۆ مردن دەهاتنە دەرێ. لە کون و کەلێن و قوژبنان، لە ژێرزەمین و عەمبار و ئاوەڕۆکان، بە ریزی دوورودرێژ و بە لارەلار دەهاتنە دەرێ، بۆ ئەوەی لە رووناکاییدا هەڵلەرزن و خولێك بە دەوری خۆیاندا لێ بدەن و لە تەنیشت مرۆڤەکانەوە بمرن. نیوەشەوان نیوەنووزەی مردنیان لە نێو دالآن و کۆڵانە تەسك و تاریکەکانەوە بە جوانی دەبیسرا. دەمەوبەیانییان لە دەوروبەری شار دەیاندیتن کە لە تەختی جۆگەلە ئاوەکاندا پەڵەیەکی خوێن بە لمبۆزە نووك تیژەکەیانەوە نووساوە و بە ریز کەوتوون. هێندێکیان هەڵمسابوون و بۆگەنیان کردبوو و هێندێکی تر رەق هەڵاتبوون و هێشتا سمێڵیان هەروا قیت بوو. لە شاریشدا پۆل پۆل لە تالارەکاندا یا لە حەوشەی ماڵاندا دەدۆزرانەوە. جاری واش هەبوو تاك و تەرا دەهاتن و لە کریدۆرەکانی ئیدارە و لە تالاری قوتابخانەکاندا و لە هۆڵی کافتریاکاندا دەمردن.

هاووڵاتییە سەرسووڕماوەکانی ئێمە تەنانەت لە قەرەباڵغترین شوێنەکانی شاریش دەیان-دیتن. لە گۆڕەپانی مەشقی سەربازان، لە شەقامەکان و لە سەیرانگەی فرۆنت دی مێر Front de Mer هەر هەمووی پیس ببوو. شارەکە، ئەگەرچی هەموو بەیانیان ئەو حەیوانە تۆپیوانەی بە تەواوی لێ خڕ دەکرایەوە، کەچی تا ئێوارێ زیاتری تێدا کۆ دەبۆوە. لە شۆستەکاندا جار و بار ئەو رێبوارانەی شەوانە هاتوچۆیان دەکرد، لە بن لاقیاندا هەستیان بە نەرمیی لاشەگەلێك دەکرد کە هێشتا تۆزە تینێکیان تێدا مابۆوە، وەك بڵێی ئەو زەوییەی وا ماڵەکانی ئێمەی لەسەر دانرابوو، دەیەوێ خۆی لە چڵك و چەپەڵی پاك بکاتەوە و ئەو کرمانە فڕێداتە دەرەوە کە هەتا ئێستا هەناویان هەڵکۆڵیوە. دەتوانن بیهێننە بەرچاوی خۆتان، کە شارەکەمان چەندە

تووشی سەرسووڕمان هاتبوو و، تا ئەو دەمەش چەندە هێمن بوو و لە ماوەی چەند ڕۆژاندا کتوپڕ وەك کەسێکی ساغ کە لە نەکاو خوێنە خەستەکەی بێتە کوڵ، بەراوەژوو بۆوە.

ڕووداوەکە ئەوەندە گەورە بۆوە، کە نوێنەرایەتیی ڕانسدۆك (زانیاری و بەڵگەکان، زانیاری و بەڵگەی تەواو لەسەر هەر شتێك) لە هەواڵە بێ بەرامبەرەکانی بەرنامە ڕادوێیەکەی خۆیدا، ڕایگەیاند: تەنیا لە ڕۆژی بیستوپێنجەمدا، ٦٢٣١ مشك کۆ کراونەتەوە و سووتێنراون. ئەم ژمارەیە، ئەو دیمەنەی وا هەموو ڕۆژێ لەبەر چاوی خەڵکی شار بوو و خەڵکیشی زیاتر شێواند، ڕوونتر و ئاشکراتر دەرخست. تا ئەو کاتە خەڵك تەنیا سکاڵایان لە ڕوداوێکی قێزەون هەبوو، بەڵام ئەمجارە دەیاندی ئەو مەسەلەیە کە هێشتا نازانن هەتا کوێ دەتەنێتەوە و لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە، بووەتە شتێکی مەترسیدار. تەنیا کابرا ئیسپانییە پشووسوارەکە، دەستی لێك دەخشاندن و بە شادییەکی تایبەتی پیرەکانەوە، دووپاتەی دەکردەوە:

ـ دێنە دەرێ. دێنە دەرێ.

لە وەها بارودۆخێکدا ڕانسدۆك ڕایدەگەیاند: کە ڕۆژی ٢٨ی ئەپریل نزیکەی ٨٠٠٠ مشك کۆ کراونەتەوە. خەڵکی شار تەواو نیگەران ببوون. دەیانویست مشوورێکی لێ بخورێت و بەرپرسانی حکوومەتییان تاوانبار دەکرد و، ئەوانەش وا ماڵیان لەسەر لێواری دەریاکە بوو، دەیانگوت: دەیانەوێ ڕاگوێزرێن بۆ ئەوێ، بەڵام بۆ بەیانی ڕانسدۆك ڕایگەیاند: مەسەلەکە لە نەکاو پووچەڵ بۆتەوە و "ئیدارەی قەڵاچۆی مشکان" تەنیا ژمارەیەکی کەمی مشکی تۆپیو کۆ کردۆتەوە. شار پشوویەکی هاتەوە بەرخۆی.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەر نیوەڕۆی ئەوێ ڕۆژێ، کاتێك دوکتۆر ریڤۆ ترۆمبێلەکەی لەبەر دەرگای ماڵێ ڕاگرت، لە سەری کۆڵانەوە چاوی بە فەڕاشەکە کەوت، کە بە لارەلار بەرەو لای دێ. سەری بەسەر سینگیدا شۆڕ ببۆوە و لاقی وەك بووکەڵەی منداڵان لەبەر یەك ڕەویبوونەوە. پیرەمێردەکە باسکی قەشەیەکی گرتبوو. ریڤۆ ناسییەوە، پێرە* پانیلۆ قەشەی یەسووعی، بیرمەند و خەباتگێڕێك بوو کە ریڤۆ چەند جاران دیتبوی. ئەو قەشەیە لە شارەکەی ئێمەدا تەنانەت ئەوانەی بیروباوەڕی ئایینیشیان نەبوو، ڕێزیان دەگرت. ریڤۆ لەسەریان ڕاوەستا. میشێلی پیر چاوی

---

* Pere(باوکە) کە بە قەشەکان دەگوترێ.

دەبریسکانەوە و لرخەلرخی سینگی دەهات. کە دیتبوی وەزعی باش نیە، گوتبووی با بچم هەوایەك هەڵمژم، بەڵام تەوژمی ژان و ئازاری شان و مل و نێوگەڵی ناچاریان کردبوو بگەڕێتەوە و داوای یارمەتی لە پانیلۆ بکات، گوتی:

ـ هەڵمساوە! دەڵێی کاری قورسم کردووە.

دوکتۆر لە ترۆمبێلەکەوە دەستی هێنا دەرێ و پەنجەی بەسەر لاملی میشێلدا کە هێنابوویە پێشێ، هێنا. لوویەکی وەك گرێی دار لەوێ وەخڕ ببوو. گوتی:

ـ بنوو. تین پێو** دابنێ. دوانیوەڕۆ سەردانت دەکەم.

فەڕاشەکە ڕۆیشت. ریڤۆ لە پیرەپانیلۆی پرسی، ئاخۆ مەسەلەی ئەو مشکانە چۆن لێك دەداتەوە؟ قەشە گوتی:

ـ ئای، هیچ دوور نیە کە پەتایەکی لێگرەوە ئەو پەرەگر بێ. چاوی لەودیو چاویلکە خڕەکانیەوە پێکەنین.

دوای نانی نیوەڕۆ ریڤۆ دیسان تەلەگرافی "پشووگە"ی دەخوێندەوە، کە هەواڵی گەڕانەوەی پێ دابوو. لەو کاتەدا تەلەفۆن زەنگی لێدا. یەکێك لە کڕیارە کۆنەکانی خۆی کە فەرمانبەری شارەوانی بوو، دەیویست قسەی لەگەڵ بکا. ئەو کابرایە بۆ ماوەیەك شادەماری دڵی تەسك ببۆوە و چونکە ئەوەی هەژار بوو، ریڤۆ بە خۆڕایی چارەسەری کردبوو. لە تەلەفۆنەکەدا دەیگوت:

ـ بەڵێ منت ناسییەوە، بەڵام ئێستا نەخۆشەکە کەسێکی دیکەیە. خێرا بگەیە. جیرانەکەم شتێکی بەسەر هاتووە.

پشووی سوار بوو. ریڤۆ فەڕاشەکەی وەبیر هاتەوە و بە بیریدا هات، دوایی سەردانی بکات. پاش چەند ساتێك، لە یەکێك لە گەڕەکەکانی شار لە ماڵێکی بچووکی کۆڵانی فێدێرب*** وەژوور دەکەوت. لە نێوەڕاستی پلیکانە فێنك و بۆگەنەکە، تووشی ژۆزێف گرانتی فەرمانبەری

---

** تین پێو، یان گەرماپێو: ئامێرێکە بۆ ئەندازەگرتنی ئاستی تین و گەرمای لەش دەکاری دێنن. پێم وایە تین پێو لە سەر زار خۆشترە لە گەرماپێو بۆیە ئەمەیانم دانا و هەر یەك ماناشیان هەیە.

*** Faidherbe ناوی یەکێك لە سەردارە ناودارەکانی فەرەنسایە کە ئەو کۆڵانەی بە ناو کراوە.

شارەوانی بوو، کە بە پیرییەوە هاتبوو. کابرایەکی تەمەن پەنجا ساڵانەی رەقەڵە بوو، بە سمێڵێکی درێژ و کەوانی و زەردەوە، نێوشان باریك و رەقەڵە.

کە لە ریڤۆ نزیك بۆوە گوتی:

ـ باشترە، بەڵام، لام وابوو دەمرێ.

لووتی خاوێن کردەوە. لە نهۆمی دووهەم کە دوا نهۆم بوو، ریڤۆ ئەم وشانەی بە سەر لادەرگای شانی چەپەوە خوێندەوە، کە بە گەچی سوور نووسرابوون.

وەرنە ژوورەوە. ئەمن خۆمم هەڵواسیوە."

وەژوور کەوتن. پەتێك لە ئاڵقەی چراکەوە شۆڕ ببۆوە و کورسییەکیش لە بنی بەلادا کەوتبوو، مێزەکەیان کێشابووە لایەکەوە، بەڵام پەتەکە هیچی پێوە نەبوو. گرانت وێڕای ئەوەی بە زمانێکی زۆر سادە قسەی دەکرد، دەتگوت هەمیشە بە شوێن وشەدا دەگەڕێ. گوتی:

ـ زۆر باشی فریا کەوتم. خەریك بوو لەماڵێ وەدەر دەکەوتم لەپڕ گوێم لە دەنگێك بوو. کە چاوم بە نووسراوەکە کەوت وەمزانی گاڵتەیە، کەچی ناڵەیەکی گاڵتەجاڕانە یا باشترە بڵێم ناڵەیەکی شوومی لێوە هات.

سەری خوراند و گوتی:

ـ پێم وایە کارێکی بەژانە، هەروا وەژوور کەوتم.

دەرگایەکی کردەوە و گەیشتنە بەر دەرگای ژوورێکی رووناك، بەڵام هەژارانە. کابرایەکی خەپە و کورتەبنە لەسەر قەرەوێڵە مسییەکە راکشابوو، بە حاستەم هەناسەی دەکێشا و بە چاوی سوورهەڵگەڕاوەوە لێی دەڕوانین. دوکتۆر راوەستا. دەتگوت لە مەودای نێوان پشووەکانیدا گوێی لە زیقەی کورتی مشکەکان دەبێ، بەڵام لە قوژبنەکانی ژوورەکە هیچ شتێ نەدەجووڵاوە. بەرەو قەرەوێڵەکە چوو. کابرا لە جێیەکی زۆر بەرزەوە بەرنەبۆوە و زۆر توندیش بەعەرز نەکەوتبوو، مۆرەکانی پشتی زەبریان نەدەیتبوو، تەنیا برێك پشووسواریی پێوە دیار بوو. پێویست بوو وێنەیەکی(سۆنار) لێ هەڵگرن.

دوکتۆر دەرزییەکی کامفێری لێ دا و گوتی چەند رۆژێکی دی چاك دەبێتەوە. کابرا بە نیوەنووزەیەکەوە گوتی:

ـ سوپاس دوکتۆر.

ریڤۆ لە گرانتی پرسی کە ئاخۆ ئیدارەی پۆلیسی ئاگادار کردۆتەوە؟ کارمەندەکەی شارەوانی بە شەرمەزارییەوە گوتی:

ـ نەوەڵا، ئاخخ، پێموابوو پێش هەر کارێك...

ریڤۆ قسەکەی پێ بڕی:

ـ بەڵێ... کەوابوو خۆم وا دەکەم.

بەڵام لەو ساتەدا نەخۆشەکە هەڵچوو. لە جێیەکەی هەستا و بە نارەزایەتییەوە گوتی کە حاڵی باشە و ئەو کارە پێویست نییە.

ریڤۆ گوتی:

ـ لە سەرخۆ بە. بڕوات بێ شتێکی وا نیە. من لەسەرمە پێیان ڕابگەیەنم.

نەخۆش گوتی: دەی دەی! و خۆی خستەوە نێو جێوبانەکەی و دەستی کرد بە گریانێکی پچرپچڕ. گرانت کە چەند ساتێك بوو دەستی بە سمێڵیدا دێنا، لێی چووە پێش و پێی گوت: گوێ بدەیە مسیۆ کۆتار، هەوڵ بدە تێ بگەی. دوکتۆر بەرپرسیارە. بۆ وێنە ئەگەر تۆ حەزت لێ بێ دیسان...

بەڵام کۆتار لە نێو فرمێسکەکانیدا گوتی، ئیتر کاری وا ناکاتەوە. تەنیا بۆ چرکەیەك لە کەللەی داوە و ئێستا دەیەوێ لە کۆڵی ببنەوە. ریڤۆ خەریکی نووسینی راچەتە(دەرمان) بوو. گوتی: زۆر باشە. با وازی لێ بێنین. من دوای دوو سێ رۆژی دیکە دێمەوە، بەڵام ئیدی خۆت کەر نەکەیەوە ها.

لە تەلارەکەدا بە گرانتی گوت ناچارە راپۆرتەکەی رابگەیەنێ، بەڵام تکا لە لێپێچەرەکە دەکا دوو رۆژ دواتر دەست بکا بە لێکۆڵینەوەکەی و، گوتی:

ـ ئەمشەو پێویستە ئاگات لێی بێ. ئەرێ خێزانی هەیە؟

ـ ئاگام لە بنەماڵەی نیە، بەڵام دەتوانم خۆم چاوم بە سەرییەوە بێ.

سەرێکی لەقاند و گوتی:

ـ خۆشی باش ناناسم، بەڵام خۆ هەر دەبێ دەستی یەك بگرین.

له دالانەکانی مالێدا ریڤۆ له خۆوه چاوێکی به گۆشه و قولینچکی دیوارەکاندا خشاند و له گرانتی پرسی، که ئاخۆ مشکەکان لەو گەڕکه تەواو لەنێو چوونه؟ فەرمانبەرەکەی شارەوانی ئاگای له مەحموودی بێزەواد نەبوو، بەڵام هێندێ شتیان لەم بارەیەوه پێ گوتبوو کەچی ئەو زۆر گوێی به دەنگۆکانی گەڕەك نەدەدا. گوتی:

ـ من خۆم گیروگرفتی دیکەم هەن.

ریڤۆ بەپەله دەستی گوشی و بەجێی هێشت. دەیویست بەر لەوەی نامەیەك بۆ ژنەکەی بنووسێ، سەرێك له فەڕاشەکه بداتەوه.

فرۆشیارانی رۆژنامەکانی ئێوارێ هەرایان دەکرد: هێرشی مشکان تەواو بووه، بەڵام ریڤۆ نەخۆشەکەی له حاڵێکدا دی، که له پشتوێن بەرەو ژووری له قەرەوێڵەکەی هاتبووه دەرێ. دەستێکی به زگییەوه و دەستەکەی تری به ملییەوه گرتبوو و به قڵپە، ئاوێکی زەردی دەهێنایەوه و دەیڕشایەوه نێو تەنەکەیەکی زبڵەوه. فەڕاشەکه دوای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر بێهەستوخوست له ەکەیدا کەوت. پلەی گەرمای لەشی سیونۆونیو بوو. لووەکانی لامل و شوێنەکانی دیکەی گیانی ئەستوورتر ببوون. دوو پەڵەی رەش له لاتەنیشتییەوه بەردەوام گەورەتر دەبوونەوه. ئێستا له بەر ئازارێکی هەناوی دەینالاند و دەیگوت:

ـ دەڵێی دەسووتێ ئەو ماڵ کاوله.

زاره رەش داگەڕاوەکەی وشەکانی قەڵت قەڵت دەکرد و چاوه دەرپەڕیوەکانی که لەبەر ژانەسەر نوقمی فرمێسك بوون، بەرەو لای دوکتۆر وەردەسووڕاند. ژنەکەی که بەبێدەنگی لەوێ راوەستابوو به نیگەرانییەوه له ریڤۆی دەڕوانی و دەیگوت:

ـ دوکتۆر ئەوه چییه؟

ـ دەکرێ هەموو شتێك بێ، بەڵام ناتوانین به راشکاوی بڵێین چییه. هەتا ئەمڕۆ دوانیوەڕۆ پارێز بکات و خواردنی ئاوەکی زۆر بخوات و ئاو زۆر بخواتەوه.

به رێکەوت فەڕاشەکه وەختابوو له تینوێتیان بخنکێ.

ریڤۆ کاتێك گەڕایەوه ماڵێ، تەلەفۆنی بۆ ریشاردی هاوکاری، که یەکێك له ناودارترین پزیشکەکانی شار بوو، کرد. ریشارد گوتی:

ـ نەخێر ئەمن شتێکی نائاساییم بەدی نەکردووە.

ـ " نۆبەتیێ"ــیەکیشت بەدی نەکردووە کە هەوکردنی بەدواوە بێ؟...

ـ وەڵا بۆچی، دوو نەخۆشم هەن کە لەرزو تایان لێدێ و لوو* لە گیانیان دێ و هەڵدەماسێن.

ـ نائاسایی؟...

ریشارد گوتی:

ـ بەڵێ، ئاخر دەزانن کە لەمەڕ ئاساییبوونەوە...

شەوێ سەرەڕای تەواوی چارەسەرییەکان، پلەی گەرمای لەشی کابرای فەڕاش گەیشتە چل. وڕێنەی دەکرد و لەدەست مشکان سکاڵای بوو. دوکتۆر بلۆقێکی دەسکردی* بۆ دروست کرد. فەڕاشەکە لە نێو ژانی برژانەوەی (تێربانتین) دا دەنووزایەوە:

ـ ئاخ ماڵکاول.

لووەکان دیسان گەورەتر ببوون. کە دەستی لێ دەدا وشك و رەق بوو. ژنی فەڕاش خەریك بوو شێت دەبوو.

دوکتۆر پێی گوت:

ـ وریابە و ئەگەر پێویست بوو ئاگادارم کەوە...

بۆ سبەینێکەی ۳۰ی ئەپریل شنەیەکی گەرم لە ئاسمانی ساماڵ و شێدارەوە لەگەڵ خۆی لە دووری شارەوە بۆنی گوڵانی دەهێنا. دەنگ و قریوەی بەیانیان لە کۆڵانەکاندا زیندووتر و شادتر لە حاڵەتی ئاسایی دەنواند. ئەو رۆژە لە سەرانسەری شارە بچکۆڵانەکەی ئێمەدا کە دوای حەفتەیەك لە ترسێکی نەناسراو رزگاریی ببوو، بەهارێکی نوێ بوو. ریڤۆش کە نامەیەکی ژنەکەی پێ گەیبوو برێك ئەهوەن ببۆوە و بە ئاسوودەییەوە چووە لای فەڕاشەکە. بە رێکەوت بەیانیی ئەو رۆژە پلەی گەرمای لەشی نەخۆشەکە دابەزیبووە سەر سی و هەشت. نەخۆشەکە، کە لاواز ببوو لە جێوبانەکەیدا بزەی دەهاتێ. ژنەکەی گوتی:

---

* لوو : ئەو گرێ گۆشتەی کە لە لامل یا لە شوێنی دیکەی مرۆڤ دێ، کوان

* وەرگێڕی دەقە فارسیەکە ئەم دەستەواژەیەی بۆ Abces de fixation بەکار هێناوە کە دەڵێ پزیشك لە شوێنێکی جەستەی ئەو نەخۆشەی کە گیانی چڵکی کردووە بلۆقێك دروست دەکا بۆ ئەوەی چڵك و چەپەری شوێنەکانی دیکەی لەشی لەوێدا کۆ بێتەوە.

ـ باشترە. وا نیە دوکتۆر؟

ـ دیسانیش دەبێ چاوەڕوان بین؟

بەڵام نیوەڕۆ لە نەکاو "تا"ی لەشی گەیشتە چل. نەخۆش یەکسەر دەیڕاواند و ڕشانەوەکان دەستیان پێکردبۆوە. لووەکانی ملی دەستیان وێکەوتبایە ژانیان دەکرد و دەتگوت فەڕاش دەیەوێ چەندی بۆی دەلوێ سەری لە لەشی دوور ڕاگرێ. ژنەکەی لەبەر قەرەوێڵەکە دانیشتبوو، دەستی خستبووە سەر لێفەکە و لاقی نەخۆشەکەی بەحاستەم گرتبوو و چاوی بڕیبووە ریڤۆ. دوکتۆر گوتی:

ـ گوێ بدەنێ. دەبێ لە خەڵکی دیکەی هەڵاوێرین و چارەسەری تایبەتی بکرێ. تەلەفۆنم بۆ نەخۆشخانە کردووە بە ئامبولانس دەیبەین.

سەعات دواتر، لە ئامبولانسدا دوکتۆر و ژنی فەڕاشەکە بەسەر نەخۆشەکەدا نوشتابوونەوە. بە پچڕپچڕ وشەکان لە زاریەوە کە پڕ بوو لە بلۆق دەهاتنە دەرێ. دەیگوت:

ـ مشکەکان.

فەڕاشەکە بە ڕوخسارێکی مەیلەو سەوزەوە بە لێوی بەبار و پێڵووی قورقوشمین و بە هانکەهانك، بە لەشێکەوە کە لووی دڕاو، قڵێش قڵێشیان کردبوو، لە جێوبانەکەیدا گرمۆڵە ببوو و، وەك بڵێی دەیەوێ وەسەرخۆی بکێشی و یا شتێك کە لە ناخی زەوییەوە دێتە دەرێ بانگی دەکا، لە ژێر گوشاری دەستێکی نادیاردا دەخنکایەوە.

ژنەکەی دەگریا:

ـ دوکتۆر، ئیتر هیچ هیوایەك نیە؟

ریڤۆ گوتی: ـ مردووە.

# ٤

دەكرێ بڵێین، مەرگی فەڕاشەكە كۆتایی ئەم قۆناغە پڕ لە نیشانەی سەرسوڕهێنەرە و سەرەتای قۆناغێكی تری تۆزێك تاڵ و ئەستەم بوو، كە تێیدا سەرسووڕمانی ڕۆژەكانی سەرەتا وردەوردە دەبوونە ترس و سام. خەڵكەكەمان قەت پێیان وا نەبوو، شارە خنجیلانەكەی ئێمە شوێنێكی تایبەت بێ، بۆ ئەوەی مشكەكان تێیدا لەبەر تیشكی خۆرەتاو بمرن و فەڕاشەكان بە پەتای سەیر و سەمەرە تێدا بچن، بەڵام ئەمجارە ملیان بۆ حەقیقەتەكە رادەكێشا. ئیدی دەیانزانی كە تا ئێستا تەواو بە سەهوو چوون و دەبێ ڕای خۆیان بگۆڕن. خۆ ئەگەر هەموو شتێك بەوەندە كۆتایی هاتبا، بە دڵنیاییەوە ملكەچی خووەكانیان دەبوون، بەڵام خەڵكێكی دیكەمان كە نە فەڕاش بوون و نە داماویش، تووشی هەر ئەم چارەنوسە بوون وا بۆ یەكەمجار بەرۆكی ئاغای میشێلی گرتبوو. لەم ساتەوە بوو ئیتر ترس و لەگەڵ ئەویشدا بیركردنەوە دەستی پێكرد.

لەگەڵ ئەوەدا، بەر لەوەی بچینە نێو وردەكاریەكانی ئەو قۆناغەوە كە دەبێ شی بكرێتەوە، نووسەری ڕووداوەكان بە پێویستی دەزانێ بۆچوونی شایەتێكی دیكەش بێنێتەوە. ژان تارۆ كە لە سەرەتای ئەم بەسەرهاتەدا چاومان پێی كەوتووە، چەند حەفتەیەك بوو هاتبووە ئۆران و لەو ماوەیەدا لە یەكێك لە هۆتێلە گەورەكانی ناوەندی شاردا دەماوە، دیار بوو لەسەر داهاتەكەی خۆی بە تێروپڕی دەژیا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا كە شار وردەوردە خووی پێوە گرتبوو، كەس نەیدەتوانی بڵێ لە كوێوە هاتووە و لەوێ چ دەكا. لە هەموو شوێنە گشتییەكاندا دەبینرا. لە

سەرەتای بەهارەوە زیاتر لە پۆلاژەکاندا دیتبوویان کە زۆربەی جاران بە شاگەشکەیی مەلەی دەکرد. کابرایەکی رووخۆش و دەم بە پێکەنین بوو. دیار بوو حەزی لە تەواوی خۆشییە ئاساییەکانە، بێ ئەوەی خۆی بکاتە کۆیلەیان. تاقە عادەت و خوویەکی لەودا دەبینرا ئەوە بوو هامووشۆی ئەو گۆرانیبێژ و سەماکەرە ئیسپانیانەی دەکرد کە لە شارەکەی ئێمەدا زۆر بوون.

یادداشتەکانی ئەویش بلێی و نەلێی، جۆرێکە لە نووسینەوەی رووداوەکانی ئەم قۆناغە دژوارە، بەڵام شێوازێکی تایبەتی رووداونووسینەوەیە کە وەك بلێی تێیدا بە ئانقەست بابەت و مەسەلەکان بەکەم گیراون و گرینگییان پێ نەدراوە. لە یەکەم روانیندا دەکرێ وای بۆ بچین کە تارۆ پێداگر بووە، کە لە زوومی گەورەی کامێراوە سەیری شتەکان و بوونەوەرەکان بکات*. لە نێو ئەو بشێوییە گشتییەدا ئەو خۆی لێ کردووینەتە مێژوونووسی شتێك کە مێژووی نیە. بێگومان دەتوانین لەو کارە بە ئانقەستەی ئەو بە داخ بین و بە دڵڕەقبوون تاوانباری بکەین، بەڵام لانیکەم ئەو یادداشتانە دەتوانن کۆمەڵێك وردەشتی پلە دوومان لەسەر رووداوەکانی ئەم قۆناغە بدەنێ، کە کەمبایەخیش نین و تەنانەت سەیربوونەکەیشیان نابێتە هۆی ئەوەی بە پەلە داوەری لەسەر ئەم کابرا سەیروسەمەرەیە بکەین.

یەکەم یادداشتگەلێك کە تارۆ رێکی خستوون، رێکەوتی ئەو رۆژەیان بەسەرەوەیە کە ئەو گەیشتووەتە ئۆران. لەو یاداشتانەدا دیارە کە تارۆ زۆر رازییە لەوەی هاتووە لە ئۆران نیشتەجێ بووە، ئەگەرچی شارێکی ئەوەندەش ناشیرینە. لە نێو ئەو یادداشتانەدا لێکدانەوەیەکی ورد لەمەڕ دوو شێری برۆنزی هەیە کە شارەوانییان رازاندۆتەوە و هێندێك تێبینیی نیازپاکانەش لەسەر نەبوونی دار و درەخت و هەبوونی خانووبەرەی ناڕێك و نالەبار و نەخشەی بێکەڵکی شار. تارۆ هەروەها ئەو قسە و باسانەشی کە لە شەمەندەفەر و کۆڵانەکاندا بیستوونی تێکەڵاوی ئەو یادداشتانە کردووە. ئەو ئەم قسە و باسانەی هیچ شی نەکردوونەوە و لێکی نەداونەتەوە، ئەوەندە نەبێ کە هێندێك دواتر لەسەر یەکێکیان کە پێوەندیی بە کەسێکەوە بە

---

* لێرە دا نووسەر تانە لە کابرا دەدا و بە تەشەر پێی دەڵێ وەك ئەوە وایە دووربینێکی پێچەوانە گرتبێ و لە شتەکان بڕوانێ دیارە کە دووربینیش پێچەوانە گیرا شتەکان دوور و بچووك دەبنەوە.

ناوی Camps کامپــەوە هەیە، تارۆ دوو بلیتفرۆشی تراموای بینیوە پێکەوە قسە دەکەن. یەکێك لەو دووانە دەیگوت:

ـ ئەتۆ "کامپ"ـت دەناسی؟

ـ کامپ؟ کابرا کەڵەگەتە سمێڵ رەشەکە؟

ـ ئەوەی پاسەوانی ئاسنەڕێ بوو.

ـ بەڵێ . ئەو.

ـ بەداخەوە مرد.

ـ وەیش. کەنگێ؟

ـ دوای رووداوی مشکەکان.

ـ سەیرە. چ بەڵای لێ بوو؟

ـ نازانم. "تا"ـیەکەی زۆریش بە تەوژم نەبوو. بن هەنگڵەکانی ئەستوور ببوون. خۆی لەبەر رانەگرت.

ـ لەگەڵ ئەوەشدا قەڵافەتی هیچ لە خەڵکی دیکە جیاواز نەبوو.

ـ نا، سینگی لاواز بوو، بەڵام لە ئۆرفیۆن ژەنیار بوو. کوڕە پیاو هەموو رۆژێ فوو بە کەڕەنادا* بکا دەمرێ ئیدی.

ئەویتر کۆتایی بە باسەکە هێنا:

ـ بەڵێ، پیاوی نەخۆش نابێ کەڕەنا لێ بدا.

دوای ئەم قسانە تارۆ لەبەرخۆیەوە دەڵێ، باشە کامپ بۆچی سەرەڕای دیارترین بەرژەوەندەکانی خۆی چووبووە نێو ئۆرفیۆنەوە و، چ شتێك ناچاری دەکرد گیانی خۆی بۆ مەشقە ئایینیەکانی رۆژانی یەکشەممە بخاتە مەترسییەوە.

لە جێگەیەکی دیکەدا وێدەچێ دیمەنی ئەو رووداوانەی لە پەنجەرەی ژوورەکەی تارۆوە دیار بوون، کاریگەرییەکی خەستیان لەسەر تارۆ دانابێ. ژوورەکەی دەیڕوانیە کۆڵانێکی تەسك کە تێیدا پشیلە لە سێبەری دیوارەکاندا پرخەی خەویان دەهات، بەڵام هەموو رۆژێ دوای نانی نیوەڕۆ

---

* کەڕەنا: شەیپوور ـ ترۆمپێت.

ئەو دەمەی تەواوی شار لە قرچەی گەرمادا وەنەوزی دەدا، پیرەمێردێکی وردیلە دەهاتە سەر بانیژەکانی رووبەڕووی کۆڵانەکە، بە سەر و ڕدێنێکی سپیی شانەکراو و بەژنێکی قیت و قنج و جلوبەرگێکی مۆدێل سەربازییەوە، بە دەنگێکی کز و مێهرەبانەوە پشی پشیی بۆ پشیلەکان دەکرد. پشیلەکان چاوی قورس و خەوالّوویان بە حالّ هەلّدێنان، بەلاّم لە جێی خۆیان نەدەبزووتن. پیرەمێرد لوێچێکی کوتە کاغەز ورد دەکرد و لەسەرەوە بۆی داویشتنە کۆلاّنەوە. پشیلەکان کە چاویان بەم بارانی پەپوولە سپیانە دەکەوت، دەچوونە نێوەڕاستی کۆڵانەکەوە و بە دڕدۆنگییەوە پەنجەیان بۆ دوایین کوتە کاغەزەکان دەبردە پێشەوە. ئەمجارە پیرەمێردە وردیلەکە بە توندی و بە وردی تفی بە پشیلەکاندا دەکرد و، کە یەکێك لە تفەکانی وەپشیلەکان دەکەوت دەتریقایەوە.

هەروەها وێدەچوو لایەنی بازرگانیی شاریش کە دەتگوت روالّەت و جموجۆل و تەنانەت شادییەکانیشی بەرهەمی پێویستییەکانی کار و چالاکیی ئەوێ بوون، سەرنجی تارۆیان تەواو راکێشابێ. ئەو "سەمەرەبوونە" (ئەمە دەستەواژەیەکی نێو یادداشتەکانە) دەبووە هۆی سەرسوڕمان و بارەقەلاّگوتنی تارۆ و، یەکێك لە پەسنەکانی بەو رستەیە کۆتایی دەهات: سەرتان نەیەشێنم...

ئێرە تاقەش جێیەکە، کە دیارە یادداشتەکانی (کابرا)ی گەشتیار لەم رێکەوتەدا تایبەت بە خۆیەتی. ئەوەندەی ئەستەمە لێیان تێ بگەی و بزانی چەندە لە راستیەوە نزیکن. بۆ وێنە تارۆ پاش گێڕانەوەی ئەو مەسەلەیە، کە دەرکەوتنی مشکێك بووەتە هۆی ئەوەی ژمێریاری هوتێل لە نووسینی حسابەکەی ئەودا تووشی هەلّە بێ، بە خەتێکی تێکەلاّوتر لە نووسینی ئاسایی، ئەوەندەشی لێی زیاد کردووە :"پرسیار: بۆوەی کات بە فیڕۆ نەچێ دەبێ چ بکەین؟ وەلاّم: دەبێ بە درێژایی خۆی هەستی پێ بکەین. کەرەسەکان: تێپەڕکردنی رۆژەکانی لە دیوی ددانسازێکدا، لەسەر کورسییەکی ناخۆش، تێپەڕاندنی دوانیوەڕۆیانی یەك شەممە لەسەر بانیژەی مالّێ، گوێڕاگرتن لە وتار بە زمانێکی کە مرۆڤ لێی تێناگا، هەلّبژاردنی دووردوردرێژترین رێگەکانی شەمەندەفەر و ئەویش بە سەر پێوە راوەستان لە سەفەردا، راوەستان لە ریزەکانی بلیتی سینەما و شانۆ و نەکڕینی بلیتەکەی و..."، بەلاّم دەمودەست پاش ئەم لادانە زمانی و هزرییانە، یادداشتەکان دەپەرژێتە سەر لێکدانەوە و شیکردنەوەیەکی ورد، لەمەڕ

شەمەندەفەرەکانی شارەکەی ئێمە و شێوەیان کە هەر لە کەشتی دەچوون و، ڕەنگە بێ ڕەنگەکەیان و پیس و چەپەڵبوونەکەیان و ئەو تێبینیانەش بە ڕستەیەکی "شیاوی سەرنج" کۆتایی پێ دێ کە ئیدی هیچ شتێك بەدەستەوە نادەن.

ئیتر، ئەوەی تارۆ سەبارەت بە ڕووداوی مشکەکان باسی کردووە، ئەوەیە.

"ئەمڕۆ پیرەمێردە وردیلەی بەرامبەر شڵەژاوە. ئیتر پشیلەکان دیار نین. ئەوان لە سۆنگەی دەرکەوتنی ئەو هەمووە مشکە تۆپیوەوە، لە کۆڵانەکاندا سەریان لێ شێواوە و ون بوون. بە ڕای من مەسەلە هیچ ئەوە نیە کە پشیلەکان مشکە تۆپیوەکان بخۆن. ئەمن لە بیرمە پشیلەکانی من هەر بێزیان نەدەهات شتی وا بکەن. دوور نیە لە ژێرزەمینەکاندا خەریکی ڕاوڕاوێنێ بن و، پیاوە پیرە وردیلە شڵەژاوە. سەروقژی جوان دانەهێناوە و خۆیشی زۆر بەدەماخ نیە. جوان پێوەی دیارە وەڕەزە. دوای ساتێك دەچێتەوە ژوورەکەی، بەڵام تفێك فڕێ داوەتە کۆڵانەکەوە.

"ئەمڕۆ شەمەندەفەرێکیان لە شاریدا ڕاگرت، چونکە مشکەتۆپیوێکی تێدا دۆزرایەوە کە دیار نەبوو لە کوێوە هاتووە. دوو یا سێ ژن دابەزین. مشکەکەیان فڕێ دایە خوارێ و شەمەندەفەرەکە دیسان وەڕێ کەوتەوە.

"لە هوتێل، ئێشکگرەکەی شەوێ کە کابرایەکی باوەڕپێکراوە، گوتی، بە دەرکەوتنی هەمووە مشکە، ئەو چاوەڕوانی نەگبەتی و لێقەومانێکە. "کاتێك مشکەکان پاپۆڕەکە جێ بێڵن ..." پێم گوت: ئەم قسەیە لەسەر پاپۆڕەکە ڕاستە و لەسەر شارەکان هیچ کات ڕاست دەرنەچووە. لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر قسەی خۆی سوور بوو. پرسیم بە باوەڕی ئەو دەکرێ چاوەڕوانی چ جۆرە نەهامەتییەك بین؟ نەیدەزانی و دەیگوت نەهامەتی پێشبینی ناکرێ، بەڵام ئەگەر بوولەرزەیەك ڕوو بدا ئەو هیچ پێی سەیر نابێ. بۆم سەلماند و گوتم هیچ دوور نیە و، ئەو لێی پرسیم ئاخۆ ئەزیەتی نەکردووم.

" گوتم:

ـ ئەوەی بۆ من گرینگە ئەوەیە کە دەروونم هێمن و ئارام بێ.

" تەواو لە قسەکەم تێگەیشت".

بنەماڵەیەکی زۆر سەیر لە ریستورانتی هوتێلەکەن. باوکە، کابرایەکی کەڵەگەتی رەقەڵەیە بە کراسێکی رەشی یەخە شەق و رەقەوە. تەپڵی سەری رووتاوەتەوە و دوو لسپە قژی خۆڵەمێشیی بەملاولای سەریەوە ماوەتەوە. چاوی چووکە و خڕ و بە حوکم و، کەپۆ باریك و زارە داپچڕاوەکەی وایان لێی کردووە لە بایەقۆشێکی* دەستەمۆ بچێ. هەمیشە بەر لە هەموان دەگاتە بەر دەرگای رستورانتەکە. خۆی لادەدا و رێگە بۆ ژنەکەی کە دەڵێی مشکێکی رەشی وردیلەیە چۆڵ دەکا و ئەمجارە بە کوڕ و کچێکی بچووکەوە کە وەکوو تولەفەندی جلوبەرگیان پۆشیوە، لەسەر پاژنەی پێی وەژوور دەکەوێ. کە دەگاتە سەر مێزەکە، رادەوەستێ هەتا ژنەکەی دادەنیشێ. دوایی خۆی دادەنیشێ و، ئینجا دوو تولەسەگەکە بۆیان هەیە لەسەر کورسییەکان دانیشن. بە ژن و منداڵەکانی دەڵێ "بەرێزم"، بە وشەی رێزدارانەوە لۆمەی ژنەکەی دەکا و میراتگرەکەی بە وشەی توند و پتەو.

ـ نیکۆل! هەڵسوکەوتی بەرێزت هەر زۆر ناشیرنە.

کچۆڵەکەشی خەریکە بگری، هەر دەشبێ وابێ.

" ئەمڕۆ سەرلەبەیانی کوڕیژگەکە بە رووداوی مشکەکان زۆر تێك چووبوو. ویستی لە سەر مێزەکە شتێك بڵێ:

ـ فیلیپ! پیاو لەسەر سفرەی نانخواردن باسی مشك ناکا. بۆت نیە لە داهاتوودا ئەم وشەیەت بە زاریدا بێ.

مشکە رەشە گوتی:

ـ بابت هەقێتی.

دوو تولەسەگەکە کلکیان لەگەڵۆزیان نایەوە و بایەقۆش بە سەرلەقاندنێك کە واتایەکی ئەوتۆی نەبوو، سوپاسی کرد.

"وێڕای ئەم نموونە سەیرە، لەم شارەدا ئێجگار زۆر باسی رووداوی ئەو مشکانە دەکرێ. رۆژنامەکانیش خۆیان تێ هەڵقورتاندووە. رووداوە خۆجێییەکان کە زۆرجاران گەلێك جۆراوجۆرن، کەچی ئەوان ئێستا یەکسەر خۆیان تەرخان کردووە بۆ هێرشکردنە سەر سەر شارەوانی. "ئاخۆ

---

* بایەقۆش: کوند، کوندەپەپوو

بەرپرسانی شارەوانیی ئێمە لەم مەترسییە ئاگادارن کە کەلاکی ئەو بوونەوەرە بۆگەنبووانە پێکیانهێناوە؟" بەڕێوەبەری هوتێل هەر ناتوانێ باسی هیچ شتێکی دیکە بکا. چونکە هەر زۆر تووڕەیە. دۆزرانەوەی مشکێك لە ئاسانسۆری هوتێلێکی متمانەپێکراودا بەلای ئەوەوە زۆر خراپە. بۆ دڵدانەوەی وی گوتم:"، بەڵام خۆ ئێستێ هەموان لەگەڵ ئەو مەسەلەیە پێوە بوون."

وەڵامی دامەوە: ـ وایە، ئێستاکە هەموومان وەك یەکین.

"لە یەکەمین دەرکەوتنی ئەو نۆبەتێ* سەیروسەمەرەیەدا کە وردەوردە خەڵکی وەڕەز دەکا، ئەوە ئەو بوو، کە قسەی بۆ من دەکرد. یەکێك لە خزمەتکارەکانی ئەم پەتایەی گرتۆتەوە..

هەوڵی دا زیاتر شیی بکاتەوە:

ـ بەڵام بە دڵنیاییەوە پەرەگر نیە.

" گوتم بۆ من وەك یەك وایە.

ـ بەڵێ، تێدەگەم بەڕێزیشت وەك خۆم وای. تۆش باوەڕت بە قەزا و قەدەر هەیە.

"ئەمن ئەوەندەم شوو لێ نەکێشابوو. جگە لەوەش ئەمن باوەڕم بە قەزاوقەدەر نیە. پێمگوت کە..."

لێرە بە دواوەیە کە لە یادداشتەکانی تارۆدا باسێکی ورد لەسەر ئەم گرانەتا نەناسراوە دەکرێ وا وردەوردە خەڵکی وەڕەز دەکرد. تارۆ وێڕای باسکردن لەوەی پیرەمێردە وردیلەکە پاش ونبوونی مشکەکان پشیلەکانی دۆزیونەوە و بە لەسەرەخۆییەوە سێرەی تفەکانی دەگرێ، ئەمجا دێتە سەر ئەوەی هەر لە ئێستاوە دەتوانین ناوی دە ١٠ جۆری ئەو پەتایە بێنین، کە زۆربەیان مەرگیان لێ کەوتۆتەوە. بە کورتی دەکرێ لێرەدا روخساری دوکتۆر ریڤۆ وەك بەڵگە بێنینەوە کە بەقەڵەمی تارۆ وێنا کراوە. تا ئەو جێگەیەی رووداوگێڕەوە خۆی لەقەرەی داوەریکردن دەدا، قسەکانی زۆر لە راستی دەچێ:

" تەمەنی سیوپێنج ساڵان دەنوێنێ. بەژن و باڵایەکی مامناوەندیی هەیە. چوار شانەیە. دەموچاوی دەکرێ بڵێین چوارگۆشەیە. چاوی رەش و بەبرشتن، بەڵام شەویلکەی زلن. کەپۆیەکی گەورە و رێکی هەیە. قژە رەشەکەی زۆر کورت کردووەتەوە و دوو لێوی ئەستوور دەوری زاریان

---

* نۆبەتێ: گرانەتا، تای بە تەوژم

گرتووە کە زۆربەی کات دەڵێی تەڵەی تەقیون. ئەو بە پێستێکی تاوەسووت و قژی رەش و ئەو جلوبەرگانەیەوە کە هەمیشە رەنگێکی تۆخیان هەیە و لە بەژنیشی دەکاڵێنەوە*، زیاتر لە وەرزێرێکی سیسیلی دەچێ.

"زۆر بە هەڵپە بەرێدا دەڕوا، بەڵام زۆر جاران بە قەڵەمبازێکی کورت دەچێتە شۆستەکەی ئەوبەری. لە پشت سوکانی ماشێنەکەی وڕە و زۆرجاران پاش بادانەوەش گڵۆپی ئاماژەی سووڕانەوەکەی ناکوژێنێتەوە. هەمیشە سەری رووتە و لە کەسێکی تێگەیشتوو دەچێ."

* لێی دەکاڵێتەوە: واتە لێی دێ. لێی جوانە. ئەو جلوبەرگانەت لێ دەکاڵێنەوە. واتە لێت دێن، لێت جوانن. پێوەیان جوانی.

## (٥)

ژمارەکانی تارۆ راست بوون. دوکتۆر ریڤۆش هێندێ شتی لەم بارەوە دەزانی. پاش جوێکردنەوەی تەرمی فەڕاشەکە، تەلەفۆنی بۆ ریشارد کردبوو، بۆ ئەوەی لەسەر ئەم گرانەتایە پرسیاری لێ بکا. ریشارد گوتبووی:

ـ شتێکی وای لێ نازانم. دوو کەس مردوون. یەکێك لە ماوەی چلوهەشت دەمژمێردا، ئەوی دی لە ماوەی سێ رۆژدا. ئەمن سەرلەبەیانیەك دووهەمیانم لە حالێکدا بەجێ هێشت کە بە تەواوی ئاسەواری بەرەوچاکبوونەوەی پێوە دیار بوو.

ـ ریڤۆ گوتی :

ئەگەر یەکێکی دیکەشت هەبوو ئاگادارم کەوە.

دیسان تەلەفۆنی بۆ چەند دوکتۆری دیکەش کرد و لەم لێکۆڵینەوانەوە بەو ئاکامە گەیشت کە لە ماوەی چەند رۆژاندا، بیست بابەتی لەم شێوەیە هەبووە. ئەو نەخۆشانە زۆربەیان مردبوون. ئەمجار داوای لە ریشارد، کە سکرتێری سەندیکای پزیشکانی ئۆران بوو، کرد، نەخۆشە تازەکان لەوانی دی هەڵاوێرن. ریشارد گوتی:

ـ بەڵام ئەمن هیچم لەدەست نایە. پێویستمان بە بڕیاری پارێزگارە. جگە لەوەش کێ بە ئێوەی گوت مەترسیی لێگرتنەوی هەیە؟

ـ کەس چی نەگوت، بەڵام نیشانەکانی پەتاکە جێی نیگەرانین.

لەگەڵ ئەوەشدا ریشارد، لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە دەسەڵاتی نیە و تەنیا ئەوەندەی لەدەست دێ، کە ئەم مەسەلەیە لەگەڵ پارێزگار بێنێتە بەر باس، بەڵام لە جەنگەی ئەم قسانەدا کەش و هەواش تێك چوو. سبەینێی پاش مەرگی فەڕاش، گەواڵە هەوری چڕ و رەش ئاسمانیان داپۆشین، بارانی بە لێزمە و پەڵە بەسەر شاردا بارین. گەرمایەکی نەبڕاوە بە دوای ئەم رێژنە لەناکاوانەدا هەڵیکرد. تەنانەت دەریاش رەنگە شینە تۆخەکەی خۆی پێوە نەمابوو و، لە ژێر میچی ئاسمانە تەماویەکەدا ئەویش رەنگی زیوین، یا ئاسنینی لێ نیشت، رەنگێك کە چاوی ئازار دەدا. گەرمای شێداری ئەم بەهارە ئارەزووی تینی وشك و سووتێنەری هاوینی لە دڵاندا دەژیاندەوە. داهێزراوییەکی خەفتهێنەر باڵی بەسەر شارەکەدا کێشابوو، کە لەسەر بانوەکەی خۆی لە شێوەی شەیتانۆکە دروست کرابوو و، بە زەحمەت دەریای لێوە دیار بوو. لە نێوان دیوارە دوورودرێژە گەچییەکانیەوە، لەو کۆڵانانەدا کە جامخانەکانیان تار بوون و، لەو شەمەندەفەرانەدا کە رەنگێکی زەردی چڵکنیان هەبوو، مرۆڤ هەستی دەکرد لە بن میچی ئاسماندا زیندانیە. تەنیا نەخۆشە پیرەی ریڤۆ بە کەڵکوەرگرتن لەم هەوایە، بەسەر پشووسوارییەکەیدا زاڵ دەبوو و دەیگوت:

ـ دەیکولێنێ. بۆ نەخۆشیی سیپەلك باشە.

هەر بە راستی دەیکوڵاند، بەڵام نە کەمتر و نە زیاتریش لە گرانەتا. هەموو شار تای لێهاتبوو، یا لانیکەم دوکتۆر ریڤۆ سەر لە بەیانیی ئەو رۆژەی رۆیبوو بۆ لێکۆڵینەوەی پێوەندیدار بە هۆکاری خۆکوشتنەکەی کۆتارەوە لە کۆڵانی فێدێرب، وای هەست دەکرد، بەڵام ئەو هەستە بە لایەوە ناماقووڵ بوو و پێی وابوو لەبەر ئەوەیە، کە تووڕەیە و بیروزەینی زۆر ئاڵۆزن و پێی وابوو دەبێ زۆر زوو تۆزێك مێشکی خۆی بحەسێنێتەوە.

کە گەیشتە ئەوێ، کۆمیسێر هێشتا نەهاتبوو. گرانت لە سەر پێپلیکانەکانەوە چاوەڕوان بوو و بڕیاریان دا لە پێشدا بچنە نێو ماڵەکەوە و دەرگاکەی بخەنە سەر پشت.

فەرمانبەرەکەی شارەوانی، لە دوو ژووردا کە هێندێکی کەلوپەل لێ بوو، دەژیا. قەفەزەیەکی لە تەختەی سپی سازکراو، کە دوو سێ وشەدان(قاموس)ــی لەسەر بوو و، تەختە رەشێك کە هێشتا ئاسەواری ئەم نووسراوە بە رواڵەت سڕاوەیەی "رێگە پڕ لە گوڵەکان"ی

لەسەر دەخوێنراوە بە و سەرنجی بۆ لای خۆی رادەکێشا. بە قسەی گرانت، کۆتار شەوێ دەخەوێ، کەچی بەیانی بە ژانەسەری خۆی وەخەبەر دێ و ناتوانێ بجوولێتەوە. گرانت گرژ و شەکەت دیار بوو، بە باری درێژی و پانایی ژوورەکەدا پیاسەی دەکرد و جاروبار ئەو دۆسییە ئەستوورەی لە سەر مێزەکە بوو و پڕ بوو لە کاغەزی رەشنووس، هەڵدەدایەوە و دایدەخستەوە.

لەو نێوەدا، بۆ دوکتۆری گێڕایەوە کە کۆتار باش ناناسێ، بەڵام پێی وایە داهاتێکی کەمی هەیە. کۆتار کابرایەکی سەیر بوو، زۆر لەمێژ بوو کە پێوەندیی نێوانیان هەر ئەو سڵاو و چاکوخۆشییەی سەر پلیکانەکان بوو:

ـ تەنیا دوو جارم قسە لەگەڵ کرد. چەند رۆژ لەمەوبەر قوتووەکی تەباشیرم هێنابۆوە لەسەر پێپلیکانەکان لەدەستم بەربۆوە و لێم بلاو بوونەوە، تەباشیری سوور و شینی تێدابوو. لەو کاتەدا کۆتار لە ژوورەکەی هاتە دەرێ و بۆ کۆکردنەوەی تەباشیرەکان یارمەتیی دام. لێی پرسیم کە ئەم تەباشیرە رەنگاورەنگانە بۆ چ دەبن.

ئیدی گرانت پێی دەڵێ، خەریکم تۆزێك پرۆڤەی زمانی لاتینی دەکەم. لە کاتی خوێندنی دواناوەندییەوە تا ئێستا زانیارییەکانی تاڕادەیەك لەبیر چووبوونەوە. بە دوکتۆری گوت:

ـ بەڵێ پێیان گوتبووم کە بۆ ئەوەی باشتر لە زمانی فەرەنسی تێ بگەی، دەبێ لاتینی بزانی.

هەر بۆیە وشە لاتینییەکانی لەسەر تابلۆ دەنووسینەوە. ئەمجارە بەشێك لەو وشانەی کە لە ئاکامی رێزماندا گۆڕانیان بەسەردا دەهات، بە تەباشیری شین و ئەوانەش کە ناگۆڕێن بە تەباشیری سوور دەینووسینەوە.

ـ نازانم کۆتار لە قسەکانم تێگەیشت یان نا، بەڵام دەتگوت بە لایەوە سەرنجڕاکێش بووبێتن و داوای تەباشیرێکی سووری لێکردم. ئەمن برێك سەرم سووڕ مابوو، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو قسانەشدا ... بە دڵنیاییەوە نەمدەزانی ئەم تەباشیرەی بۆ جێبەجێکردنی مەبەستەکەیەتی.

ریڤۆ لێی پرسی، جاری دووەم باسی چیتان کرد؟ بەڵام هەر لەو کاتەدا کۆمیسێر و سکرتێرەکەی گەیشتنێ و ویستی لە پێشدا گوێی لە قسەکانی گرانت بێ. دوکتۆر زانیی، گرانت کە باسی کۆتار دەکا، بەردەوام بە "هیوابڕاو" ناوی دێنێ، تەنانەت جارێکیش

دەستەواژەی "بڕیاری شووم"ــی بەکار هێنا. باسی هۆکارەکانی خۆکوشتنیان کرد و گرانت لە هەڵبژاردنی وشەکاندا زۆر بەسەرنج و وردبین بوو. ئاخری لەسەر دەستەواژەی "خەمە دەروونیەکان" پێیان داگرتەوە. کۆمیسێر پرسیی، ئاخۆ کۆتار بە هەڵسوکەوتییەوە دیار بوو کە دەیەوێ وەها بڕیارێك بدا؟

گرانت گوتی:

ـ دوێنێ لە دەرگای ماڵەکەمی دا و داوای شقارتەی کرد. شەمچەکەم دایە. داوای لێبووردنی کرد و گوتی: "جیرانەتییە". دوایی گوتیشی شقارتەکەم بۆ دێنێتەوە و پێیم گوت هەڵیگرێ بۆخۆی.

کۆمیسێر لە فەرمانبەرەکەی شارەوانیی پرسیی ئاخۆ کۆتاری پێ کەسێکی سەیر نەبووە؟

ـ ئەوەی بە لامەوە سەیر بوو ئەوە بوو، کە ئەو دەیەویست سەری قسە بکاتەوە، بەڵام ئەمن سەرقاڵ بووم.

گرانت بەلای ریڤۆدا وەرسووڕایەوە و بە هێندێك زویرییەوە گوتی: ـ کارێکی شەخسییە.

کۆمیسێر دەیویست چاوی بە نەخۆشەکە بکەوێ، بەڵام ریڤۆ لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە دەبێ لە پێشدا کۆتار بۆ ئەو چاوپێکەوتنە ئامادە بکەن. کە لە کۆتار وەژوور کەوت، تەنیا جلێکی فلانێلی قاوەیی لەبەردا بوو و، هەستابوو و بە نیگەرانیەوە لە دەرگای دەڕوانی.

ـ پۆلیسە، ها؟

ریڤۆ گوتی:

ـ بەڵێ و هیچ شلوێ مەبە. ڕێوشوێنێکی سادەی ئیدارییە، کە دەبێ بەڕێوە بچێ.

بەڵام کۆتار گوتی ئەم کارە هیچ سوودێکی نیە و ئەو کەیفی بە پۆلیس و مۆلیسان نایە. ریڤۆ بڕێك بە وەڕەزییەوە گوتی:

ـ ئەمنیش پێت وا نەبێ بیری پۆلیسم کردووە. دەبێ بە خێرایی و بە راستی وەڵامی پرسیارەکانیان بدرێتەوە بۆ ئەوەی خێرا بیپێچنەوە.

کۆتار بێدەنگ بوو و دوکتۆر بەرەو دەرگا گەڕاوە، بەڵام کابرا دیسان بانگی کردەوە. کاتێك ریڤۆ لێی چووە پێشێ، هەردوو دەستی گرت:

ـ پیاوی نەخۆش بۆ ئەوە نابێ سەرودڵی بگرن، ئەویش کەسێك کە خۆی هەڵواسیوە. وانیە دوکتۆر؟

ریڤۆ چاوێکی لێکردەوە و دڵنیای کردەوە لەوەی هیچ سەرودڵگرتنێك لە گۆڕێ نیە، خۆشی هاتووە بۆوەی نەخۆشەکەی بپارێزێ. نەخۆش دڵی ئاوی خواردەوە و دوکتۆر کۆمیسێری هێنایە ژوورەوە.

ئەو شایەتییانەی گرانت لەسەر کۆتار دابوونی، بۆیان خوێندەوە و لێیان پرسی ئاخۆ دەکرێ بڵێ بۆ وای کردووە؟ ئەو بەبێ ئەوەی چاو لە روخساری کۆمیسێر بکا، گوتی:" خەم و پەژارە دەروونیەکانی تەواو پڕ بە پێستە." کۆمیسێر بە پێداگرییەوە لێی پرسی، ئاخۆ حەزی لێیە دیسانیش کاری وا بکاتەوە؟ کۆتار تینێکی وەبەر هاتەوە و گوتی نەخێر. تەنیا حەز دەکا لەکۆڵی ببنەوە.

کۆمیسێر بە لەبزێکی تووڕەییەوە گوتی:

ـ پێویستە پێت بڵێم، ئەوە تۆی تەناهی و ئاسایشی خەڵکت تێك داوە.

بەڵام بە ئاماژەیەکی ریڤۆ هەر لەوێوە کۆتاییان بە مشتومڕەکە هێنا. کە دەهاتنە دەرەوە، کۆمیسێر ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ بیر لەوە بکەوە، لەوەتا مەسەلەی ئەو "تا"یە هاتۆتە گۆڕێ، نامانپەرژێ سەری خۆمان بخورێنین.

لە دوکتۆری پرسی کە وەزعەکە نالەبارە یان نا و، دوکتۆر لە وەڵامدا گوتی سەری لێ دەرناکا. کۆمیسێر ئەوەی لێ هەڵکڕاند:

ـ بە دڵنیاییەوە هی کەش و هەواکەیە.

لەوانەبوو هی کەشوهەواش بێ. رۆژ لەگەڵ رۆژ هەموو شتێك بە دەستەوە دەنووسا و ریڤۆ سەردانی هەر نەخۆشێکی دەکرد زیاتر ترسی رێدەنیشت. هەر دوانیوەڕۆی ئەو رۆژە لە قەراغی شار، یەکێك لە جیرانەکانی نەخۆشە پیرەکە دەستی بە ران و بەلەکیدا دێنا و بە دەم ورێنەکردنەوە دەرشایەوە. لووەکانی ئەو لە لووی پیرەمێردەکە گەورەتر بوون و، یەکێکیان

زینچکاوی* لێ دەهاتەدەرێ و دوای تاوێك وەك میوەیەکی رزیو زاری داپچڕی. ریڤۆ لەگەڵ گەیشتنەوەی بۆماڵێ تەلەفۆنی بۆ عەمباری بەرهەمە دەرمانیەکانی هەرێم کرد. یادداشتە پرۆفیشناڵەکانی ئەو لەم رێکەوتەدا تەنیا دوو شت روون دەکەنەوە: "وەلامی نەخێر" و دیسانیش بانگیان دەکردەوە بچێتە ژوور سەری ئەو نەخۆشانەی کە نەخۆشییەکانیان هەر لەو جۆرە بوون. دەبوایە لووەکان هەڵدڕن، ئەوە قسەی لەسەر نەبوو. دوو زەبری مووسەکە بە شێوەی "لێکدان" بەس بوو بۆ ئەوەی زینچکاو و کێم و خوێن لە لووەکان بێتەدەرێ. برینە زارداپچڕیوەکان خوێنیان لێ دەچۆڕایەوە، بەلام زگ و ران و بەلەکیان پەڵەی تێدەکەوت. یەکێك لە لووەکان کێماوەکەی دەوەستا و دیسان هەڵدەمسایەوە. زۆربەی جار، نەخۆش بە بۆگەنێك کە مێشکی سەری بنیادەمی دەبرد، دەمرد .

رۆژنامەکان کە ئەو هەمووە لەسەر رووداوی مشکەکان چەنەوڕییان کردبوو، ئیتر متەقیان لێ بڕابوو، چونکە مشك لە کۆلاندا دەمرن، کەچی بینادەم لە نێو ماڵێدا و، رۆژنامەکانیش خۆ هەرا کاریان بە نێو کۆلانانە، بەلام پارێزگار و شارەوانی وردەوردە فکریان لێ پەیدا دەبوو. هەتا ئەو کاتەی هەر پزیشکێك دووان یا سیان لەو پەتایەیان نەدیتبوو، کەس نەدەبزووت، بەلام هەر ئەوەند بەس بوو یەکێك هەموو ئەوانە کۆ بکاتەوە سەر یەك و ئەو "کۆ"یە سەرسووڕهێنەر بوو. تەنیا لە ماوەی چەند رۆژێکدا، ئەوەندە مەرگەی کە ئاکامی ئەو پەتایە بوون، چەند ئەوەندەی لێهات و ئەوانەی لەگەڵ ئەو پەتا سەیروسەمەرەیە دەستەوئێخە بوون، لێیان روون بۆوە، پەتایەك بەرۆکی گرتوون کەس ناپارێزێ.

کاستێل یەکێك لە هاوکارەکانی ریڤۆ کە زۆریش لە خۆی بەتەمەنتر بوو ئەو ساتەی بۆ دیتنی ئەو بە گونجاو زانی. گوتی:

ـ ریڤۆ دیارە تۆ دەزانی ئەو پەتایە چییە؟

ـ چاوەڕوانی ئاکامی شیتەڵکارییەکانم.

ـ من دەزانم و پێویستیشم بە شیتەڵکاری نیە. من ماوەیەکی زۆر لە چین پزیشك بوومە و بیست ساڵێك لەمەوبەریش چەند بابەتێکی لەم جۆرەم لە پاریس بینیوە. جارێ هیچ کەس

* زینچکاو: چڵك و چەپەری برین. کێم

ناوێرێ ناوێکی لێ بنێ. بیروڕای گشتی پیرۆزە. نابێ بیشێوێنین. بە تایبەتی نابێ بیروڕای گشتی بشوێنرێ. پاشان، هەر وەك یەکێك لە هاوکارەکان دەیگوت: " مەحاڵە، هەموان دەزانن ئەم پەتایە لە جیهانی خۆراوادا بنەبڕ بووە." بەڵێ مردووەکان نەبێ، هەموان ئەوەیان دەزانی. دەی باشە ریڤۆ تۆش وەکوو من دەزانی چییە.

ریڤۆ خەیاڵ هەڵیگرت. لە پەنجەرەی ژووری کارەکەیەوە زینوێ بەردینە بەرزەکەی دەبینی، وا لە دوورەوە، لە لێواری کەنداوەکەوە وێك دەهاتەوە. ئاسمان ئەگەرچی ساماڵ بوو، بەڵام رووناکییەکی مات و لێڵی هەبوو و تا بەرەو ئێوارە هەڵدەکشا، کاڵتر دەبۆوە.

ـ بەڵێ کاستێل، باوەڕکردنەکەی دژوارە، بەڵام وێدەچێ تاعوون بێ.

کاستیل هەستا و بەرەو دەرگا رۆیشت. پزیشکە پیرە گوتی:

ـ هیچ دەزانی چ وەڵامێکمان دەدەنەوە؟ " لەمێژ ساڵە ئەم پەتایە لە وڵاتە فێنکەکاندا دیار نەماوە."

ریڤۆ شانەکانی هەڵتەکاند و گوتی:

ـ" دیارنەمان" یانی چی؟

ـ بەڵێ، لە بیریشتان نەچێ: لە پاریسیش نزیکەی بیست ساڵ لەمەوبەر...

ـ دەی باشە هیوادارم ئێستاش لەوی ئەودەم مەترسیدارتر نەبێ، بەڵام بەراستی عەقڵ نایبڕێ.

# ٦

وشەی تاعوون یەکەم جار بوو دەهاتە سەر زاران. لەم جێیەی بەسەرهاتەکەدا کە بێرنارد ریۆ لەو دیو پەنجەرەکەی خۆیەوە بەجێ دەهێڵێ، دەبێ لە بەسەرهاتگێڕەوەکە بگەڕێین سەرسووڕمان و گومانەکەی دوکتۆر پشتڕاست بکاتەوە، چونکە دژکردەوەی ئەو بە هێندێ وردە جیاوازییەوە، رێك وەك دژکردەوەی زۆربەی خەڵکی شارەکەی ئێمە وا بوو. بەڵا زۆربەی جاران شتێکی هاوبەشە، بەڵام کە لەنەکاو بەسەرتان دێ، بە زەحمەت بڕوا دەکەن. لە جیهاندا ئەوەندەی شەڕ هەبووە تاعوونیش هەر هەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا تاعوونەکان و شەڕەکان بەردەوام لە نەکاو بەسەر خەڵکیدا دەدەن. دوکتۆر "ریۆ"ش وەك هەموو هاووڵاتییەکانی ئێمە لە نەکاو بەسەردا کەوتبوو و، بەو جۆرەیە کە دەبێ لە گومانەکانی وی تێبگەین. دەبێ لەوە تێبگەین ئەو لە نێوان خورپە و شڵەژاوی و دڵنیاییدا بێدەنگ مایەوە. کاتێك شەڕێك هەڵدەگیرسێ، خەڵك دەڵێن: "زۆر ناخایەنێ، گەمژانەیە." و بێگومان شەڕ زۆر گەمژانەیە، بەڵام ئەم خاڵە نابێتە هۆی وەستاندنی. گەمژەیی بەردەوام هەیە و ئەگەر مرۆڤ هەر بیری لەخۆی نەکردایەتەوە، (ئەم گەمژەییەی) دەبینی. خەڵکەکەی ئێمەش بۆ ئەو وەزعە، وەك باقی خەڵکی دیکە بوون، بیریان لە خۆیان دەکردەوە یا بە واتایەکی دیکە مرۆڤدۆست بوون: باوەڕیان بە بەڵا و نەگبەتییەکان نەبوو. بەڵام پێوەی ئینسانیی نییە. هەر بۆیەش مرۆڤ دەڵێ بەڵا حەقیقەتی نیە و، خەونێکی ئاڵۆزە و رادەبرێ. کەچی تێناپەڕێ و ئەوە مرۆڤەکانن لە خەونێکی ئاڵۆزەوە دەچنە نێو خەونێکی ئاڵۆزی دیکەوە و، ئەم خەونە ئاڵۆزانەش بەر لە

هەموو کەس بەرۆکی مرۆڤدۆستەکان (هیۆمانیستەکان) دەگرن، چونکە ئەوان بە گوێرەی پێویست خۆیان بۆ ڕێكنەخستووە. نەدەکرا هاوولاتییەکانی خۆمان لەوانی دیکە بە خەتابارتر بزانین. ئەوان تەنیا لە بیریان دەچۆوە خاکەڕا بن و پێیان وابوو هێشتا هەموو شتێك کردەنیە و هەربۆیەش دەگەیشتنە ئەو ئاکامەی کە نەهامەتی مەحالە. درێژەیان بە دانوستان و ساتوسەوداکانیان دەدا. خۆیان بۆ سەفەران ڕێك دەخست و بیر و باوەڕی تایبەت بەخۆیانیان هەبوو. چۆن دەکرا بیر لە تاعوون بکەنەوە کە داهاتوو و سەفەر و چەلەحانێ* و گەنگەشەکانی لێ تێك دەدان و کۆتایی پێ دێنان؟ خۆیان بە ئازاد دەزانی، بەلام هەتا بەلا و نەهامەتی لەگۆڕێ بێ، هیچ کەس ئازاد نابێ.

تەنانەت پاش ئەوەی ریڤۆ لای برادەرەکەی گوتیشی، کە هەندێ نەخۆش لێرەو لەوێ و بەبێ ئەوەی ئاگایان لێ بێ، بە تاعوون مردوون، هێشتا مەترسییەکە بۆ وی نەببووە شتێکی ڕاستەقینە. بنیادەم تەنیا وەختێك کە پزیشکە، وێنایەك لە ژان دێنێتە بەرچاوی خۆی و ئەویش بەشی هەرە زۆری، هەر خەیالاتە. ریڤۆ کاتێ لە پەنجەرەوە سەیری شارەکەی خۆی دەکرد، کە هیچ نەگۆڕابوو، تازە هەستی بە سەرهەڵدانی ئەو دڵەخورپەیە دەکرد کە پێی دەڵێن شڵەژان، هەوڵی دەدا لە مێشکیدا چیی سەبارەت بەو نەخۆشییە دەیزانێ بیخاتەوە سەریەك. پرسیارەکان لە مێکشیدا شەپۆلیان ئەدا و بە خۆی دەگوت: ئەو سی تاعوونە گەورەیەی مێژوو بەخۆیەوە دیوە، نزیکەی سەد ملیۆن کەسی کوشتووە.

بەلام سەد ملیۆن مردوو یانی چی؟ بنیادەم ئەگەر شەڕیشی کردبێ تازە بە حاڵەحاڵ تێدەگا مردوو یانی چی؟ چونکە ئینسان کە مرد ئیتر قەدر و قیمەتی نامێنێ. سەت ملیۆن تەرم بە درێژایی مێژوو تەنیا دووکەڵێکە لە خەیاڵداندا. دوکتۆر تاعوونەکەی قوستەنتەنیەی بیر دێتەوە، کە بە قسەی پرۆکۆپیۆس لە یەك ڕۆژدا دەهەزار کەسی کوشتبوو. دە هەزار مردوو، واتە پێنج هێندەی حەشیمەتی نێو سینەمایەکی گەورە. ئەوەیە ئەو شتەی دەبێ بکرێ: ئەو خەڵکەی لە پێنج سینەما دێنە دەرێ، دەبێ لە شوێنێك کۆ بکرێنەوە و ببردرێنە یەکێك لە گۆڕپانەکانی شار و لەوێ بە کۆ بیانکوژیت بۆ ئەوەی ئەم ژمارەیە برێك ڕوونتر ببینرێ.

---

* شەڕە قسە. چەنەلێدان

لانیکەم بەم شێوەیە دەکرێ خەڵکی ناسراو و ناوداریش بخەینە سەر ئەم کۆگا بێ ناوونیشانە. دیارە وەها شتێك مەحاڵە و ئەمجار، کێ دەهەزار روخسار دەناسێتەوە؟ جگە لەوەش خۆ دیارە کەسانێکی وەکوو پرۆکۆپیۆس بەسەرکردنەوە و ژماردنیان نەدەزانی. لە کانتۆنی حەفتا ساڵ لەمەوبەردا پێش ئەوەی بەڵا و نەهامەتییەك بەسەر خەڵکی بێ، چل هەزار مشك بە تاعوون تۆپیبوون، بەڵام لە ساڵی ١٨٧١دا هیچ ئامرازێك بۆ ژماردنی مشکەکان لەبەردەستان نەبووە. بە مەزەنە و بەسەر یەکەوە، لێکیان دەدایەوە و دیارە زۆربەی جاران بە هەڵە چوون، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر مشکێك سی سەنتی مەتر درێژ بێ، ئەگەر چل هەزار مشك لەسەر یەك هەڵچنی درێژاییەکەی...

بەڵام دوکتۆر وەڕەز دەبوو، خۆی بە دەم شەپۆلەکەوە دەدا و ئەوەش دروست نەبوو. چەند بابەتی هاوشێوە، نابێتە پەتای گشتی. هەر ئەوەندە بەسە بە گوێرەی پێویست پارێز بکرێ. پێویست بوو پشت بەو نیشانانە ببەستن کە بە دەستیانەوە بوون. داهێزراوی و بێ‌نەشەیی و وڕێنەکردن، پەڵەی سەر لەش و شەقارشەقاربوون لە ناوەوە و لە سەرووی هەموو ئەوانەشەوە، رستەیەك بەردەوام لەبەر چاوی دوکتۆر ریڤۆ بوو، رستەیەك کە لە دەفتەری یادداشتەکانی ئەودا نیشانەی پەتاکەی کامڵ دەکرد: " ترپەی دڵ لاواز دەبێ و یەك جووڵەی بچووك، مەرگی بەدووەدا دێ." بەڵێ لە کۆتایی هەمووی ئەوانەدا سێ لەسەر چواری نەخۆشەکان ــ ئەو رێژەیەیان راست بوو ــ ژیانیان بە هەودایەکی ناسکەوە گرێ درابۆوە و، بۆ ئەم جووڵە کزەی وا گیانی لێ دەستاندن، حەجمینیان نەبوو.

دوکتۆر هەروا لە پەنجەرەوە دەیڕوانی. لە لایەکی شووشەکەوە ئاسمانی ساو و سامالی بەهاری و لە لایەکی دیکەوە وشەیەك کە هێشتا زایەڵەکەی بە ژوورەکەدا دەگەڕا: تاعوون. ئەم وشەیە تەنیا هەڵگری ئەو مانایە نەبوو وا زانست بۆی دیاری کردبوو، بەڵکوو هەودایەك وێنەی سەیر و سەمەرەی بە دواوە بوو، کە لەگەڵ ئەم شارە زەرد و خۆڵەمێشییە زۆر یەکیان نەدەگرتەوە. شارێك کە لەم کاتەدا جمووجۆڵێکی مامناوەندیی هەبوو: لە بری دەنگەدەنگ، قریوە و قاووقیژەکەی بەرز بوو و، بەگشتی بەختەوەر بوو: ئەگەر بکرێ لە یەك کاتدا هەم بەختەوەر بیت و هەمیش داماو. هێمنیەکی ئەوەندە نەرم و نیان و ئەوەندە کەمتەرخەم بە

سادەیی نکۆڵیی لە وێنە کۆنەکانی بەڵا و نەهامەتی دەکرد: وێنەی ئەسینای تاعوونلێدراو کە باڵندەکانی کۆچیان کردبوو، شارەکانی چین کە پڕاوپڕ بوون و لە خەڵکێکی نیوەزیندووی بێدەنگ و متەقلێبڕاو. ئەو حوکمدراوانەی لە "مارسی" تەرمە شەقاربووەکانیان هەڵدەڕشتنە نێو قووڵکەکانەوە. دیواری گەورەی پرۆڤانس کە بە مەبەستی پێشگرتن لە بای تووڕەی تاعوون هەڵدەچنرا، "یافا"و سواڵکەرە بێزراوەکانی، ئەو نوێنە خووساو و رزیوانەی بە زەوییە رەق و تەقەکەی نەخۆشخانەی قوستەنتەنیەوە دەنووسان، ئەو نەخۆشانەی پەتیان لە لاقیان کردبوون و رایاندەکێشان، کەرنەڤاڵی پزیشکە دەمامك لەرووەکانی سەردەمی تاعوونە رەشەکە، دەست تێکەڵکردنی زیندووەکان لەگەڵ یەکدی لە گۆڕستانی میلاندا، عارەبانەی مردووان لە لەندەنی تۆقیو و زراوچوودا و هاواری بەردەوامی مرۆڤەکان کە بە شەو و رۆژ هەموو شوێنێکی دەئاخنی. نەخێر، ئەو شتانەی بەسەر یەکەوە ئەوەندە بەهێز نەبوون کە بتوانن هێمنیی ئەو رۆژە بشێوێنن. لەو دیوی دیکەی جامەکەوە دەنگی شەمەندەفەرێکی نادیار لە نەکاو بەرز بۆوە و لە یەك ساتدا نکوولێی لە ترس و ئازار دەکرد. تەنیا دەریا لەوبەری ریزی سەربانە چوارگۆشە و رەشەکانیماڵەکانەوە دەیدی، کە جیهان قەت بەبێ دڵەڕاوکێ نەبووە و نابێ و، هێمنی هەر نەبووە و نییە. دوکتۆر ریڤۆ کە بەرە و کەنداو دەیڕوانی، بیری لەو کۆگا پووشکەیەی خەڵکی ئەسینای تاعوونلێدراو دەکردەوە، کە لە قەراغ دەریا گڕیان تێبەردابوو و لوکرێتیۆسی شاعیر و فەیلەسووف لە کتێبەکەی خۆیدا (لەمەڕ سرووشتەوە) باسی کردووە: بە درێژایی شەو مردووەکانیان بۆ سووتاندن دەبردە ئەوێ، بەڵام جێگە نەبوو و، زیندووەکان بۆ کردنەوەی جێگەیەك بۆ ئازیزەکانیان بە مەشخەڵان لێکیان دەدا و ئەو شەڕە خوێناوییەیان پێ باشتر بوو لەوەی تەرمەکان لە قوژبنێك فڕێ بدەن. دەکرا لەبەردەم ئاوە مەند و لێڵەکەدا وێنەی چرپی و پووشکە سوورەکان بێنیتە بەرچاو. شەڕ بە مەشخەڵ لە شەوێکی پڕ لە بڵێسەدا و هەروەها هەڵمی خەستی ژەهراوی کە بەرەو ئاسمانی نیگەران هەڵدەکشا. جێگەی ترس بوو...

بەڵام ئەم سەرلێشێواوییە خۆی لەبەر ئەقڵ رانەدەگرت. راستە وشەی تاعوون کەوتبووە سەر زاران. راستە هەر لەو ساتەشدا یەك یا دوو تووشبووی هەڵدەلەرزاند و لە عەرزی دەدان، بەڵام لەوانەبوو راوەستێ. ئەوەی ئێجگار پێویست بوو ناسینی ئەو نەناسراوە بوو کە دەبوو بناسرێ.

وەلانانی سێبەرە پووچەکان و گرتنەبەری رێوشوێن بوو. ئەوکات تاعوون پێشی پێ دەگیردرا. چونکە خەڵك هیچ وێنایەکیان لە تاعوون لە مێشکیدا نەبوو، یا خراپی لێ تێگەیبوون. بەڕاستی وا جیار بوو ئەگەر تاعوون پێشی گیرابا، کاروبارەکان وەگەڕ دەکەوتنەوە. ئەگەر واش نەبوایە روون دەبووەوە چییە و ئەگەر لە سەرەتادا هیچ کەرەسەیەك لە گۆڕێ نەبوو، دواتر تێکیان دەشکاند.

دوکتۆر پەنجەرەکەی کردەوە و لە نەکاو دەنگی شار بەرز بۆوە. لە کارگەکەی تەنیشتیانەوە خڕەی کورت و بەردەوامی مشارێکی کارەبایی دەهات، ریڤۆ بای باڵی خۆی دا. دڵنیایی و متمانە لەوێ بوو. لە کاروباری رۆژانەدا. باقی بە زنجیرە و جووڵەی ناڕوون و بێواتاوە بەسترابوونەوە کە بۆوە نەدەبوو پشتیان پێ ببەستی. بنەما ئەوە بوو مرۆڤ کار و ئەرکی خۆی بە باشترین شێوە راپەڕێنێ.

دوکتۆر ریڤۆ نوقمی بیر و خەیاڵی خۆی بوو کە هەواڵی هاتنی ژوزێف گرانتیان بۆ هێنا. گرانت فەرمانبەری شارەوانی بوو و لەگەڵ ئەوەدا کاروباری جۆراوجۆری هەبوو، جاروبارە لە لقی سەرژمێریی ئیدارەی رەگەزنامە، بۆ کاری دیکەش داوای یارمەتیان لێ دەکرد. بەو شێوەیە کۆکردنەوەی ئاماری مردووان خرابووە ئەستۆی ئەو و، لەبەر ئەوەی دڵێکی مێهرەبانی هەبوو قەبووڵی کردبوو هەر خۆی نەسکێك* لەو ئامارە بۆ دوکتۆر ریڤۆ بهێنێ.

دوکتۆر گرانتی دی کە لەگەڵ کۆتاری جیرانی وەژوور کەوتن. فەرمانبەرەکەی شارەوانی کاغەزێکی بەدەستەوە رادەوەشاند. گوتی:

ـ دوکتۆر ژمارەیان هەر دێ و پتر دەبێ. یازدە مردوو لە چلوهەشت سەعاتدا.

دوکتۆر سڵاوی لە کۆتار کرد و لێی پرسی. گرانت تێی گەیاند، کە کۆتار دەیەوێ سوپاسی دوکتۆر بکا و بە هۆی ئەو ئەزیەتانەی خستبوویە سەرشانی، داوای لێبووردنی لێ بکا، بەڵام ریڤۆ چاوی لە کاغەزی ئامارەکە کرد و گوتی:

ـ ئیتر پێم وایە دەبێ بڕیار بدەین ناوە راستەقینەکەی خۆی لەو پەتایە بنێین. هەتا ئێستا ئەمبەرئەوبەرمان کردووە، بەڵام لەگەڵم وەرن ئەمن دەبێ بچمە تاقیگە.

---

* نەسك : لەبەر گیراوە ـ کۆپی

گرانت کە بە دوای دوکتۆردا لە پێپلیکانەکانەوە دەچووە خوارێ، گوتی:

ـ بەڵێ، بەڵێ، پێویستە هەر شتەی بە ناوی خۆیەوە بکەین، بەڵام ئەو ناوە چییە.

ـ ناتوانم بە ئێوەی بڵێم و بێ لەوەش بۆ ئێوە باش نیە.

فەرمانبەری شارەوانی بزەیەکی هاتی و گوتی:

ـ دیوتە ئەوەندەش سەهەندە نیە.

بەرەو گۆڕەپانی ئارم وەڕێ کەوتن. کۆتار بێدەنگ بوو. کۆڵانەکان قەرەباڵغتر دەبوون. زەردەپەڕی کەماوەی وڵاتەکەی ئێمە جێگەی بۆ شەو چۆڵ دەکرد و یەکەمین ئەستێرەکان لە ئاسۆوە کە هێشتا رووناك بوو دەردەکەوتن. چەند سات دواتر چرای سەر کۆڵانەکان هەڵ بوون و سەرانسەری ئاسمانیان رەش داگێڕا و دەنگی قسەوباسەکان دەتگوت بە یەك ریتم بەرز بووەتەوە.

لە گۆشەی گۆڕەپانی ئارم گرانت گوتی:

ـ داوای لێبوردن دەکەم. ئەمن دەبێ بگەمە شەمەندەفەر. شەوەکانم لام پیرۆزن. وەك لە زێدەکەی من دەڵێن: " کاری ئەمڕۆ مەخە سبەینێ."

ریڤۆ دەمێك بوو بۆی دەرکەوتبوو گرانت سەرشێتە: ئەم کابرایە کە لە مۆنتەلیمار لەدایك ببوو، سوور بوو لەسەر ئەوەی بەردەوام قسە و نەزیلەی زێدەکەی بێنێتەوە و بە شوێن ئەواندا دەستەواژەگەلی خۆڕایی کە هیچ سەرچاوە و واتایەکیان نەبوو وەك " ساتە خولیاییەکان" یا "رووناکایی ئاسمان" بێنێتە سەر زمانی. کۆتار گوتی:

ـ ئای، وایە. مرۆڤ ناتوانێ دوای نانی شەوێ ئەو لە ماڵەکەی بێنێتە دەرێ.

ریڤۆ لە گرانتی پرسی ئاخۆ کار بۆ شارەوانی دەکا؟ گرانت لە وەڵامیدا گوتی نەخێر، کار بۆ خۆی دەکا.

ریڤۆ بۆوەی شتێکی گوتبێ پرسیی:

ـ دەی باشە کارەکەت دەچێتە پێشێ؟

ـ لە وەتەی کار دەکەم خراپ نیە، بەڵام دەبێ بڵێم بەرەوپێشچوونێکی ئەوتۆی نیە.

دوکتۆر راوەستا و گوتی:

ـ باشە کارەکەت چییە؟

گرانت کە کڵاوە گەڕگەڕیەکەی دەکێشایە سەر گوێچکە زلەکانی، لە بن لێوانەوە هێندێ شتی گوت کە ریڤۆ بەحاستەم تێگەیشت ئەوە باسی شتێکی وەك گەشەکردنی کەسایەتیی چیرۆك دەکا، بەڵام فەرمانبەرەکەی شارەوانی لەو کاتەدا لێیان هەڵبڕابوو و لە شەقامی مارۆن لە بن دار هەنجیرەکانەوە بە وردەهەنگاوی خێرا بەرەو ژوور دەچوو. لەبەردەم تاقیگەکە کۆتار بە دوکتۆری گوت کە دەیویست چاوی پێی بکەوێ و تەگبیرێکی پێ بکا. ریڤۆ کە لە گیرفانیدا کاغەزەکەی ئاماری دێنا و دەبرد، داوای لێکرد لەگەڵیدا بچێتە ژووری کارەکەی. دوایی رای خۆی گۆڕی و گوتی سبەینێ دەچێتە گەڕەکەکەی ئەوان و دوانیوەڕۆ چاوی پێی دەکەوێ.

دوکتۆر پاش ئەوەی کۆتاری جێ هێشت، هەستی کرد بیر لە کرانت دەکاتەوە. گرانتی دەدی کە نوقمی تاعوون بووە. هەڵبەت نەك ئەو تاعوونە کە بە دڵنیاییەوە شتێکی ئەوتۆ نابێ، بەڵکو یەکێك لە تاعوونە گەورەکانی مێژوو:" ئەو لەو کەسانەیە کە بە ساخی لەوەیان قوتار دەبن. " وەبیری هاتەوە لە شوێنێکدا خوێندوویەتەوە تاعوون کاری بەسەر لاوازییەوە نیە و بە تایبەتی کەسانی تۆکمە لە عەرز دەدا. نوقمی ئەو بیر و خەیاڵانە بوو کە فەرمانبەرەکەی شارەوانی بە لای دوکتۆرەوە لە مەتەڵۆکە و نەزیلەیەك دەچوو.

بەراستی لە روانگەی ئەوەوە ژۆزێف گرانت هەر کارمەندێکی سادەی شارەوانی نەبوو، قەڵافەتیشی وای دەنواند. درێژ و رەقەڵە و لە نێو ئەو جلوبەرگانەدا کە بەردەوام گەورە و فشوفۆڵی هەڵدەبژاردن بۆ ئەوەی درەنگتر بدڕێن، هەر لاکەلاکی بوو. ئەگەرچی زیاتر ددانەکانی شەویلکەی خوارەوەی مابوونەوە، بەڵام ددانەکانی سەرەوەی هەموو کەوتبوون. پێکەنینەکەی کە بە تایبەتی لێوی سەرەوەی هەڵدەدایەوە، زارە رەشەکەی دەردەخست. ئەگەر بە رێدا رۆیشتنی فەقێیەك و بۆنی هەڕنەهووتی ژێرزەوی و دووکەڵ و، هێڵی بێ واتای روخسارێك، بخەینە سەر ئەو قەڵافەتە، کابرایەکمان دێتە بەر چاو کە لە پشت مێزێك دانیشتوە و خەریکە بە نرخی حەمامەکانی شاردا دەچێتەوە، یا خەریکی ئامادەکردنی راپۆرتێکە بۆ سکرتێرێکی گەنج لە پەیوەندی لەگەڵ ماڵیاتی تازەی کۆکردنەوەی زبڵ و زاڵی ماڵاندا. تەنانەت یەکێکی نەشیناسیبایە، هەر وای هەست دەکرد ئەو کابرایە تەنیا بۆ ئەوە لە دایك ببوو ئەرکە

هەستپێکراو و پێویستەکانی فەرمانبەرێکی ڕۆژکاری شارەوانی لەبەرامبەر شێستودووفرانك و سی سانتیم لە ڕۆژێکدا جێبەجێ بکا.

لە ڕاستیدا ئەوە ڕوونکردنەوەیەك بوو کە بە قسەی خۆی لەو شوێنەی لاپەڕەی خزمەتەکانیدا کە نووسرابوو "پسپۆڕی"، سەرنجی ڕادەکێشا. دەیگوت: بیستودووساڵ پێش ئێستا پاش وەرگرتنی بەکالۆریوسێك لەبەر دەستکورتی نەیتوانیبوو درێژە بە خوێندنەکەی بدا و، بە ناچاری ئەو پیشەیەی هەڵبژاردبوو و هیواداریان کردبوو کە بەم زووانە دەبێتە فەرمی و پلەی دەدرێتێ، هەر ئەوەندە بەسە هەتا شارەزایی و لێهاتوویبەکەی لەو مەسەلە هەستیارانەدا بسەلمێنێ کە پەیوەندییان بە ئیدارەی شارەکەی ئێمەوە هەیە. دڵنیاشیان کردبۆوە کە دواتر دەیکەنە سکرتێری شارەوانی و بە داهاتەکەی دەتوانێ ژیانێکی تێروپڕ بۆ خۆی پێکەوە بنێ. دیارە ئەوەی ژوزف گرانتی چالاك کردبوو، غەریزەی زێدەخوازانە نەبوو. ئەو بە بزەیەکی خەمناکەوە بنیادەمی لەوە دڵنیا دەکردەوە، بەڵام دوورەدیمەنی ژیانێکی مادی کە لە ڕێگەیەکی سەربەرزانەوە دابین بووبێ و ئیزن بدا بەبێ پەژیوانی خەریکی حەز و گرۆییەکانی ڕابردووی بێ، بە ڕوویەوە پێدەکەنی. بەهۆکارێکی شەرافەتمەندانە بوو، کە ئەو پێشنیارەی قبووڵ کردبوو، یا دەکرێ بڵێین بە هۆی وەفاداری بە ئامانجێکەوە بوو.

چەندی چەند ساڵان بوو، کە ئەو وەزعە کاتییە هەر بەردەوام بوو. خەرج و موخاریجی ژیان زۆر زۆر گران ببوو، کەچی مووچەی گرانت سەرەڕای چەند زێدەمووچەی گشتی، هێشتا شتێکی گاڵتەجاڕانە بوو. لای ڕیقۆ گلەیی لەم بارەی ژیانی خۆی کردبوو، بەڵام هیچ کەس گوێی پێی نەدەبزووت. لێرەدایە باری دەروونیی تایبەت و بێوێنەی گرانت یا لانیکەم یەکێك لە هێماکانی دەردەکەوێ. ئەو ئەگەر نەشیدەتوانی داوای مووچەیەکی ئەوتۆ بکا کە هیچ لێی دڵنیا نەبوو، لانیکەم دەیتوانی داوای جێبەجێبوونی ئەو بەڵێنانە بکا کە پێیان دابوو، بەڵام بەر لە هەموو شتێك، سەرۆکی ئەو ئیدارەیەی وا ئەوی دامەزراندبوو دەمێك بوو مردبوو و، گرانت ئێستا یە وردی دەستەواژەی ئەو بەڵێنیەی لەبیر نەمابوو کە پێی دابوو. لە ئاکامدا و بەتایبەتی ئەو وشانەی بۆ ساخ نەدەبۆوە کە دەبوایە لەم بارەوە بیانڵێ.

وەك ریڤۆ توانیی دەسنیشانی بکا، ئەو هاوولاتییەی ئێمە بەو تایبەتمەندییەوە دەناسرایەوە.
هەر ئەم تایبەتمەندییەش نەیدەهێشت ئەو داوایەك بۆ وەرگرتنی ئەو شتە بنووسیٚ کە دەیەویست، یا هەر نەبیٚ هەولێکی بۆ بدا. بە قسەی خۆی نەیدەتوانی وشەی "ماف" کە باوەڕێکی ئەوتۆی پێی نەبوو بەکار بێنی و وشەی "بەڵێنەکانیش" کە نیشانەی داوایەك بوون و، ئازایەتییەك بوو کە لەگەڵ قەڵافەتی ئەو یەکی نەدەگرتەوە. لە لایەکی دیکەوە بێزار بوو لە وشەگەلی "سەرنج" و " داوا" و "سوپاسکردن" کە پێی وابوو کەسایەتی و شانی وی هەڵی ناگریٚ. بەو شێوەیە هاوولاتییەکەی ئێمە بە هۆی نەدیتنەوەی وشەی پڕ بەپێست و گونجاو هەتا پیر بوو هەر کاری سووك و کەمبایەخیان پیٚ سپارد. بە تایبەتی بەو جۆرەی بە دوکتۆر ریڤۆی دەگوت: بۆی روون بۆوە کە ژیانی مادیی ئەو دابینە، چونکە دەیتوانی پێداویستییەکانی خۆی لەگەڵ داهاتەکەی رێك بخا (بەقەدەر بەرەی خۆی پیٚ راکێشیٚ). بەو جۆرە راست و دروستیی یەکێك لەو قسانەی بۆ روون بۆوە، کە بەدڵی شارەوان بوو. شارەوان کە یەکێك بوو لە خاوەنی پیشەسازییە مەزنەکانی شارەکەمان بە پێداگرییەوە دەیگوت تا ئێستا... (و لەسەر ئەم وشەیە کە قورسایی بەڵگاندنەکەی لەوێدا بوو پێی دادەگرتەوە) تا ئێستا کەس نەیدیوە یەکێك لە برسان بمریٚ. بەهەر حاڵ ژیانی نیوە سۆفیانەی ژۆزیف گرانت ئەوی لە خەیاڵی ئەو قسانە رزگار کردبوو. ئەو تەنیا بە شوێن وشەگەلێکدا دەگەڕا کە بە پێویستی دەزانی بیانڵیٚ.

لە لایەکەوە دەکریٚ بڵێی ژیانی ئەو بێوێنە بوو. ئەو لە شارەکەی ئێمەدا و لە شوێنی دیکەش لەو دەگمەن پیاوانە بوو کە دەیوێرا هەستی خاوێنی خۆی دەربڕیٚ. بچووکترین هەستێکی کە دەریدەبڕی نیشانەی دڵپاکی و هۆگرییەك بوو کە لە سەردەمی ئێمەدا هیچ کەس ناوێریٚ دەریانبڕیٚ. سوور هەڵنەدەگەڕا و پێی شەرم نەبوو دان بەوەدا بنیٚ کە برازاکانی و خوشکەکەی ـ کە جگە لەوانە کەسی نەمابوو ـ خۆش دەوێن و بە دوو ساڵ جارێك بۆ دیتنیان دەچێتە فەرەنسا. دەیگوت بیرەوەریی دایك و باوکی کە بە گەنجی مردبوون ئێستاش هەر دڵی توند دەکات و گوتبووشی، یەکێك لە زەنگەکانی کلێسەی گەڕەکەکەیانی کە هەموو رۆژیٚ لە سەعات پێنجی ئێوارێدا بە نەرمی دەنگی دیٚ، لە هەموو شتێك خۆشتر دەویٚ . کەچی لەگەڵ ئەوانەشدا دۆزینەوەی بچووکترین وشە بۆ دەربڕینی ئەم هەستە سادە و ساکارانە بۆ وی ئێجگار

دژوار بوو. بە کورتی ئەم دژوارییە گەورەترین خەم و مەراقی وی بوو. دەیگوت : " ئاخ دوکتۆر حەزم لێبوو و بریا توانیبایەم ئەوەی لە دڵمدایە هەڵیڕێژم." هەر جارێکی ریڤۆی دەدی باسی ئەوانەی بۆ دەکرد.

ئەو شەوە کاتێك دوکتۆر لە پشتەوەڕا چاوی لە فەرمانبەرەکەی شارەوانی کرد لە نەکاو لێی روون بۆوە گرانت چیی لەدڵ دایە: ئەو بە دڵنیاییەوە یا خەریکی نووسینی کتێبێك بوو، یا شتێکی لەم بابەتە. هەتا دەگەیشتە تاقیگە، ئەم بیرە ورەی وەبەر ریڤۆ دەنا. دەیزانی وەها بیرکردنەوەیەك بێ سوودە، بەڵام نەیدەتوانی بڕوا بکا بەوەی تاعوون بتوانێ بەسەر شارێکا زاڵ بێ، کە هێشتا کۆمەڵێك فەرمانبەری لێقەوماوی بە حەز و خۆزگەی شەرافەتمەندانەوە تێدایە. بە جوانی نەیدەتوانی لە نێو تاعووندا جێگەیەك بۆ ئەم حەز و هۆگرییانە بدۆزێتەوە. هەر بۆیەش پێی وا بوو تاعوون لە نێو خەڵکی شارەکەی ئێمەدا بەردەوام نابێ.

بۆ سبەینێ بە هۆی ئەو پێداگرییەی پێیان وابو بێجێیە، ریڤۆ توانیی کۆمیسیۆنێکی تەندروستی لە پارێزگاری پێك بێنێ. ریشارد گوتبووی:

ـ راستە خەڵك نیگەرانن، جگە لەوەش قسە و قسەڵۆکی هێندێ کەس دەبێتە هۆی گەوەرەکردنەوە و زۆرپێوەنان. پارێزگار گوتی:" ئەگەر پێتان خۆشە با بە خێرایی دەستبەکار بین، بەڵام بەبێدەنگی." چونکە ئەو پێی وایە هەڵڵایەکی درۆیینەیە.

بێرنارد ریڤۆ کە بەرەو شارەوانی دەچوو، کاستێلی سوار کرد . کاستێل پێی گوت:"

ـ ئەرێ دەزانی لەم هەرێمە سیرۆم(موغەزی) دەست ناکەوێ؟

ـ دەزانم زەنگم بۆ عەمبار لێدا، بەرپرسەکە دەستی تێکەڵ هات. دەبێ لە پاریسەوە بێنن.

ـ هیواردارم زۆر نەخایەنێ.

ریڤۆ لە وەڵامدا گوتی:

ـ من مەسەلەکەم راگەیاندوە.

پارێزگار هەرچەندە تووڕەش بوو، بەڵام بە حورمەتەوە. گوتی:

ـ هاوڕێیان با دەست پێ بکەین. ئاخۆ پێویستە کورتی ببڕمەوە؟

ریشارد پێی وا بوو ئەم کارە سوودێکی نیە. پزیشکەکان لە وەزعەکە ئاگادار بوون، مەسەلە هەر ئەوە بوو بزانن چ بڕیارێك بدەن.

کاستێلی پیر بە لەبزێکی تووڕەوە گوتی:

ـ مەسەلە ئەوەیە دەبێ بزانین تاعوونە یان نا؟

دوو سێ دوکتۆر بە سەرسووڕمانەوە ناڕەزایەتیان دەربڕی. ئەوانی دی دڕدۆنگ دیار بوون، بەڵام پارێزگار راچڵەکی و ئاوڕی لە لای دەرگا دایەوە، بۆ ئەوەی دڵنیا بێ کە داخراوە و نەیهێشتووە ئەم وشە مەترسیدارانە بە داڵانەکاندا بڵاو ببنەوە. ریشارد گوتی پێم وایە نابێ چۆك بۆ ترس دابدەین. ئەمە تایەکە ژانەکەی لە ران و بەلەك دەگەڕێ. هەر دەتوانین ئەوەندە بڵێین. گریمانەکان لە جیهانی زانستیشدا وەك ژیان مەترسیدارن. کاستێلی پیر کە لە بێدەنگیدا سمێڵە زەردەکانی دەجوی، چاوە زیتەکانی خۆی لە ریڤۆ بڕین. دوایی نیگایەکی پڕ لە بەزەیی بە هەمواندا گێڕا و گوتی، لێی سوورە ئەم پەتایە تاعوونە، بەڵام ئەگەر بە شێوەیەکی فەرمی بیناسن، پێویستە رێوشوێنێکی بێبەزەییانە بگرنە بەر. دەزانێ هاوکارەکانی هەر لەم رێوشوێنانە تۆقیون و بۆ ئاسوودەکردنی ئەوانیش بێ، ئامادەیە قەبووڵی بکا ئەوە تاعوون نیە. پارێزگار راچڵەکی و گوتی، بەڵام ئەوە شێوازێکی باش نیە بۆ بەڵگەهێنانەوە. کاستێل گوتی:

ـ گرینگ نیە ئاخۆ ئەوە سەلماندنێکی باش بێ یان نا، گرینگ ئەوەیە مرۆڤ ناچار بکا بیر بکاتەوە.

ریڤۆ بێدەنگ بوو، بۆیە رای ئەویان پرسی، گوتی:

ـ "تا"ـیەکە بە نیشانەکانی گەروەخڕەوە، بەڵام لەگەڵ لوودەرکردن و رەشانەوە. من لووەکانم قەڵاشتنەوە و ناردمن بۆ تاقیکردنەوە کە لە ئاکامی ئەو تاقیکردنەوانەدا تاقیگە توانیی باکتریای ورد و تلتەی تاعوون دەسنیشان بکا. بۆ ئەوەی رووتر بیلێم، پێویستە بڵێم هێندێ گۆڕانی تایبەتیی میکرۆب لەگەڵ شێوە ناسراوەکەی خۆیان وێك ناچن.

ریشارد وەبیری هێناوە ئەم خاڵە دڕدۆنگی دەنێتەوە و پێویستە لانیکەم چاوەڕێی زنجیرە تاقیکارییەك بن کە لە چەند حەتوو لەمەوبەرەوە دەستیان پێکراوە. ریڤۆ پاش تاوێك بێدەنگی گوتی:

ـ کاتێك میکرۆبێك بتوانێ لە سێ ڕۆژدا بارستایی سپڵ و سیپەلاك، چوار بەرامبەر لێ بکا و ڕژێنەکان ئەوەندەی نارنجێك و وەك دارێك ڕەق بکا، مسۆگەر جێگەی گومان ناهێڵێتەوە. ناوەندەکانی ئیلتهاب و چڵککردن هەر دێ و زیاتر دەبن. بەو جۆرەی پەتاکە پەرە دەستێنێ، ئەگەر پێشی پێ نەگیردرێ، مەترسیی ئەوە هەیە لە ماوەی کەمتر لە دوو مانگدا نیوەی شارەکە بکوژێ. هەر بۆیە زۆر گرینگ نییە کە ئێوە ناوی بنێن تاعوون، یان تایەکی روو لەگەشە، گرینگ ئەوەیە پێشی پێ بگرن و نەهێڵن نیوەی شارەکە بکوژێ.

ریشاد پێی وابوو نابێ بێ هیوا بن، چونکە لە حاڵێکدا کە هێشتا خزم و کەسی نەخۆش ساخ و سەلیمن ناکرێ بڵێین پەتاکە پەرەئەستێنە.

ریڤۆ بۆ ئاگاداکردنەوە گوتی:

بەڵام ژمارەیەکی دیکە مردوون. دیارە پەرەگری(گوازراوەیی) هەرگیز ڕەها و کامڵ نییە، ئەگینا بەشێوەیەکی بەرچاو سنووری دەبەزاند و دەکشا و وەك هەورەتریشقە شار رادەماڵێ و جووقەوار لە خەڵکەکەی دەبڕێ. مەبەست ئەوە نیە هیوابڕاوتان بکەم، بەڵکو مەبەست ئەوەیە، هەر شتێکمان لە دەست دێ لە پێناو پێشگرتنیدا، با بیکەین.

لەگەڵ ئەوەشدا ریشارد دەیویست بابەتەکە بەو شێوەیە کورت بکاتەوە کە ئەگەر ئەم پەتایە خۆی ڕانەوەستێ، بۆ ڕاگرتنەکەی پێویستە ئەو ڕێوشوێنانە ڕەچاو بکرێن وا لە یاسادا لەبەرچاو گیردراون. بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ بە فەرمی پشتڕاست بکرێتەوە کە ئەم پەتایە تاعوونە و لەبەر ئەوەی ئێستا کەس لێی سوور نیە، دەبێ بیری لێ بکرێتەوە.

ریڤۆ بە پێداگرییەوە گوتی:

ـ مەسەلە ئەوە نیە ڕێوشوێنگەلی دەسنیشانکراوی نێو یاسا توندوتۆڵن یان نا، قسە لەوەیە ئاخۆ بۆ پێشگرتن لە مەرگی نیوەی خەڵکی شارەکە پێویستە دەستوداوێنیان بین یان نا؟ ئەوی دیکە هەمووی ڕێوشوێنی ئیدارییە و سیستەمی حکوومەتەکەمان، پارێزگاری بۆ چارەسەری ئەو کێشانە داناوە.

پارێزگار گوتی:

ـ گومان لەوە نیە، بەڵام ئەمن پێویستیم بەوەیە تۆ پشتڕاستی بکەیتەوە ئەم پەتایە تاعوونە.

ریڤۆ گوتی:

ـ ئەگەر پشتڕاستیشی نەکەینەوە، مەترسیی ئەوە هەیە نیوەی شارەکە بکوژێ.

ریشارد بە لەبزێکی توورەوە قسەکەی پێ بڕین و گوتی:

ـ ئەگەر راستیتان دەوێ، هاوکارەکەمان بڕوای وایە تاعوونە. ئەو شیتەڵکارییەی لە نیشانەکانی پەتاکە کردوویە، هۆکاری ئەو بۆچوونەیە.

ریڤۆ وەڵامی دایەوە، ئەو نیشانەکانی پەتاکەی شی نەکردۆتەوە، بەڵکو ئەوەی شی کردۆتەوە وا دیتوویەتی و ئەوەش کە دیتوویەتی بریتییە لە لووە کوان و پەڵە و تای بە وڕێنەوە، کە لە ماوەی چلوهەشت سەعاتدا ئاکامی شوومی خۆی وەدەر دەخا. ئاخۆ ئاغای ریشارد دەتوانێ ئەم بەرپرسیارەتییە وەئەستۆ بگرێ و بڵێ بەبێ رەچاوکردنی رێوشوێنە توندەکانی تەندروستی، گوێزرانەوەی پەتاکە رادەوەستێ؟

ـ ریشارد دڕدۆنگ بوو، و چاوی لە ریڤۆ بڕی و گوتی:

راست و رەوان باوەڕی خۆتم پێ بڵێ. ئاخۆ دڵنیای تاعوونە؟

ـ تۆ مەسەلەکە خراپ دێنیتە گۆڕێ. جارێ کێشە لەسەر وشە نیە. بەڵکو مەسەلەکە، مەسەلەی کات و دەرفەتە.

پارێزگار گوتی:

ـ وادیارە تۆ پێت وایە ئەگەر ئەم پەتایە تاعوونیش نەبێ، دەبێ ئەو رێوشوێنە تەندروستییە پێویستەی لە بارەی پەتای تاعوونەوە پێشبینی کراوە، رەچاو بکرێ.

ـ ئەگەر لە من دەپرسی، ئەوە بۆچوونی منە.

ـ پزیشکەکان پێکەوە راوێژیان کرد و دواجار ریشارد گوتی:

ـ کەواتە ئێمە دەبێ ئەم بەرپرسیارەتییە وەئەستۆ بگرین کە رێك وەکو تاعوون بەرەوڕووی ئەم پەتایە ببینەوە.

ئەم فۆرمۆلە بە گەرمی پەسند کرا. ریشارد گۆتی:

هاوكاری خۆشەویست، تۆش هەر لەسەر ئەم باوەڕەی؟

ریڤۆ گوتی :

ـ ئەمن فۆرمۆلّم بە لاوە گرینگ نیە. هەر ئەوەندە دەلّێم نابێ وا بجوولّێینەوە وەك بلّێی مەترسیی مەرگ هەڕەشە لە نیوەی شارەكە ناكا. ئەگەر وا نەكەین هەموو دەمرن.

ریڤۆ لە نێو شەپۆلی تووڕەیی هەمووواندا كۆبوونەوەكەی بەجێ هێشت. چەند ساتێك دواتر لە گەڕەكێكی كە بۆنی میز و ماسیی لێ هەلّدەستا، ژنێك كە نیوەنووزەی مەرگی دەهات بەرەو لای وی وەردەسووڕا.

# ٧

بسبەینێی پاش کۆنفرانسەکە، "تا" دیسانیش قەڵەمبازێکی دا. تەنانەت لە ڕۆژنامەکانیشدا دەنگی دایەوە، بەڵام بە شێوەیەکی بێ مەترسی، چونکە بە ئاماژەیەکی کورت وازیان لێ هێنابوو. بەهەرحاڵ ریڤۆ دووسبەی دەیتوانی ئەو ئاگادارییە سپی و وردوردانەی لە لایەن پارێزگارییەوە تەڕدەستانە بە نهێنیترین شوێنەکانی شارەوە درابوون، بخوێنێتەوە. بەو ئاگادارییانە لێت روون نەدەبۆوە ئاخۆ بەرپرسە پێوەندیدارەکان، مەسەلەکەیان بە هەند وەرگرتووە یان نا؟ ڕێوشوێنەکان زۆر سەخت و توندوتۆڵ نەبوون و دیار بوو بۆ ئەوەی بیروڕای گشتی نەشێوێ (خەڵك نەتۆقێنن)، بەشێکی بەرچاویان کردۆتە قوربانی. پێشەکیی ئەم وریاییدانە رایدەگەیاند، چەند نموونەیەك تای مەترسیدار کە روونیش نیە ئاخۆ لێگرەوەیە یان نا، لە گەڕەکی ئۆراندا بەدی کراوە، ئەو چەند نموونە پەتایە ناونیشانێکی تایبەتییان نەبووە کە جێگەی مەترسی بێ و گومان لەوەدا نیە خەڵك دانبەخۆداگر و لەسەرخۆ دەبن. لەگەڵ ئەوەشدا، پارێزگار بە گیانێکی خۆپارێزانەوە کە هەموان لێی تێدەگەن، چەند ڕێوشوێنێکی بۆ پێشگرتن رەچاو کردووە. تێگەیشتن و جێبەجێکردنی ئەو ڕێوشوێنانە بە گوێرەی پێویست تەواوی هەڕەشەکانی لێگرتنەوە و پەرەئەستاندنی پەتاکە لە ناو دەبا. هەر بۆیەش پارێزگار تەواو دڵنیایە لەوەی خەڵکی شار لە ناخی دڵیانەوە ئەوپەڕی هاوکاریی هەوڵ و ماندووبوونە تایبەتییەکانی ئەو دەکەن.

دواتر ئەو رێوشوێنانەی رەچاو کرابوون لە ئاگادارییەکەدا ریز کرابوون. بۆ نموونە، نەهێشتنی مشکەکان بە شێوەیەکی زانستیانە واتە لە رێگەی پڕکردنی ئاوەڕۆ بۆگەنەکان لە گازی ژەهراوی و وردبینیی پێویست لە پاکژکردنەوە و پالاوتنی ئاوی خواردنەوەدا. هەروەها خەڵکی شار ئامۆژگاری کرابوون کە لەرادەبەدەر پاکوخاوێن بن و ئەوانەی کێچیان هەیە بچنە دەرمانگەکانی شارەوانی. لە لایەکی دیکەوە بنەماڵەکان ئەو جۆرە نەخۆشیانەی پزیشکەکان دەسنیشانیان دەکەن، ئاشکرای بکەن و رازی بن بەوەی کە نەخۆشەکانیان لە هۆڵی تایبەتی نەخۆشخانەکاندا، بە جویێ لەوانی دیکە بحەوێندرێن. جگە لەوەش ئەو هۆڵانە بۆ ئەوە ئامادە کراون نەخۆشەکان خێرا و بە زیاترین پێداویستییەوە چارەسەر بکرێن. چەند بڕگەیەکی زیادی پێشنیاری دەکرد، ژووری نەخۆش و ئامرازی راگواستنی تایبەتی نەخۆش پاکژ بکرێنەوە و لە کۆتاییشدا بەم پێشنیارە قایل ببوون کە: خزم و کەسی نەخۆشەکە لە ژێر چاوەدێریی تەندروستیدا بن.

دوکتۆر ریڤۆ بە خێرایی رووی لە ئاگادارییەکە وەرگێڕا و بەرەو شوێنی کارەکەی(عەیادە) وەڕێ کەوت. ژۆزێف گرانت کە چاوەڕوانی دوکتۆر بوو، دیسانیش بە دیتنی ئەو باسکی هەڵێنا. دوکتۆر گوتی:

ـ بەڵێ، (ئاماری مردوان) هەر هەڵدەکشێ.

دوێنێ دە کەس لە شاردا مردبوون. دوکتۆر بە گرانتی گوت: لەوانەیە شەوێ چاوی پێی بکەوێ، چونکە دەچێتە سەردانی کۆتار. گرانت گوتی:

ـ هەقتە دوکتۆر، بۆ وی باش دەبێ. چونکە دەیبینم گۆڕاوە.

ـ چۆن؟

ـ ماقووڵ بووە.

ـ بۆ لەوەپێش وا نەبوو؟

گرانت دڕدۆنگ بوو. نەیدەتوانی بڵێ کۆتار بێ ئەدەب بووە. لەوانەبوو ئەو قسەیە جوان نەبێ. کۆتار کابرایەك بوو کەمدوو و سەری لە قەپیلکی خۆیدا بوو، کە بڕێکیش لە بەراز دەچوو. ژوورەکەی، رستورانتێکی بچووك و، وەدەرکەوتنی گوماناوی، ئەوە تەواوی ژیانی کۆتار

بوو. بە فەرمی شەراب و لیکۆری دەفرۆشت. دووراودوور دووسێ کەس سەردانیان دەکرد، گۆیا کڕیاری بوون. جاروبارە دەچووە ئەو سینەمایەی بەرەوڕووی ژوورەکەی بوو. فەرمانبەرەکەی شارەوانی تەنانەت ئاگای لەوەش ببوو وا کۆتار حەزی لە فیلمە گانگستەرییەکانە. بەهەمووی ئەوانەشەوە فرۆشیاری شەراب و لیکۆر تەنیا و بێ متمانە بوو.

لەبەر چاوی گرانت تەواوی ئەو شتانە گۆڕابوون. دەیگوت:

ـ نازانم چ بڵێم، بەڵام دەزانی؟ هەست دەکەم ئەو دەیەوێ لەگەڵ خەڵك ئاشت بێتەوە و هەموان بخاتە گەڵ خۆی. زۆربەی جار لەگەڵ من قسان دەکا. پێشنیارم پێ دەکا لەگەڵی بچمە پیاسەکردن و ئەمن ناتوانم بە قسەی نەکەم، بە تایبەتی گرینگیی پێ دەدەم، چونکە هیچ نەبێ گیانیم رزگار کردووە.

کۆتار لەوەتەی هەوڵی دابوو خۆی بکوژێ، ئیتر کەس دەرگای لێ نەکردبۆوە. لە دووکان و کۆڵاناندا بە شوێن بەزەیی و خۆشەویستیدا دەگەڕا. هەتا ئێستا هیچ کەس بە لەبزێکی ئاوا شیرن لەگەڵ دووکاندارەکە نەدوابوو و ئاوا بەسەرنجەوە گوێی لە قسەی ژنە جگەرەفرۆشەکە رانەگرتبوو. گرانت گوتی:

ـ ئەو ژنە جگەرەفرۆشە ئەفعییەکی راستەقینەیە. ئەمن رای خۆم بە کۆتار گوت، بەڵام ئەو لە وەڵامدا پێی گوتم، خراپی تێگەیوم و ئەو ژنە لایەنی باشیشی هەن کە پێویستە مرۆڤ بیانبینێ.

بە کورتی کۆتار دوو یان سێ جار گرانتی بردبووە کافتریا و ریستورانتە تایبەتییەکانی دەرەوەی شار. لە راستیدا خۆی فێری ئەو شوێنانە ببوو. دەیگوت:

ـ بینادەم لەم جۆرە شوێنانە خۆش رایدەبوێرێ. بە تایبەتی کەسانی باش لە دەوروبەرمانن.

گرانت تێگەیبوو خزمەتکارەکانی ئەو ریستورانتانە گرینگییەکی تایبەتی بە کۆتار دەدەن و کاتێك ئەو پارەیەی بینی کە ئەو وەکو دەستخۆشانە دەیانداتێ، تێگەیشت بۆچی ئەوەندەی بەدەوردا دێن. کە خەڵکیش روویان دەدایێ، زۆری کار تێدەکرد. رۆژێکیان کە خاوەنی ریستورانتەکە هاتە شوێنی و یارمەتیی دا بۆ ئەوەی پالتۆیەکەی لەبەر بکا، کۆتار گوتی:

ـ کوڕێکی باشە. دەتوانێ شایەتی بدات.

ـ شایەتی بۆچی؟

ـ کۆتار بڕێك دڕدۆنگ مایەوە و ئیتر گوتی:

ـ ئێ، شایەتی بدا کە من کابرایەکی خراپ نیمە.

جگە لەوەش کۆتار هەر تاوەی لەسەر هەوایەك بوو. ڕۆژێکیان کە دووکاندارەکە کەمتر ڕووی دابوویە، بەو پەڕی تووڕەییەوە گەڕابۆوە ماڵێ و بەردەوام دەیگوت:

ـ ئەو بێ شەرەفەش وەك ئەوانی دی وایە.

ـ ئەوانی دی کێن؟

ـ هەمووان.

گرانت لە دووکانی ژنەی جگەرەفرۆشیشدا شتێکی سەیری دیتبوو. لە جەنگەی قسەوباسێکی گەرمدا ژنە جگەرەفرۆشەکە ئاماژەی بە دەستبەسەرکرانێك کرد، کە لەم دواییانەدا لە ئەلجەزیرە هەڵڵایەکی لێ کەوتبۆوە. باسی فەرمانبەرێکی گەنجی بازاڕی بوو کە لە سەر لێواری دەریا عەرەبێکی کوشتبوو. ژنە جگەرەفرۆشەکە گوتی:

ـ ئەگەر تەواوی ئەو لاتوپووتانەیان گرتبایە، خەڵکە باشەکە دەحەسانەوە.

بەڵام کە دیتی کۆتار کتوپڕ تێك چوو، قسەکەی خۆی خورادەوە، چونکە ئەو بەبێ ئەوەی قسەیەك بکا و داوای لێبوردنێك بکات، لە نەکاو لە دووکانەکە دەرپەڕییە دەرێ. گرانت و ژنە جگەرەفرۆشەکە واقیان وڕما.

دواتر گرانت باسی هێندێ گۆڕانی لەنەکاوی دەروونیی دیکەی کۆتاری بۆ ریڤۆ کردبوو.

کۆتار هەمیشە بیر و ڕای زۆر ئازادیخوازانەی هەبووە. ئەوەش لەوەڕا دەردەکەوت کە زۆر حەزی لەم ڕستەیە بوو کە دەیگوت:" گەورەکان هەمیشە گچکەکان دەخۆن"، بەڵام ماوەیەك بوو تەنیا ڕۆژنامەی کۆنەپارێزەکانی ئۆرانی دەخوێندنەوە. پیاو ناتوانێ نکوڵی لەوە بکا کە ئەو بە تایبەتی لە شوێنە گشتییەکان بە بڕێك خۆڕانانەوە دەیخوێندنەوە. هەر وەها چەند ڕۆژێك پاش چاکبوونەوی تکای لە گرانت کردبوو، کە دەچووە ئیدارەی پۆستە و گەیاندن، سەت فرانکێکی کە هەموو مانگان بۆ خوشکە دوورە وڵاتەکەی دەنارد بۆی بداتە پۆست، بەڵام لەو کاتەیدا گرانت ویستبووی وەڕێ بکەوێ، کۆتار گوتبووی:

ـ دووسەت فرانکی بۆ بنێرە. لە رادەبەدەر دڵی پێی خۆش دەبێ. پێی وایە من قەت ئەوم لە بیر نیە، بەڵام درۆ نەبێ، زۆرم خۆش دەوێ.

بە کورتی لەگەڵ گرانت کەوتبووە چەلەحانیەکی خۆش. ئەو کارە بچووکەی گرانت هەموو شەوێ خۆی پێوە دەخافلاند، تەواو سەرنجی ئەوی بۆ لای خۆی راکێشابوو و، گرانت ناچار ببوو وەڵامی پرسیارەکانی ئەو لەم بارەیەوە بداتەوە. کۆتار گوتبووی:

ـ دەی! تۆ خەریکی نووسینی کتێبی؟

ـ لەسەر ئیزنت!، بەڵام کارێکم بەدەستەوەیە کە زۆر لەوە پێچەڵاوپێچترە.

کۆتار گوڕاندبووی:

ـ ئاخ! حەزم لێبوو ئەمنیش وەك تۆ ئەوە بکەم.

گرانت سەری سووڕمابوو و، کۆتار بە پرتەپرت گوتبووی هونەرمەندبوون لەوانەیە زۆر کاران راست بێنێ. گرانت پرسیبووی:

ـ بۆ؟

ـ دیارە! هەموان دەزانن هونەرمەند لە هەموو کەس زیاتر حەقی بەدەستە. زیاتر لەو خۆش دەبن.

بەیانیی ئەو رۆژەی ئاگادارییەکان بڵاو بوونەوە، ریڤۆ بە گرانتی گوت:

ـ دەی! رووداوی مشکەکان ئەویشی وەك خەڵکێکی زۆر، شێت کردووە. یا ئەوەی کە لە تا دەترسێ.

گرانت گوتی:

پێم وانیە دوکتۆر. ئەگەر لەمنیش دەپرسی...

ترۆمبیلی قەڵاچۆی مشکان بە خێراییەکی زۆر بەبن پەنجەرەکەیاندا تێپەڕی. ریڤۆ راوەستا هەتا دەنگی ببیسرێ، دوایی بە بیرێکی ئاڵۆزەوە رای فەرمانبەرەکەی شارەوانیی پرسی. گرانت بە قەڵافەتێکی شێلگیرانەوە لێی روانی و وەڵامی دایەوە:

ـ ئەو کابرایەکە، دەزانێ بۆچی خۆی لۆمە دەکات.

دوکتۆر شانی هەڵتەکاند . هەروەك کۆمیسێر دەیگوت کاری گرینگتر لە گۆڕێ بوو.

دوانیوەڕۆ ریڤۆ چاوی بە کاستێل کەوت. سیرۆمەکان نەگەیشتبوون. ریڤۆ پرسیی:

ـ کوا تازە سوودیان دەبێ؟ ئەم باسیلە* سەیرە.

کاستێل وتی:

ـ وەڵا لەوەدا لەگەڵت نیم. ئەم گیانلەبەرانە هەمیشە رواڵەتێکی نوێ بە خۆوە دەگرن، بەڵام لە راستیدا هەموان هەر لەیەك قوماشن.

ـ لانیکەم تۆ پێت وایە، بەڵام بە کردەوە هیچ شتێکیان لەسەر نازانین.

ـ دیارە پێم وایە، بەڵام هەموان وەکوو من وان.

ئەو رۆژە دوکتۆر تا ئێوارێ هەستی دەکرد ئەو سەرەگێژەیەی هەموو جارێ لە سۆنگەی بیرکردنەوە لە تاعووندا تووشی دەبێ، جار بە جار لێی توند دەکا. لە کۆتاییدا بۆی دەرکەوت کە دەترسێ. دوو جار چووە نێو کافتریا قەرەباڵغەکانەوە. ئەویش وەکوو کۆتار هەستی دەکرد پێویستی بە گەرموگوڕیی مرۆڤەکانە. ریڤۆ ئەم حاڵەتەی بە شتێکی بێ واتا زانی، بەڵام هەر ئەم هەستە وەبیری هێنایەوە بەڵێنی بە کۆتار داوە سەردانی بکات.

دەمەدەمی رۆژاوا، دوکتۆر لە سەر مێزی نانخواردن چاوی بە کۆتار کەوت. دوکتۆر کە وەژوور کەوت، رۆمانێکی پۆلیسی لەسەر مێزەکە لێك کرابۆوە، بەڵام هەوا تاریك داهاتبوو و لەم تاریکییەدا کە تا دەهات تۆختریش دەبۆوە خوێندنەوەکەی ئەستەمتر دەبوو. دەتگوت کۆتار لە ساتێك لەمەوبەرەوە دانیشتووە و لە بوومەلێڵەکەدا خەیاڵ بردبوویەوە. ریڤۆ گوتی چۆنی؟ کۆتار هەر بە دانیشتنەوەوە لە بن لێوانەوە گوتی باشم و ئەگەر دڵنیابم هیچ کەس کاری بەسەرمەوە نیە باشتریش دەبم. ریڤۆ گوتی، ئاخر ناکرێ مرۆڤ هەمیشە تەنیا بێ.

ـ ئەه، مەبەستم ئەوە نیە. ئەمن باسی ئەوانە دەکەم وا پیاو تووشی چەرمەسەری دەکەن.

ریڤۆ بێدەنگ بوو.

ـ سەیرکە ئەمن باسی خۆم دەکەم، بەڵام خەریك بووم ئەم رۆمانەم دەخوێندەوە. چیرۆکی مرۆڤێکی چارەڕەشە کە رۆژێك بەیانی لەپڕ قۆڵبەستی دەکەن. کەس کاری پێی نەبوو و خۆشی ئاگای لە مەحموودی بێ زەواد نەبوو. لە نووسینگە و ئیداران باسیان دەکرد و ناویان لەسەر

---

* باکتریایەکی درێژووکەیە.

پسووله‌کان ده‌نووسی. باشه پێت وایه ئه‌وه دروسته؟ به رای تۆ خه‌ڵك حه‌قی ئه‌وه‌یان هه‌یه ئاوا له‌گه‌ڵ یه‌کێك بجووڵێنه‌وه؟

ریڤۆ گوتی:

ـ جیاوازیی هه‌یه. له لایه‌که‌وه به راستی مافی ئه‌وه‌یان نیه، به‌ڵام ئه‌و شتانه ئه‌وه‌نده‌ش گرینگ نین. نابێ بۆ ماوه‌یه‌کی دوورودرێژ له نێو چواردیوارییه‌کدا بمێنیته‌وه. تۆ ده‌بێ بچیته ده‌ره‌وه.

کۆتار دیار بوو خه‌ریکه تووڕه ده‌بێ و، گوتی خۆ هه‌ر واده‌کات و ئه‌گه‌ر پێویست بێ ته‌واوی خه‌ڵکی گه‌ڕه‌ك ده‌توانن شایه‌تیی بۆ بده‌ن. ته‌نانه‌ت له‌ده‌ره‌وه‌ی گه‌ڕه‌کیش کۆمه‌ڵه په‌یوه‌ندییه‌کی هه‌یه:

ـ مسیۆ ریگۆی بیناساز ده‌ناسی؟ براده‌رێکی خۆمه.

تاریکیی نێو ژووره‌که خه‌ستتر ده‌بۆوه. گه‌ڕه‌کی قه‌راغی شار گیانی وه‌به‌ر ده‌هاته‌وه و که چراکان داگیرسان ده‌نگێکی لێڵ و قایل له ده‌ره‌وه هه‌ستا. ریڤۆ چووه سه‌ر بانیژه‌که و کۆتار وه‌دوای که‌وت. له هه‌موو گه‌ڕه‌که‌کانی ده‌وروو‌به‌ره‌وه هه‌روه‌کوو هه‌موو شه‌وه‌کانی شاره‌که‌ی ئێمه شنه‌یه‌کی نه‌رم، ورته‌ورت و بۆنی گۆشتی برژاوی له‌گه‌ڵ خۆی دێنا و قریوه‌ی شادی و عه‌تراویی ئازادییش، که ورده‌ورده به‌رز ده‌بۆوه و کۆڵانی له ده‌نگی لاوه‌تی لیوڕێژ ده‌کرد. شه‌و و هۆڕنی به‌رزی شه‌مه‌نده‌فه‌ره نادیاره‌کان و ئه‌و ده‌نگه‌ده‌نگه‌ی که له ده‌ریا و له‌و خه‌ڵکه‌وه هه‌ڵده‌ستا وا له هاتوچۆدا بوون و ئه‌وه‌ش ئه‌و ده‌موساته‌ی که ریڤۆ باش ده‌یزانی و جاری جاران حه‌زی لێی بوو، ئه‌مڕۆ به هۆی ئه‌و شتانه‌وه‌ی ده‌یزانین، لێی ببوونه ئێش و ژان.

به کۆتاری گوت:

ـ ده‌توانین چراکان داگیرسێنین؟

هه‌ر چراش هه‌ڵ ده‌بوو، کابرا وردیله به‌ده‌م چاوترووکاندنه‌وه ده‌یگوت:

ـ ده بڵێ با بزانم دوکتۆر: ئه‌گه‌ر ئه‌من نه‌خۆش بکه‌وم ده‌مبه‌یه ئه‌و خه‌سته‌خانه‌یه‌ی خۆت له‌وێی؟

ـ ئه‌ی چۆن ناتبه‌م؟

کۆتار پرسیی: ئاخۆ دەکرێ کەسێك دەستبەسەر بکەن کە لە نەخۆشخانەیەك کەوتووە؟ ریڤۆ گوتی لەوەپێش شتی وا کراوە، بەڵام پێوەندیی بە دۆخی نەخۆشەکەوە هەیە. کۆتار گوتی:

ـ من متمانەم بە تۆیە.

ئەمجار داوای لە دوکتۆر کرد ئەگەر حەز دەکا، بە ترۆمبیلەکەی خۆی دەیباتە شار.

لە نێوەڕاستی شارەکە، کۆڵانەکان چۆڵتر و چراکان کەمتر بوون. منداڵان هێشتا لەبەر دەرگاکان خەریکی یاری بوون. لەسەر داوای کۆتار دوکتۆر لەبەردەم پۆلێك لەو منداڵانە ماشێنەکەی راگرت. منداڵەکان بە دەنگی بەرز شەخشانیان دەکرد، بەڵام یەکێکیان کە سەروقژی رەش و خاو و دەموچاوێکی چڵکنی بوو، چاوە گەش و خەفەتهێنەرەکانی خۆی بڕیبووە چاوی ریڤۆ. دوکتۆر چاوی خۆی لێ وەرگێڕا. کۆتار لە شۆستەکە راوەستابوو و دەستی ئەوی دەگوشین. بە دەنگێکی نووساو و بە زەحمەت قسەی دەکرد. دوو سێ جاران ئاوڕی لە دواوەی داوە و گوتی:

ـ خەڵك باسی پەتا دەکەن. ئەوە راستە دوکتۆر؟

ریڤۆ گوتی:

ـ خەڵك بەردەوام قسە دەکەن، ئەوەش ئاساییە.

ـ راست دەکەی. ئەوجار وەك بڵێی دە کەس بمرن دنیا خرا دەبێ، بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە پێویستە ئەوە نیە.

مەکینەی ترۆمبیلەکە داگیرسابۆوە. دەستی ریڤۆ لەسەر گێڕەکەی بوو، بەڵام دیسانیش سەیری منداڵەکەی دەکردەوە کە هێشتا هەر وا شێلگیر و ئاسوودە چاوی لەسەر هەڵنەگرتبوو. لەنەکاو منداڵەکە بەبێ ئەوەی روخساری تێك بچێت، جۆرێك پێی پێکەنی کە تەواوی ددانە سپییەکانی دەرکەوتن. دوکتۆر لە حاڵێکدا کە بۆ منداڵەکە پێدەکەنی، پرسیی:

ـ ئەدی چ شتێك بۆ ئێمە پێویستە؟

کۆتار لەنەکاو توند دەرگای ترۆمبیلەکەی گرت و بەر لەوەی را بکا، بە دەنگێکی پڕ لە گریان و تووڕەییەوە گوتی:

ـ بوومەلەرزە، بوومەلەرزەیەکی راستەقینە.

بوومەلەرزەیەك رووی نەدا و تەنیا ریڤۆ سبەینێی هەتا ئێوارێ بۆ ئەوە تەرخان کرد، کە بە چوار دەوری شاردا بگەڕێ و لەگەڵ بنەماڵەی نەخۆشەکان قسە بکا و نەخۆشەکانیش بدوێنێ. ریڤۆ هیچ کات کارەکەی خۆی هێندە بە قورسی نەدیبوو. بەر لەوە نەخۆشەکان ئەرکەکانی ئەویان ئاسانتر دەکردەوە و خۆیان دەنایە بەردەستی. بۆ یەکەمین جار دوکتۆر هەستی کرد نەخۆشەکان چوونەتە نێوخۆیانەوە و بە جۆرە سەرسووڕماونێکی سامناکەوە خزیونەتە ناخی نەخۆشییەکەیانەوە. ئەوە ململانێیەك بوو کە دوکتۆر هێشتا لەگەڵ رانەهاتبوو و، دەورووبەری سەعات دەی شەوێ، کە لەبەر دەرگای ئەو پیرەمێردەی نەخۆشیی هەسپەك*ی بوو و هەمیشە پاش هەموان سەردانی دەکرد، ماشێنەکەی راگرت، نەیدەتوانی لە جێگەکەی خۆی ببزوێ.

زۆری پێ چووبوو و لەو کۆڵانە تاریکە و لە ئەستێرەکانی ئاسمانی دەڕوانی کە بەردەوام دەردەکەوتن و ون دەبوونەوە. نەخۆشە پیرەکە لە نوێنەکەیدا دانیشتبوو. وێدەچوو باشتر هەناسە بکێشێ و ئەو نۆکە درشتانەی دەژماردن کە لە قابڵەمەیەکەوە دەیکردنە نێو قابڵەمەیەکی دیکەوە. بە روویەکی گەشەوە دوکتۆری وەرگرت:

- دەی دوکتۆر، پەتای "وەبا"یە**؟

- ئەوەت لە کوێ بیستوە؟

- لە رۆژنامەدا... رادوێش باسی کرد.

- نەخێر وەبا نیە.

پیرەمێرد کە وەك شیر هەڵچووبوو، گوتی:

- بەهەر حاڵ دەڵێی سەرگەورەکان زۆریان شوو لێ کێشاوە؟

دوکتۆر گوتی:

- باوەڕ بەو شتانە مەکەن.

---

* هەسپەك: نەخۆشیی تەنگەنەفەسی، پشووسواری

** وەبا: کۆلێرا

پیرەمێردەی پشکنی، ئیتر لە نێوەڕاستی ئەم ژووری نانخواردنە هەژارانەیە، دانیشتبوو. بەڵێ دەترسا. دەیزانی سبەینێ بەیانی هەر لە گەڕەکی قەراغ شار، دە دوازدە نەخۆش بەدەم گوشینی کوانەکانیانەوە چاوەڕێی دەبن. تەنیا قەڵاشتنەوەی کوانەکانی دوو یان سێ نەخۆش، ئاکامی باشی لێکەوتبۆوە. کەچی زۆربەیان دەبایە بچنە نەخۆشخانە و دوکتۆر دەیزانی نەخۆشخانە چ واتایەکی بۆ هەژاران هەیە. ژنی یەکێك لە نەخۆشەکانی، پێی گوتبوو:

"من نامەوێ ئەو ببێتە کەرەستەی تاقیکردنەوەی ئەوان، نەدەبوو بە کەرەسەی تاقیکردنەوەیان، بەڵام دەمرد، هەر ئەوەندە. بێگومان ئەو پێشبینیانەی کردبوویانن بەس نەبوون، بەڵام ئەو هۆڵانەی بە شێوەی تایبەتی ئامادە کرابوون، دیار بوو بە چ شێوەیەك بوون: دوو کەرت(قاوش) کە بە پەلە نەخۆشەکانی دیکەیان لێ وەدەرنابوون، بە کۆنەپەڕۆ کەلێنی پەنجەرەکیانیان ئاخنیبوون و ئیکیپێکی تەندرووستی دەورەیان گرتبوو. ئەگەر پەتاکە خۆی رانەوەستابایە، حکوومەت بەو مشوورەی لێی خواردبوو، نەیدەتوانی بەسەریدا زاڵ بێ.

لەگەڵ ئەوشدا ئەو شەوە میدیا فەرمییەکە هێشتا گەشبین بوو. بۆ سبەینێ رانسدۆك رایدەگەیاند بە هێمینیەوە پێشوازی لە رێگەچارەکەی شارەوانی کراوە و هەتا ئێستا نزیکەی سی نەخۆش ناسێنراون. کاستێل تەلەفۆنی بۆ ریڤۆ کردبوو:

ـ کەرتەکان چەند قەرەوێڵەیان تێدایە؟

ـ هەشتا دانە.

ـ بە دڵنیاییەوە شار زیاتر لە سی نەخۆشی تێدایە.

ـ خەڵکێك هەیە دەترسن و خەڵکێکی زیاتریش فریا نەکەوتوون خۆیان بناسێنن.

ـ چاودێری نەخراوەتە سەر ناشتنی مردووەکان؟

ـ نەخێر. ئەمن تەلەفۆنم بۆ ریشارد کرد و گوتم هەر قسە کردن بەس نیە. دەبێ رێوشوێنێکی تۆکمە رەچاو بکرێ لە بەرامبەر پەتاکەدا، یان دەبێ بە راستی شورایەك هەڵچندرێ یا هیچ کارێك نەکرێ.

ـ دەی باشە، دوایی؟

ـ گوتی دەسەڵاتی نیە. بە رای من زیانەکان زیاتر دەبن. بە راستی لە ماوەی سێ رۆژاندا هەر دوو کەرتەکە پڕ بوون. ریشارد دەیگوت گۆیا بڕیار وایە قوتابخانەیەك چۆڵ بکەن و وەك نەخۆشخانەیەکی یارمەتیدەری لێ بکەن. ریڤۆ چاوەڕوانی دەرزییەکانی دەکرد و کوانەکانی دەقەڵەشتنەوە. کاستێل چووبووە سۆراغی کتێبە کۆنەکانی و بە چەندین سەعات لە کتێبخانەدا دەمایەوە. بەو شێوەیە رای خۆی دەردەبڕی:

ـ ئەو مشکانە یا بە تاعوون یا بە شتێکی دیکەی لەو شێوەیە تۆپیون. ئەوان بە دەیان هەزار کێچیان لە پاش خۆیان لە تەواوی شوێنەکانی شاردا بە جێ هێشتووە، کە ئەگەر بە خێرایی پێشی پێ نەگیردرێ بە ئەو چڵك و چەپەڵە سەد ئەوەندە زیاد دەکەن. ریڤۆ بێ دەنگ بوو. لەو جەنگەیەدا هەوا مەیی*. خۆرەتاو دوایین دڵۆپەی نێو ئەو گۆلاوانەی هەڵدەچۆڕاند کە لە دوایین رێژنە بارانەکانەوە مابوونەوە. ئاسمانی شینی جوان بە نووری زەرد و دەنگی ماتۆری فڕۆکەکان لە گەرمای روو لە زیادبووندا و بە کورتی هەموو شتێکی وەرزەکە، مرۆڤی بۆ هێمنی و خۆشی بانگهێشت دەکرد. لەگەڵ ئەوەدا لە ماوەی چوار رۆژاندا تای چوار وەرزە قەڵەمبازێکی سەیری کرد. شازدە مردوو، بیستوچوار، بیستوهەشت و سیودوو. چوارەمین رۆژ رایانگەیاند، کە نەخۆشخانەیەکی یارمەتیدەریان لە نێو باخچەیەکی ساوایاندا کردووەتەوە. هاووڵاتییەکانی ئێمە کە هەتا ئەو کاتە هەوڵیان دەدا نیگەرانیەکانیان لە ژێر دەمامکێکی جەفەنگ و گاڵتەدا بشارنەوە، ئیتر لە کۆڵانەکاندا تێکشکاو و بێدەنگ دیار بوون.

ریڤۆ بڕیاری دا تەلەفۆن بۆ پارێزگار بکا:

ـ ئەو رێوشوێنانەی رەچاو کراون بەس نین.

پارێزگار گوتی:

ـ ئەمن ئامارەکانم لەبەر دەستن، بە راستی جێگەی نێگەرانیە.

ـ بەر لەوەی نیگەرانکەر بن، روون و راشکاون.

ـ بڕیارم داوە داوا لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتی بکەم کۆمەڵە بڕیارێك دەر بکات.

ریڤۆ لە بەرامبەر کاستێلدا تەلەفۆنەکەی داخست و گوتی:

---

* مەیی: مەیو، توندبوونەوەی شتی شلەو ئاوەکی، شیر کە دەمەیێ دەبێتە ماست. هەوا بمەیێ، یانی شنەیەك لە هیچ لاوە نایە.

ـ بڕیار! وا باشتر بوو بڕێکیان هێزی بیرکردنەوە هەبێ.

ـ ئەدی سیرۆمەکان؟

ـ لەم حەوتووەدا دەگەنێ.

پارێزگاری لە ڕێگەی ریشاردەوە داوای لە ریڤۆ کرد راپۆرتێك بە مەبەستی ناردنی بۆ ناوەندی کۆلۆنی و بۆ وەرگرتنی بڕیار ئامادە بکا. ریڤۆ لەم راپۆرتەدا رەوشی پەتاکەی شی کردەوە و ئاماری پێویستی تێدا گونجاند. هەر ئەم رۆژە رێژەی مردووان گەیشتبووە چل کەس. پارێزگار بە قسەی خۆی ئەوەی وەئەستۆ گرت کە رێوشوێنەکان توندوتۆڵتر بکات. ناساندنی نەخۆشەکان کرایە ئەرك و بە وردبینیەوە لەوانی دیکەیان جوێ کردنەوە. بڕیاردرا کە ماڵی نەخۆشەکان داخەن و پاکژیان بکەنەوە، خزموکەسی نەخۆشەکان پێ ملی پەرژینکرانی پزیشکی بن و مردووەکانیش بە پێی ئەو مەرجانەی دواتر دەیانبینین، شارەوانی دەیاننێژێ. رۆژێك دواتر بە فڕۆکە سیرۆمەکان گەیشتن. بەشی ئەوەندە نەخۆشەی دەکرد کە لە خەوێنرابوون بۆ چارەسەر، بەڵام ئەگەر پەتاکە پەرەی گرتبایە بەشی نەدەکردن. وەڵامی تەلەگرافی ریڤۆیان دایەوە کە پاشەکەوتەکەی رۆژی تەنگانە تەواو بووە و دروستکردنەوەی سیرۆم دەستی پێکردۆتەوە.

لەو جەنگەیەدا و لە هەر چوار دەوری شارەوە بەهار دەگەیشتە بازاڕەکان. بە هەزاران گوڵ بە درێژایی شۆستەکان لە قەرتاڵەی گوڵفرۆشاندا دەژاکان و عەترە نەرمەکەیان لە تەواوی شاردا شەپۆلی دەدا. بە رواڵەت هیچ شتێ نەگۆڕابوو. شەمەندەفەرەکان بەردەوام لە کاتی دیاریکراودا پڕ بوون و رۆژ هەتا ئێوارەش بەتاڵ و پیس و پۆخڵ بوون.

تارۆ لە پیرەمێردە وردیلەکەی دەڕوانی و پیرەمێردەش تفی بە پشیلەکاندا دەکردەوە. گرانت هەمو رۆژێ زوو بۆ ئیشە نهێنیەکەی دەچۆوە ماڵێ. کۆتار وێڵ دەخولایەوە و ئاغای ئۆسۆنی لێکۆڵەریش هەروا خەریکی بەڕێوەبردنی باخچەی ئاژەڵانی خۆی بوو*. پیرەمێردی پشووسوار نۆکەکانی لە قابڵەمەیەکەوە دەکردە نێو قابڵەمەیەکی دیکەوە و زۆربەی جاران رامبێری رۆژنامەوانیان بە قەڵافەتێکی هێمن و تاسەبارەوە دەبینی. شەوێ خەڵك لە کۆڵانەکاندا کۆ دەبوونەوە و لەبەردەم سینەماکاندا ریزیان دەگرت. لە لایەکی دیکەوە دەتگوت پەتاکە

* باخچەی ئاژەڵان: لێرەدا مەبەست ماڵ و منداڵەکەیەتی، کە لە پێشدا بە تووتکەسەگی شوبهاندوون.

پاشەکشەی کردووە و لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا، ڕۆژێ تەنیا دە کەس مردن. دوایی لەنەکاو زیادی کرد. ئەو ڕۆژەی دیسان ژمارەی مردووەکان گەیشتە سی کەس. بێرنارد ریڤۆ چاوی لەو تەلەگرامە فەرمییە دەکرد کە پارێزگار نیشانی دەدا. پارێزگار دەیگوت:" ئەوان ترساون" و لە تەلەگرامەکەدا نووسراوە:" ڕایگەیەنن کە تاعوونە. شار داخەن."

دەکرێ لە ئێستێ بە دواوە بڵێین تاعوون بووە بە کێشەی هەموومان. سەرەڕای ئەو پەرۆشی و سەرسووڕمانەی لەو رووداوە سەیروسەمەرانە کەوتبوونەوە، خەڵکەکەمان هەر کەسە و تا رادایەك وەشوێن سەرقاڵییەکانی رۆژانەی خۆیان دەکەوتن و دیارە ئەم وەزعە هەر دەبوو بەردەوام بێ. بەڵام هەر دەروازەکان گاڵە دران، هەمووان و گێڕەرەوەش سەیریان کرد، کە پێکەوە و لە قەفەزێکدا گیریان خواردووە و دەبێ لەگەڵی رابێن. بەم شێوەیە بۆ وێنە جوێبوونەوە لە بوونەوەرێکی خۆشەویست کە هەستێکی تەواو تاکەکەسییە، هەر لە یەکەم حەفتەکاندا بوو بە خەم و ژانی هەمووان و لەگەڵ ترسدا بوو بە بنەڕەتیترین ئازاری ئەو قۆناغە دووردرێژەی دابڕان و تاراوگەیی.

لە راستیدا  یەکێك لە ئاکامە هەرە دیارەکانی داخرانی دەروازەکان، دابڕانی لەنەکاوی کەسانێك بوو کە خۆیان بۆ ئەم بارودۆخە ئامادە نەکردبوو. دایك و باوکان، ئەو هاوسەر و دڵدارانەی چەند رۆژ لەوەپێش وایانزانیبوو هەر تەنیا چەند رۆژێك دادەبڕێن و، لە گۆڕەپانی وێستگەی شەمەندەفەرەکەی شاری ئێمە، بە چەند راسپاردەیەکەوە یەکتریان راموسیبوو، لەوە دڵنیابوون کە دوای چەند رۆژێکی دی چاویان بەیەکتر روون دەبێتەوە، لە متمانەیەکی پووچی ئینسانیدا نوقم ببوون و زۆر پەرۆشی رۆیشتنە ئاساییەکەی ئاشناکەیان نەبوون، لە نەکاو دیتیان کە بەبێ یارمەتی و چارەسەرییەك لێك دوور کەوتنەوە و رێگەی پێك گەیشتنەوە و تەنانەت نامەگۆڕینەوەشیان نیە. چونکە چەند سەعاتێك بەر لەوەی بڕیاری پارێزگاری چاپ و بڵاو بکرێتەوە، دەروازەکان داخرابوون، هەربۆیەش حاڵەتی ریزپەڕ و تایبەتیان بۆ کەس رەچاو نەدەکرد. دەکرێ بڵێین یەکەمین ئاسەواری هێرشی بەزەبری پەتاکە ئەوە بوو، کە خەڵکەکەی ئێمە وا هەڵسوکەوت بکەن، وەك بڵێی هەستی تایبەتی(تاکەکەسی)ـیان نییە. لە یەکەمین ساتەکانی رۆژدا کە بڕیارەکە بەڕێوە برا، داواکاران بەردەگایان بە پارێزگاری گرت و بە تەلەفۆن یا بە چوونەلای فەرمانبەران باسی کۆمەڵێك بارودۆخی ئەوتۆیان دەکرد کە هەر هەموو شیاوی ئەوە بوون بایەخیان پێ بدرێ و هیچیشیان چارەسەریان نەبوو. لە راستیدا  چەند رۆژێکی خایاند بۆوەی تێبگەین کە ئێمە لە رەوشێکی بێ چارەسەردایین و وشەگەلی سازش و لێبوردەیی و ریزپەڕی، ئیتر بێ مانان.

تەنانەت لە نامەنووسینیش، کە تۆزە سوکناییەك بوو، بێبەریی کراین. چونکە لە لایەکەوە شار ئیتر بە کەرەسەی پێوەندیگرتنی ئاساییەوە پێوەندیی بە بەشەکانی دیکەی وڵاتەوە نەمابوو، لە لایەکی دیکەشەوە بڕیارێکی نوێ هەرچەشنە نامەگۆڕینەوەیەکی قەدەغە کرد، چونکە لەوانەبوو نامەکە میکرۆبی پێوە بێ. سەرەتا چەند کەسێك کە کۆمەڵێك پوانیان هەبوو، توانییان لە بەردەم دەروازەکانی شاردا لەگەڵ دەرکەوانەکان رێك کەون بۆ ئەوەی پەیامەکانیان بۆ بەرێی دەرەوە بکەن، بەڵام ئەوە تەنیا لە رۆژەکانی یەکەمی بڵاوبوونەوەی پەتاکە و لەو کاتەدا بوو کە دەرکەوانەکان بە لایانەوە سرووشتی بوو گوێ بدەنە هەستی هاوخەمی، بەڵام دوای ماوەیەك کە دەرکەوانەکان زانییان وەزعەکە ئاڵۆز و شپرزە، ئیتر ئامادە نەبوون بەرپرسیارەتییەکی وا بگرنە ئەستۆ کە نەیاندەزانی چی لێ شین دەبێتەوە. پێوەندیی تەلەفۆنی لە نێوان شارەکاندا کە سەرەتا ئیزن پێدراو بوو، ئاڵۆزییەکی وای لە تەلەفۆنخانە گشتییەکان و لە هێڵی تەلەفۆندا پێك هێنا، کە بۆ ماوەی چەند رۆژان دایانخستن و دوایی تەنیا تەرخانیان کردن بۆ رووداوی تایبەتیی وەکوو مەرگ، یا لەدایکبوون و زەماوەند. ئەو بوونەوەرانەی کە لە رێگەی چاو و دڵەوە پێوەندییان پێکەوە هەبوو، ناچار بوون بە وشەی گەورەگەورە لە تەلەگرامێکی دە وشەییدا بە دوای ئەو هۆگری و خۆشەویستییە کۆنەدا بگەڕێن و جا چونکە ئەو فۆرمۆلانەی لە تەلەگرافێکدا بەکار دەبرێن خێرا تەواو دەبن، ژیانی هاوبەشی دوورودرێژ یا کەفوکوڵ و خۆشەویستیی بەژان لە گۆڕینەوەی بەردەوامی رستەگەلێکی لەو چەشنەدا کورت بوونەوە:"باشم، لە دڵم دای، خۆشم دەوێی."

لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکێکی زۆر لە نێو ئێمەدا لەسەر نووسینی نامە پێداگر بوون و بەردەوام پەنایان بۆ شتی وا دەبرد کە هیچ ئاکامێکی نەبوو. تەنانەت ئەگەر بەو رێگەیانەدا کە ئێمە بیریشمان لێ کردبوونەوە گەیشتبانە جێی مەبەست، ئێمە هەر نەماندەزانی، چونکە هیچ وەڵامێکمان بۆ نەدەهاتەوە. کار گەیشتە ئەو جێگەیەی چەند حەوتوو لەسەر یەك سەر لەنوێ نامەکانی پێشوومان دەنووسینەوە. ئەوەی لەمەوبەر وتبوومانن و ویستبوومانن، سەر لەنوێ نووسیماننەوە بە شێوەیەك کە دوای ماوەیەك ئەو وشانەی یەکەمین جار بە ئازارێکی بەژانەوە لە ناخی دڵمانەوە سەرچاوەیان گرتبوو، ئیتر ماناکەیان نەما. ئەوجار وشەکانمان هەروا دەنووسینەوە و هەوڵمان دەدا لە رێگەی ئەو رستە مردووانەوە ژیانی دژوارمان وێنا بکەین و

ئاخری هەر پەیامە دووپاتە تەلەگرافییەکەمان پێ باشتر بوو، لەو قسە شێلگیرانە و بێگیان و یەکلانانە و لە قسەکردن بۆ دیوارێك.

پاش چەند رۆژان کە مسۆگەر بوو هیچ کەس ناتوانێ لە شارەکەی ئێمە وەدەرکەوێ، کەوتنە بیری ئەوەی ئیزن وەرگرن بۆ گەڕاندنەوەی ئەوانەی پێشتر چووبوونە دەرەوە. پاش چەند رۆژ تاوتوێ و لێکدانەوە، ئاخری پارێزگاری گوتی باشە، بەڵام شێلگیرانە گوتی، ئەوانەی دێنەوە، بە هیچ شێوەیەك ناتوانن جارێکی دیکە لە شاری وەدەر کەونەوە. واتە هاتنەژوورەوە ئازادە، بەڵام چوونەدەرەوە ئازاد نیە. چەند بنەماڵەیەکی دەگمەن کە هێشتا شتەکەیان بەهەند نەگرتبوو، دیتنی خزمانیان لە خۆپاراستن پێ باشتر بوو و، داوایان لێکردن ئەم هەلە بقۆزنەوە، بەڵام ئەم بەندییانەی تاعوون خێرا لەو مەترسییە تێگەیشتن کە خزمەکانیان تووش دەکرد و ملکەچی ئازاری دابڕانەکە بوون. ئەوەندەی پەتاکە هەبوو، تەنیا جارێك بەدی کرا هەستی مرۆیی بە سەر ترسی مەرگێکی بەژاندا زاڵ بێ، ئەوەش بە پێچەوانەی چاوەڕوانیەکان، پێوەندیی بە دوو گراوەوە نەبوو کە عیشق و خۆشەویستییەکەیان تەواوی ئازارەکان ببەزێنێ و بیانخاتە ئامێزی یەکترەوە، بەڵکوو ئەم دوو کەسە دۆکتۆر کاستێل و ژنە پیرەکەی بوون کە لەمێژساڵ بوو پێکەوە دەژیان. مادام کاستێل چەند رۆژ بەر لە پەتاکە چووبووە یەکێك لە شارەکانی دراوسێ. لەگەڵ ئەوەشدا بنەماڵەکەی ئەوان نموونەیەکی بەختەوەری نەبوو بۆ هەمووان و، تەنانەت گێڕەرەوە پێی وایە سەرەڕای هەموو شیمانەکان ئەو ژن و مێردە هەتا ئەو رۆژە هیچ دڵنیا نەبوون لەوەی ژیانێکی بێ کێشەیان هەیە، بەڵام ئەو لێکدابڕانە لەنەکاو و درێژماوەیە لێی روون کردنەوە، کە بەبێ یەکتر هەڵناکەن و دوای ئەوەی لە نەکاوەیان ئەو راستییەیان بۆ دەرکەوت، ئیتر بەلایانەوە تاعوون گرینگییەکەی نەما.

دیارە ئەوە ناوازە بوو. زۆربەی جاران، بە دڵنیاییەوە ئەم لێکدابڕانە تەنیا بەمەرجێك کۆتایی دەهات کە پەتاکە نەمابا. بۆ ئێمەش بە گشتی ئەو هەست و کوڵەی لە تەواوی ژیاندا لەگەڵمان بوو و پێمان وا بوو بە باشی ناسیومانە (پێشتر باسی ئەوە کرا کە خەڵکی ئۆران حەزەکانیان سادەن) روخسارێکی نوێی بەخۆوە دەگرت. ئەو مێرد و گراویانەی گەورەترین متمانەیان بە هاوسەر و گراویی خۆیان هەبوو، دڵیان غیرەی دەکرد. ئەو پیاوانەی لە خۆشەویستیدا سووك و هەرزە بوون، لە نەکاو وەفادار دەبوون و ئەو کوڕانەی لە تەنیشت

دایکیانەوە هیچ چاویان لە روخساری دایکیان نەدەکرد، بە وەبیرهێنانەوەی یەکێك لە لۆچەکانی روومەتی ئەو، داخ و کەسەرێکی وا رووی تێ دەکردن، کە بیرەوەرییەکەی هەموو گیانی دادەگرتن. ئەو لێکدابرانە لەنەکاو و چارەهەڵنەگرەی کەس نەیدەزانی چیی لێ دێتەوە، ئێمەی لە هەمبەر بیرەوەریی بوونەوەرێکدا کە هێشتا ئەو هەمووەمان لێ نزیك بوو و لە نەکاو ئەوەندە دوور کەوتبۆوە، وای دەستەوستان کردبووین کە ئەو بیرەوەرییە تەواوی رۆژەکانی ئێمەی داگرتبوو. لە راستیدا ئێمە دووجار ئازارمان دەکێشا. یەکێکیان ئازاری خۆمان و ئەویتر ئازاری بیرکردنەوە لە کوڕگەل و هاوسەر و عاشقە و ماشقە لێکدابڕاوەکان.

ئەگەر لە هەلومەرجێکی دیکەدا بوایە، خەڵکەکەی ئێمە دەیانتوانی بە خۆسەرقاڵکردن بە ژیانێکی چالاکترەوە، پەنا و دالّدەیەك بۆ خۆیان بدۆزنەوە، بەڵام تاعوون ئەوانی بێکار خستبۆوە و ناچاری کردبوون لە شارە تاریکەکەیاندا بە دەوری خۆیاندا بخولێنەوە و رۆژبەرۆژ زیاتر خۆیان بدەنە دەست گەمەی هەڵخەڵەتێنەری بیرەوەرییەکانەوە، چون لە شارێکی وەها بچووکدا ئەوان هەموو رۆژێ سەرلێشێواو و بێ مەبەست رێگەیان دەکەوتەوە ئەو رێگە و کۆڵانانەی پێشتر لەگەڵ ئازیزە دابڕاوەکەیان پێیدا رۆیبوون.

بەو جۆرە یەکەمین شتێك کە تاعوون بە دیاری بۆ هاووڵاتیانی ئێمەی هێنا، غوربەت بوو و، گێڕەرەوەش پێی وایە دەتوانێ ئەو شتەی خۆی هەستی پێکردووە، بە ناوی هەمووانەوە لێرەدا بینووسێتەوە، چونکە لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی شارەکەی ئێمەدا هەستی پێ کردووە. ئەو بۆشاییەی بەردەوام لە خۆماندا هەستمان پێ دەکرد، هەر ئەم هەستی غوربەتە بوو. ئەو هەژانە دیارەی بریتی بوو لە حەزی ناماقووڵی گەڕانەوە بۆ دواوە، یا بە پێچەوانەوە خێراترکردنی رەوتی کات (بەرەو پێشەوە)، ئەو تیرە ئاگرینانەی یادەوەری. ئەگەر جاروبارە خۆمان دەدایە دەست خەیاڵاتەوە و ئەگەر لەم ساتانەدا لەبیرمان دەچۆوە کە شەمەندەفەرەکان لە جووڵە کەوتوون و ئەگەر لەو ساتەدا کە رێبواری تازەگەیشتووی شەمەندەفەرە تێپەڕیوەکە توانیبای بێتە گەڕەکەکەی ئێمە و لە ماڵێ نەچووبایینە دەرێ، پێمان خۆش بوو دەنگی زەنگی دەرگا بەرز ببێتەوە، یا ئەوەی دەنگی پێی ئاشنایەکمان لەسەر پلیکانەکانەوە گوێ لێ بێت، بەڵام ئاساییە ئەم گەمە و یارییانە زۆری نەدەخایاند. بەردەوام ئەو ساتەوەختە دەهات وا ئێمە

بەچاوی خۆمان دەمانبینی کە ئیتر شەمەندەفەرەکان ناگەنێ. جا تێدەگەیشتین کە لێکدابڕانەکەی ئێمە زۆری بە بەرەوە دەبێت و ئیتر ناچار دەبووین خۆ بدەینە دەست کات و زەمەنەوە. لەمەودوا بە گشتی قبوولّمان کردبوو کە زیندانیین و هەمووومان لە رابردووی خۆماندا دەژیاین و ئەگەر لە نێو ئێمەدا کەسێك بە دڵیدا هاتبایە کە لە داهاتوودا بژییێ، خێرا لێی پاشگەز دەبۆوە و برینێکی ئەوتۆی دەکەوتە دڵی، کە خەون و خەیاڵ دەیخاتە دڵی ئەوکەسانەوە وا متمانەی پێ دەکەن.

بە تایبەتی خەڵکی شارەکەی ئێمە زۆر بە خێرایی ئەو عادەتەیان لە مێشکیان دەرهاویشت کە مەزەندەی ماوەی دابڕانەکە بکەن. بۆچی؟ لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەوی لە هەمووان رەشبینتر بۆ وێنە ماوەی دابڕانەکەی شەش مانگ مەزەندە کردبایە، ئەوان لە پێشدا هەموو ئازارەکانی ئەو مانگانەیان دەچێشت کە لە پێشیان بوون، و ورە و بوێریی خۆیان دەهێنایە ئاستی ئەو ئەزموونە و دواپین تین و وزەی خۆیان بەکار دێنا بۆوەی ورە بەرنەدەن و خۆ لەبەر ئازار و عەزابی ئەو رۆژە یەك لەدوای یەکانە راگرن. ئەو کات کتوپڕ برادەرێك کە لە کۆڵان تووشیان دەبوو، یا بۆچوونێکی کە لە رۆژنامەیەکدا بڵاو دەبۆوە، یا بەدگومانییەك کە دروست دەبوو و، بە گەشبینیەکی لەنەکاو ئەو بیرۆکەی ساز دەکرد، کە پێدەچێ پەتاکە لە شەش مانگ و لەوانەشە ساڵێك تێپەڕێت و تەنانەت زیاتریش بخایەنێ.

لەم ساتەدا ئەوەندە لەناکاو ورەیان بەردەدا و لە ئازایەتی دەکەوتن، کە پێیان وا بوو ئیتر ناتوانن لەم قووڵکەیە بێنە دەرەوە. هەر بۆیەش خۆیان ناچار کرد کە هیچ بیر لە گەیشتنی ئازادیی خۆیان نەکەنەوە و نەڕواننە ئاسۆی داهاتوو و بەردەوام سەر داخەن، بەڵام دیارە کە ئەم خۆپاراستنە، ئەو شێوازە لە فرتوفێڵ لەگەڵ ئازار و ژان و ئەو خۆبەدەستەوەدانە بۆ خۆپاراستن لە شەڕ، ئاکامێکی خراپی هەبوو: وێڕای خۆدزینەوە لەو شکستەی کە بە هیچ نرخێك نەیاندەویست ملکەچی بن، لە هەمان کاتدا خۆیان لەو کات و ساتانە بێبەری دەکرد کە دەیانتوانی بە بیرکردنەوە لە داهاتوو، تاعوون لە بیرخۆیان بەرنەوە و، بەو جۆرە لە نیوەڕێی گێژاو و لووتکەکاندا لە چنگی رۆژانی بێئامانج و بیرەوەرییە پووچەکاندا کۆمەڵێك سێبەر و

تارمایی سەرلێشێواو بوون، کە لەبری ئەوەی بژین، دەتلانەوە و بۆ ئەوەی تێنوگوڕێکیان بێتەبەر، قبوولّیان کردبوو لە کەوشەنی ئازارەکانیاندا پنج داکوتن.

بەو جۆرە خۆیان لەبەر ئازای ئەشکەنجەی تەواوی بەندییەکان و تەواوی دوورخراوەکانیان دەچێشت، کە بریتییە لە ژیان بە بیرەوەرییە پووچەکانەوە. ئەو رابردووەش کە بەردەوام بیریان لێ دەکردەوە لە هەر تامی داخ و کەسەری بۆ ئەوان هەبوو. بە ئاواتەوە بوون، ئەو کارانەی وەختایەکی دەیانتوانی بۆ ئەو ژن و پیاوەی بکەن وا چاویان لەدەستیان بووە و نەیان کردبوو و، پێیان داخ بوو کە بۆچی جێبەجێیان نەکردبوون، بیخەنە سەر خەرمانی بیرەوەرییەکانیان. بە جۆرێك کە خەیاڵی ئەو کەسە دوورکەوتووەیەیان دێنایەوە نێو تەواوی رووداوە بڕێك خۆشەکانی ژیانی وەك زیندانیان، بەڵام هەرگیز نەیاندەتوانی خۆیان قایل بکەن. ئێمە بێ ئۆقرە لە ئێستادا و دوژمنی رابردوو و بێبەش لە داهاتوو، تەواو لە کەسانێك دەچووین کە دادپەروەری یا رق و قینی مرۆیی لەو دیو میلە ئاسنینەکانەوە قەتیسیان دەکا. دواجار تاقانە رێگەی راکردن لەدەست ئەو وەستانە بێبڕانەوەیە ئەوە بوو، کە دیسان لە خەیاڵی خۆماندا شەمەندەفەرەکان وەڕێ بخەینەوە و، سەعاتەکان پڕ بکەینەوە لە چرکەی پەیتاپەیتای ئەو زەنگەی لاسارانە بێدەنگ ببوو.

بەڵام ئەگەر ئەمە دوورخراوەیی بوو، لە زۆربەی کاتەکاندا، دوورخستنەوە(نەفیکردن)ێك بوو لە ناوماڵی خۆیاندا و، ئەگەرچی گێڕەرەوە تەنیا ئاگای لە جۆری دوورخراوەیی خەڵکی شارەکە بوو،، بەڵام نابێ دوورخراوەیی کەسانی وەك رامبێری رۆژنامەنووس و ئەوانی دیکە لە بیر بکا کە بۆ ئەوان ئازارەکانی دابڕان چەند بەرامبەر ببۆوە. چونکە ئەوان کۆمەڵە رێبوارێك بوون، کە تاعوون لە داوی خستبوون و لە شارەکەدا عاسێ ببوون، هەر بۆیەش نە چاویان بەو کەسە دەکەوتەوە کە لێی دابڕابوون و نە زێدەکەی خۆشیان دەدیتەوە. ئەوان لە غوربەتێکی گشتیدا لە هەموان غەریبتر بوون، چونکە ئەگەر کات ئەوانیشی وەك خەڵکەکەی دی تووشی ئەشکەنجە دەکرد، شوێنەکەش کۆت و بەندی کردبوون و بەردەوام سەریان لەو دیوار و داروبەردە دەدا کە ببووە لەمپەر لە نێوان زێدەکەیان و ئەو شوێنە تاعوونلێدراوەی لێی مابوونەوە. بەردەوام دەماندیتن کە رۆژ هەتا ئێوارێ لە شارە خۆڵاوییەکەدا سەریان لێ شێواوە و لە بێدەنگیدا ئاواتەخوازی دەمەوئێوارە ئاشناکانیان و بەرەبەیانەکانی وڵاتەکەی خۆیان بوون. جا بە هەندێ

نیشانەی بچووك بچووك و پەیامی پڕ لە حەژمەتی وەك فڕینی پەڕەسێلکەکان یان شەونمێکی دەمەوئێوارە یان تیشکێکی سەیروسەمەرە کە جاروبارە خۆرەتاو دەیهاوێتە کۆڵانەکان، برینی خۆیان دەکولاندەوە.

ئەوان وازیان لە دنیای دەرەوە کە دەیتوانی مرۆڤ لە هەموو شتێ ڕزگار بکا دەهێنا و، پێداگرانە لەگەڵ خەیاڵەکانی خۆیان کە لە ڕادەبەدەر ڕاستەقینە بوون، دەژیان و، بە هەموو تواناوە وێنەکانی ئەو وڵاتەیان دەێنایە بەرچاوی خۆیان، کە تیشکێکی تایبەت، دوو یا سێ تەپۆڵکە و دارێکی خۆشەویست و ڕوخساری ژنان، شوێنێکی بێوێنەی بۆ دروست دەکردن.

ئینجا ئەڤینداران کە دەکرێ لە هەمووان وردتر قسەیان لەسەر بکەین، چونکە ئەوان لە هەر هەمووان سەرنجڕاکێشتر بوون و لەوانەیە گێڕەرەوە لە هەموو کەس باشتر بتوانێ قسەیان لەسەر بکا. ئەوان بەدەست کۆمەڵێك دڵەڕاوکێی دیکەشەوە ئازاریان دەچێشت، کە تێیاندا دەکرێ ئاماژە بە پەژیوانیەکان* بکەین. لە ڕاستیدا ئەو دۆخە دەرفەتی ئەوەی دابوونێ، کە بە گەشبینییەکی پڕکەفوکوڵەوە هەستی خۆیان دەربڕن و وێنای بکەن لەوەها دۆخێکدا دەگمەن وابوو، بێدەسەڵاتی و لەرزۆکییەکەیان بەجوانی لێ دەرنەکەوێ. یەکەم کێشەیان ئەوە بوو،کە بە وردی هەڵسوکەوت و ئاکار و جووڵەی کەسە لێ دابڕاوەکەیان نەدەهاتەوە بەرچاو. ئاخیان بۆ ئەوە هەڵدەکێشا کە نەیاندەزانی ئەو (کەسە دوورەکەیان) کاتەکانی خۆی چۆن تێپەڕ دەکا. جا چونکە نەیانویستبوو بەوەی بزانن و، وایان نواندبوو کە شێوەی کات بەسەربردنی گراوی (مەعشووق) ناکرێ سەرچاوەی هەموو شادییەکان بێ، بۆیە خۆیان بە خەمسارد و کەمتەرخەم دەزانی. لەمەودوا بۆیان ئاسان بوو چاوێك بە ڕابردووی دڵداریکردنیاندا بخشێننەوە و کەمایەسییەکانی دەسنیشان بکەن. لە کاتوساتە ئاساییەکاندا هەمووومان بە ئیختیاری خۆمان یا بە بێ ئەوەی ئاگامان لێ بێ، دەمانزانی ئەو عیشقەی بەسەر خۆیدا زاڵ نەبێ عیشق نیە و کەم و زۆر بە ئاسوودەییەوە ئەوەمان قەبووڵ دەکرد، کە خۆشەویستیەکەمان، دڵدارییەکی مامناوەند بێت (زێدەڕۆیی پێوە دیار نەبێ)، بەڵام بیرەوەری بەردەوام پڕ چاوەڕوانیە و بە شێوەیەکی زۆر بەجێ و ژیرانە، ئەو نەگبەتییەی لە دەرەوەڕا ڕووی تێکردبووین و بەرۆکی

---

* پەژیوانی: پەشیمانی. (من خەریکە بۆ کچە شێخێك پەژیوان دەبمەوە)

هەموو شارەکەی گرتبوو، نەك هەر عەزابێکی زاڵمانەی ئازاردەری لەگەڵ خۆیدا بۆ هێنابووین، بەڵکو وای کردبوو ئێمە خۆیشمان خۆمان ئازار بدەین و مل بۆ ئازار و ژانەکە راکێشین، ئەوە یەکێك لەو رێگایانە بوو کە لەوێوە پەتاکە سەرنجی خەڵکی لەخۆی دوور دەخستەوە و پشێوی و گێچەڵی دەنایەوە.

بەو جۆرە هەرکەسە و ناچار بوو لە ژێر ئاسماندا بە تەنیٚ و لەمڕۆوە بۆ سبەی بژی. ئەم ملکەچبوونە گشتییە کە بە تێپەڕبوونی کات دەیتوانی باری دەروونیان هێورتر بکاتەوە، هەموانی کردە مرۆڤگەلێکی تەوەزەل. بۆ وێنە ژمارەیەك لە خەڵکی شارەکەی ئێمە ملیان بۆ کۆیلەتییەکی دیکە راکێشابوو، کە ئەوانی کردبووە گوێلەمستی هەتاو و باران. هەر چاوت پێیان بکەوتایە، دەتزانی گۆڕانی هەوا دەمودەست و راستەوخۆ کاریگەریی لەسەریان دەبیٚ. هەر چاویان بە تیشکی زێڕینی خۆر دەکەوت، روخساریان گەش دەبۆوە، لەحاڵێکدا لە رۆژە باراناوییەکاندا دەمامکێکی ئەستوور بەسەر روخسار و بیر و هزریاندا دەکشا. چەند حەوتوو بەر لەوە ئەوان لەم لاوازی و کۆیلەتییە بێهۆیە رایاندەکرد، چونکە لە هەمبەر دنیادا بە تەنیٚ نەبوون و تا رادەیەك ئەو بوونەوەرەی لەگەڵیان دەژیا بەرەنگاری دنیاکەی ئەوان دەبۆوە. بە پێچەوانەوە لەم ساتە بە دواوە دەتگوت خۆیان داوەتە دەست هەوا و هەوەسی ئاسمانەوە، واتە بیٚ هۆ ئازاریان دەچێشت و بەبیٚ هۆ هیوادار دەبوون.

بە کورتی، لەم لووتکەی تەنیاییەدا هیچ کەس نەیدەتوانی چاوەڕوانیی لە جیرانەکەی هەبیٚ یارمەتیی بدات. هەر کەسە و لەگەڵ گرفتەکانی خۆیدا تەنیا دەکەوتەوە. ئەگەر بە رێکەوت یەکێك لە نێو ئێمەدا ویستبای دەردەدڵیٚ بکا و بە چەند وشەیەك هەستی خۆی دەربڕیٚ، ئەو جوابەی وەریدەگرتەوە جا هەر شتێك بوایە، زۆربەی جاران برینێکی لەسەر دڵی دادەنا. ئەو کات دەیزانی ئەو و بەردەنگەکەی باسی یەك شت ناکەن. ئەو لە راستیدا باسی قووڵایی رۆژانی تێفکرینی تاڵ و ئازاری دەکرد و ئەو وێنەیەی دەیویست بیهێنێتە بەرچاوی، ماوەیەکی زۆر، لە کڵی چاوەڕوانی و هەژاندا خارابوو. بە پێچەوانەوە ئەویتر هەژانێکی گرێبەستیانە و ژانێکی بازاڕی و پەژارەی سواوی دێنایە بەرچاوی خۆی و وەڵامەکەیش دۆستانە بوایە یا دوژمنانە، بەردەوام لەگەڵ ئەو یەکی نەدەگرتەوە و پێویست بوو لێی پاشگەز بێتەوە. یا

لانیکەم ئەوانەی نەیاندەتوانی بێدەنگ بن و لە لایەکیشەوە لە زمانی راستەقینەی دڵیش تێنەدەگەیشتن، قایل دەبوون بەوەی کە بە زمانی کووچە و کۆڵان(رەشۆکیانە) بدوێن و بە پێی شێوەی گرێبەستیانە و شێوازیسادەی پێوەندیگرتن و رووداوە جۆراوجۆرەکانی رۆژانە لەگەڵیانا بدوێن. بەو جۆرە بوو بە خوویەك، کە راستەقینەترین ژانەکان بە زمانێکی سواوی رۆژانە بگوترێن. تەنیا بەو شێوەیە بوو کە بەندییەکانی تاعوون دەیانتوانی هاودەردی یا سەرنجی بیسەرانیان بۆلای خۆیان راکێشن.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ـ و ئەوە زۆر گرینگە ـ هەرچەندەی ئەو دڵەڕاوکێیانە زۆر بە ژان بوون و هەرەچەندە هەڵگرتنی باری ئەو دڵە بەتاڵە زۆر قورس بوو، دەکرێ بڵێی ئەو غوربەتلێدراوانەی قۆناغی یەکەمی تاعوون، شتێکیان بەسەر ئەوانی دیکەوە هەبوو: تەنانەت لەو کاتەشدا وا خەڵکی شار خەریك بوو شێت دەبوون، بیری ئەوان بە تەواوی لای ئەو بوونەوەرە بوو کە چاوەڕوانی بوون. لە نێوان داماوی و ترسی گشتیدا غوررووری عیشق، ئەوانی دەپاراست و کە بیریان لە تاعوون دەکردەوە، بەردەوام لەبەر ئەوە بوو نەکا لێکدابڕانەکەیان لێ بکاتە دابڕانێکی هەمیشەیی و دیدار ئاخریان بکات. بەو شێوەیە ئەوان تەنانەت لە چەقی تاعوونیشدا سەرقاڵییەکی رزگاریدەریان هەبوو، کە لەوانەبوو ناوی بنرێ لەسەرخۆیی و دانبەخۆداگری. هیوابڕاوییەکەیان ئەوانی لە ترس رزگار دەکرد و چارەڕەشییەکەیان رزگاریی بۆ دەهێنان. بۆ وێنە ئەگەر یەکێکیان تاعوون دەیبردەوە، هەمیشە بەر لەوە بوو ئەوان دەرفەتیان بووبێ لێی ورد ببنەوە. لەو قسەوباسە دەروونییەی لەگەڵ تارماییەکدا هەیبوو، لە نەکاو دەهێنرایە دەرێ و بە بێ هیچ نێوبژیوانێك بە قووڵترین بێدەنگییەکانی سەر زەویدا رۆدەچوو. کات و دەرفەتی بۆ هیچ کارێك نەدەبوو.

لەو جەنگەیەدا کە خەڵکی شارەکەی ئێمە هەوڵیان دەدا خوو بەو دوورخراوەییە لەنەکاوەوە بگرن، تاعوون لەبەر دەم دەروازەکانەوە پاسەوانی دادەنا و ئەو پاپۆڕانەی دەگەڕاندنەوە کە بەرەو ئۆران دەهاتن. لەو کاتەوە کە دەروازەکان داخرابوون، تەنانەت یەك ئامرازی هێنان و راگواستنیش نەهاتبووە نێو شارەکەوە. هەر لەوێ رۆژێوە وا هەست دەکرا وەك بڵێی

ترۆمبیلەکان بەردەوام دەخولێنەوە. بەندەرگەش بۆ ئەوانەی وا لەسەر شوستەکانەوە سەیریان دەکرد دیمەنێکی سەیری بەخۆوە گرتبوو. ئەو قەرەباڵغیەکەی جارانی کە بەردەوام ئەوێی کردبووە یەکێك لە بەندەرە هەرە باشەکانی ئەم کەنارە، لەنەکاو کپ و خامۆش ببوو. هێشتا چەند کەشتییەکی راگیراو و قەرەنتینەکراو لەوێ دەبینران، بەڵام هەڵێنەری گەورەی بەتاڵ، فارگۆنی وەرگەڕاو، کۆگای لەسەر یەك هەڵچنراوی بەرمیل یا گۆنی لەسەر ئیسکلەکان، نیشانەی ئەوە بوون کە لە سۆنگەی تاعوونەوە، بازرگانیکردیش پەکی کەوتووە.

سەرەڕای ئەو دیمەنە نائاساییانە بە رواڵەت خەڵکی شارەکەی ئێمە هەر نەیاندەزانی چیان لێ قەوماوە. هەستی هاوبەشی وەك لێکدابڕان یا ترس لەگۆڕێ بوو، بەڵام ئێستاش وەك جاری جاران، هەر کەسە و کاری خۆی دەخستە سەرووی هەموو شتێکەوە. هیچ کەس هێشتا بە راستی بڕوای بە پەتاکە نەکردبوو. زۆربەی خەڵك بە تایبەتی بەو شتە هەستیار بوون، کە عادەت و خووی لێ تێك دەدان، یا کۆسپی بەردەم بەرژەوەندەکانیان بوو. ئەوان لەو سۆنگەیەوە، یان تووڕە بوون یان هەژابوون، بەڵام خۆ شەڕی تاعوون بە هەستو کەفوکوڵ ناکرێ.

بۆ وێنە یەکەمین دژکردەوەی ئەوان تاوانبارکردنی بەرپرسانی حکوومی بوو. وەڵامی پارێزگار بۆ ئەو رەخنانەی لە وتاری رۆژنامەکاندا دەنگدانەوەیان هەبوو( لەمەڕ ئەوەی ئاخۆ ناکرێ ئەو رێوشوێنانە بڕێك کەمتر بکرێنەوە؟) زۆر چاوەڕواننەکراو بوو. هەتا ئەو کات نە رۆژنامەکان و نە هەواڵدەریی رانسدۆك هیچکام نەیانتوانیبوو هەواڵێکی فەرمی لەسەر ئاماری پەتاکە بخەنە روو. پارێزگار رۆژبەرۆژ ئەو ئامارەی خستە بەردەستی هەواڵدەری و ویستی حەوتووی جارێك رای بگەیەنێ.

بەو حاڵەشەوە خەڵکەکە مێشێکیشی لێ میوان نەبوو. لە راستیدا ئەو راگەیەنراوەی لە سێهەمین حەوتووی تاعووندا هەواڵی مەرگی سێسەتودوو کەسی بڵاو کردەوە هیچ کارێکی تێ نەکردن. لە لایەکیشەوە لەوانەبوو ئەوانە هەر هەموویان بە تاعوون نەمردبێن و جگە لەوەش، کەس لە شاردا نەیدەزانی لە کاتوساتی ئاساییدا حەوتووی چەند کەس دەمرن. شار دووسەت هەزار کەس حەشیمەتی هەبوو و، خەڵك نەیاندەزانی ئاخۆ ئەو رێژەیە ئاساییە یان نا؟ جا زۆربەی جار، هەر ئەو شتانە،

سەرەڕای گرینگیی بێ ئەملاوئەولایان کەس بەدوایاندا ناچێ. خەڵك ئامارێکیان بۆ بەراوردکردن لەبەردەستدا نەبوو. بە تێپەڕینی کات و بە دیتنی هەڵکشانی ڕێژەی مردنەکان بوو کە بیروڕای گشتی ڕاستییەکەی لێ روون بۆوە. حەوتووی پێنجەم سێسەت‌ویەك کەس و حەوتووی شەشەم سێسەت‌وچل‌وپێنج کەس تێدا چوون. لانیکەم ئەو هەڵکشانە ئاشکرا و روون بوو، بەڵام دیسانیش ئەوەندە نەبوو بتوانێ لەگەڵ هەموو نیگەرانیەکانی شارەکەی ئێمەدا، ئەو خەیاڵەیان لە مێشکی بێنێتەدەرێ کە ــ دیارە ڕووداوێکی تاڵە، بەڵام زوو تێدەپەڕێ ــ.

ئیتر ئاوا بەردەوام بوون لە خولانەوە بە نێو کۆڵانەکان و دانیشتن لە هەیوانی کافتریاکاندا. کە دەوری یەکتر بوون، ترسنۆك نەبوون، زیاتر لەوەی سکاڵایان هەبێ خۆیان بە گاڵتەو گەپەوە دەخافڵاند و وایان دەنواند کە بە رووی گەشەوە لەگەڵ ئەو بەڵایەی دڵنیان تێدەپەڕێ، رادێن. ڕواڵەتەکە پارێزرابوو. لەگەڵ ئەوەشدا لە کۆتایی مانگدا و دەکرێ بڵێین لە ماوەی حەوتووی پاڕانەوە و رازونیازیشدا کە دواتر باسی دەکەین، هێندێ گۆڕانی خراپتر، روخساری شارەکەمانی تەواو گۆڕی. لە پێشدا پارێزگار لەمەڕ ئامراز و کەرەسەی راگواستن و دابینکردنی خۆراك کۆمەڵە بڕیارێکی دەرکرد. دابەشینی خۆراك پێخۆری پێوەکرا* و، بەنزین دەستی پێوە گیرا. تەنانەت بڕیار درا دەست بە بەکارهێنانی کارەباشەوە بگرن. تەنیا ئەو شتانەی زۆر پێویست بوون، ئەویش بە ئاسمان و زەویدا دەگەیێنرایە ئۆران. بەو شێوەیە دیتیان هاتوچۆی ئامراز و کەرەسەی راگواستن رۆژ لەگەڵ رۆژ کەمتر بۆوە و وای لێ هات هەر نەما. ئەو دووکانانەی کەلوپەلی جوانکارییان دەفرۆشتن، وردەوردە دادەخران و دووکانەکانی دیکەش لە حاڵێکدا کە کڕیار لە بەردەرگاکانیان ریزیان بەستبوو، کاغەزیان بە جامخانەکانیانەوە دەدان کە ئیتر هیچیان نەماوە بیفرۆشن.

بەو جۆرە ئۆران دیمەنێکی سەیری بەخۆوە گرت. ژمارەی ڕێبواران زیادیان کرد و تەنانەت لە کاتەکانی پشوودانیشدا زۆربەی ئەوانەی بە هۆی داخرانی دووکانەکان و نەبوونی کار و چالاکی لە ئیدارەکانیان، کووچە و کۆڵانەکانیان قەرەباڵغ دەکرد. ئەوانە هێشتا بێکار نەکەوتبوونەوە، بەڵکوو ئیشیان راگرتبوو. لەم رووەوە ئۆران لە سەعات سێی دوانیوەڕۆوە و لە

---

* پێخۆرپێوەکردن: دەست پێوەگرتن. دابەشینکی کەم کەمە. پێخۆری پێوە بکە: واتە زۆر زۆر مەیدە بەر. کەم کەم بیخۆ.

ژێر ئاسمانە جوانەکەیدا، حاڵەتی خەڵەتێنەری شارێکی دەگرتە خۆی، کە دەتگوت جێژنی گرتووە و، کەرەسەی هاتوچۆیان تێدا راگرتووە و دووکانەکانیان داخستوون بۆوەی رێورەسمە گشتییەکە جوان بەڕێوە بچن و خەڵك بە کۆڵانان وەربوونە، بۆوەی بەشداری شادی و خۆشییەکان بــن.

دیارە ئەم داخرانی دووکان و دامودەزگا و ئیدارەیە بەگشتی پارووی سینەماکانی ختبووە رۆنەوە و پارەیەکی باشیان وەگیر دەکەوت، بەڵام ئاڵوگۆڕی فیلم لەگەڵ شارەکاندا راگیرابوو. پاش دوو حەوتوو سینەماکان ناچار بوون بەرنامەکانیان لە نێو خۆیاندا بگۆڕنەوە و دوای ماوەیەك هەر سینەمایەی ناچار بوو یەك فیلم پێشان بدا. لەگەڵ ئەوەشدا داهاتیان دانەدەبەزی.

بە کورتی کافتریاکان، لە سایەی پاشکەوتە زۆر و زەوەندەکەی ئەو شارەی بازرگانیی شەراب و ئارەق تێیدا لە هەموو شتێك گرنگتر بوو، توانیان پێداویستییەکانی کڕیارەکانیان دابین بکەن. ئەگەر راستیتان دەوێ خەڵك زۆریان دەخواردەوە. یەکێك لە کافتریاکان وای بڵاو کردبۆوە، کە شەرابی بێخەوش و خالیس میکرۆب دەکوژێ. هەر بۆیەش ئەو بۆچوونە هەمووانییە کە خواردنەوە پێش بە نەخۆشییە چڵکییەکان* دەگرێ لە خەڵکدا پەرەی گرت. هەموو شەوێ دەورووبەری سەعات دوو، ژمارەیەکی زۆر مەست و سەرخۆش کە لە کافتریاکان هاتبوونە دەرێ، کۆڵانەکانیان پڕ دەکرد و قسەوباسی گەشبینانەیان بڵاو دەکردەوە.

بەڵام ئەو گۆڕانانە لە لایەکەوە، ئەوەندە نائاسایی بوون و وا بە خێرایی رووی دابوو کە بە ئاسانی نەدەکرا بە سرووشتی و درێژخایەنیان بزانی. لە ئاکامدا هەر ئەوەندە دەکرا بڵێی، ئێمە هێشتا هەستە تاکەکەسییەکانی خۆمان لە سەرووی هەموو شتێکەوە دادەنا.

دوو رۆژ پاش داخرانی دەرگاکان، دوکتۆر ریۆ لە کاتی وەدەرکەوتنی لە نەخۆشخانە، کۆتاری دی کە رەزامەندی و شادیی بە روخسارییەوە دیار بوو. ریۆ پیرۆزبایی خۆشحاڵییەکەی لێکرد. کابرا وردیلەکە گوتی:

---

* ئەو پەتایانەی کە مرۆڤ دەیانگرێ، ئەندامەکانی ئیلتهاب دەکەن. چڵك و کێم و زووخیان تێدا کۆ دەبێتەوە. وەك لارەشە....

ـ بەڵێ، زۆر باشم. بە راستی دوکتۆر ئەو تاعوونە تووکلێکراوە چیی لێ هاتەوە؟ خەریکە وەڕاست دەگەڕێ.

دوکتۆر بۆی سەلماند و کۆتار بە جۆرە شادییەکەوە رای خۆی دەربڕی:

ـ بەو زووانە و هەر لەخۆوە راناوەستێ. دار بە سەر بەردەوە ناهێڵێ.

ساتێك پێکەوە پیاسەیان کرد. کۆتار باسی ئەوەی کرد کە دووکاندارێکی گەڕەکەکەیان کەرەسەی خواردەمەنیی لە عەمبارێدا راگرتووە بۆوەی بە نرخی گرانتر بیفرۆشێتەوە و، کاتێك هاتوونەتە سۆراغی بیبەنە نەخۆشخانە، سندووقی خواردەمەنیەکەیان(خورادنی نێو قوتوو) لە بن قەرەوێڵەکەیدا دۆزیوەتەوە و گوتی:" لە نەخۆشخانە مرد. تاعوون خێر و بەرەکەتی پێوە نیە." کۆتار چیرۆکی لەو جۆرەی جا بە راست یا بە درۆ لەسەر پەتا، زۆر پێ بوو. بۆ وێنە دەیانگوت لە نێوەڕاستی شار سەرلەبەیانیەك، پیاوێك کە نیشانەی تاعوونی لێ وەدەرکەوتبوون، بە دەم وڕێنەکردنەوە، لە ماڵێ رای کردبووە دەرەوە و کە تووشی ئافرەتێك دێ، یەکسەر وەبن خۆی دەدا و بەخۆیەوە دەگوشێ و هاواریش دەکا و دەڵێ ئەی هاوار تاعوونم گرتووە. کۆتار بە لەبزێکی پڕ بەزەییەوە کە هیچ لەگەڵ قسەکەی یەکی نەدەگرتەوە رای خۆی دەردەبڕی:

ـ دەی، وردەوردە هەموو شێت دەبین. گومانی تێدا نیە.

هەر دوانیوەڕۆی ئەو رۆژەش ژۆزێف گرانت ئاخری لای دوکتۆر ریڤۆ پرێسکەی دڵی خۆی بۆ دکتۆر ریڤۆ کردەوە. ئەو لەسەر مێزەکە وێنەی مادام ریڤۆی دیتبوو و دوایی چاوی بڕیبووە دوکتۆر ریڤۆ. ریڤۆ گوتی، ژنەکەی لە دەرەوەی شار خەریکە عیلاجی خۆی دەکات. گرانت گوتی:" بە لایەکدا رێکەوتێکی باشە." دوکتۆر گوتی، بێگومان رێکەوتێکی باشە و هیوادارم ژنەکەم چاك بێتەوە. گرانت گوتی:

ـ بەڵێ، تێدەگەم.

و بۆ یەکەم جار لەوەتەی ریڤۆ دەیناسی دەستی کرد بە زۆربڵەیی. لەگەڵ ئەوەدا کە دیسانیش بە شوێن وشەدا دەگەڕا، بەڵام هەموو ئەو وشانەی دۆزینەوە کە مەبەستی بوون، وەك بڵێی زۆر دەمێك بوو بیری لەوە کردبۆوە وا ئێستا گوتی.

لەو دەمەوە کە لە هەرەتی لاوەتیدا بوو، لەگەڵ کچۆڵەیەکی هەژاری یەکێك لە جیرانەکانیان زەماوەندی کردبوو و، هەر لەبەر ئەو زەماوەندەش بوو وازی لە خوێندن هێنابوو و ئیشێکی دۆزیبۆوە. نە ژینێ Jeanne و نە ئەویش هیچیان لە گەڕەکەکەیان نەدەچوونە دەرێ. گرانت بۆ سەردانی ئەو دەچووە ماڵەکەی و دایك و باوکی ژینێ برێك بەو خوازبێنیە بێدەنگ و کرچوکاڵە پێدەکەنین. باوکی فەرمانبەری ئاسنەڕێ بوو. لە کاتی پشوویدا دەیاندی لە گوشەیەکی دەم پەنجەرەکەوە دانیشتووە، بە روخسارێکی پڕ خەفەتەوە، لە هاموشۆی کۆڵان دەڕوانێ و دەستە پانەکانی بە قامکی لێك ئاوەڵاوە لە سەر رانەکانی داناون. دایکە بەردەوام سەرقاڵی کاروباری ماڵەوە بوو. ژینێ یارمەتیی دەدا. ئەوەندە وردیلە بوو کە وەختێك گرانت دیتی خەریکە لە شەقامەکە دەپەڕێتەوە ئەوبەر، بەندی دڵی پسا. ترۆمبیلەکان لەچاو بەژنی ئەو لەبەر چاوی گرانت زۆر گەورە دیار بوون. رۆژێك لە بەردەم دووکانێکدا کە کەلوپەلی جێژنی نۆئێلی دەفرۆشتن، ژینێ کە تاسەبارانە لە جامخانەکەی دەڕوانی بەلای ئەودا نوشتایەوە و گوتی:" چەندە جوانە." و گرانت دەستی گوشی. بەو جۆرە بوو کە پەیمانی زەماوەندیان بەست.

باقی رووداوەکە، وەك گرانت دەیگێڕاوە، زۆر سادە بوو. بۆ هەمو کەس هەر وایە. پێکەوە زەماوەند دەکەن، دیسان برێکیان یەکتر خۆش دەوێ و کار دەکەن. ئەوەندە کار دەکەن کە خۆشەویستییان لە بیر بچێتەوە. ژینێیش کاری دەکرد لەبەر ئەوەی سەرۆکی دایرەکەی بەڵێنەکەی نەبردبووە سەرێ. لێرەدا پێویست بوو مرۆڤ برێك یارمەتی لە هێزی خەیاڵی خۆی وەرگرێ، بۆوەی تێبگا گرانت دەڵێ چی. ماندووبوونی زیاتر یارمەتیی دابوو کە خۆی بداتە دەست رووداوەکانەوە و، رۆژلەگەڵ رۆژ بێدەنگتر بێ، ئیتر تاقەتی ئەوەی نەمابوو ژنەکەی دڵنیا بکاتەوە کە خۆشی دەوێ. ئەو پیاوەی کار دەکا، هەژاری، ئەو داهاتووەی کە وردەوردە هیچ ئاواتی لەدڵیدا ناهێڵێ و ئەو بێدەنگییەی شەوانە بەسەر سفرەکەدا زاڵە... لە وەها دنیایەکدا ئیتر جێ نامێنێتەوە بۆ خۆشەویستی. لەوانەبوو ژینێ ئازار بچێژێ. لەگەڵ ئەوەدا بەجێی نەهێشت و مایەوە: زۆر جار وا رێك دەکەوێ، کە مرۆڤ بۆ ماوەیەکی درێژ ئازار دەچێژێ، بەبێ ئەوەی بۆخۆی بزانێ. ساڵی تێوەرسووڕایەوە، ئاخری لێیدا رۆیشت. دیار بوو ئەو کارەی بە شتێکی سادە نەگرتبوو. ئەو نامەیەی بۆ گرانتی نووسیبوو بە گشتی بریتی بوو لەوە: " ئەمن

تۆم خۆش دەویست، بەڵام ئێستا ماندووم.... بەو رۆیشتنە خۆم بە بەختەوەر نازانم، بەڵام بۆ دەستپێکردنەوەش، بەختەوەربوون پێویست نیە."

ژۆزیف گرانتیش بە نۆرەی خۆی ئازاری دەچێشت. هەروەکی ریڤۆ وەبیری هێنابۆوە ئەو دەیتوانی دیسانیش دەست پیێبکاتەوە، بەڵام ئیتر باوەڕی بەهیچ نەمابوو.

تەنیا بەردەوام بیری لە ژینیێ دەکردەوە. پێی خۆش بوو، بۆ ئەستۆپاکیی خۆی، نامەیەکی بۆ بنووسێ و دەیگوت:"، بەڵام ئەستەمە. زۆر لەمێژە بیری لیێ دەکەمەوە. ئەو ماوەیەی یەکترمان خۆش دەویست دەمانتوانی بەبێ قسەکردن لە یەکدی تێبگەین، بەڵام خۆ مرۆڤ هەمیشە عاشق نابێ. لە کات و ساتی دیاریکراودا دەمتوانی وشەی وا بدۆزمەوە و بیانڵێم کە نەهێڵم بڕوات. کەچی نەمتوانی." گرانت بە دەسرۆکەیەکی شەترەنجیی مەخمەری لووتی سڕییەوە. دوایی سمێڵی خاوێن کردنەوە. ریڤۆ چاوی لیێ دەکرد. پیرەمێردە گوتی:

ـ داوای لێبوردن دەکەم دوکتۆر، بەڵام بڵێم چی؟... ئەمن بڕوام بە تۆیە... لە کن تۆ قسەم پیێ دەکریێ، ئینجا کولێ دەمگریێ.

شەویێ ریڤۆ تەلەفۆنی بۆ ژنەکەی کرد و وتی شارەکە داخراوە. بۆخۆی باشە. هەر لە فکری ئەو دایە و ئەو دەبێ وریای خۆی بێ.

سیێ حەوتوو دوای داخرانی دەرگاکان، ریڤۆ لە کاتی چوونەدەرەوەی لە نەخۆشخانەدا، تووشی کابرایەکی گەنج هات کە چاوەڕێی بوو. کابرا گەنجەکە پێی گوت:

ـ پێم وایە دەمناسیتەوە.

ریڤۆ پێی هەستی کرد دەیناسیێ، بەڵام بەگومان بوو. کابرا گەنجەکە وتی:

ـ ئەمن بەر لەم رووداوانە هاتمە لات بۆوەی هێندیێ زانیاریت لەسەر شێوەی ژیانی عارەبان لیێ وەرگرم. ناوم ریمۆن رامبێرە.

ریڤۆ گوتی: ئەها، وایە، دەی! ئێستیێ بابەتێکی باشت بۆ ریپۆرتاژ بۆ هەڵکەوتووە.

رامبێر تووڕە دیار بوو، گوتی مەسەلەکە ئەوە نیە و هاتووە یارمەتییەك لە دوکتۆر ریڤۆ وەرگریێ و گوتیشی:

ـ داوای لێبوردن دەکەم. ئەمن لەم شارەدا کەس ناناسم و لە بەختی من، هەواڵنێرە خۆوڵاتییەکەی رۆژنامەکەشم بۆ نەگبەتی، گەمژەیە.

ریڤۆ داوای لێکرد هەتا دەرمانگایەك لە نێوەڕاستی شار بە پێیان بڕۆن، لەبەر ئەوەی دەبێ هێندێ رێوشوێنیان بداتێ. ئەوان بە کۆڵانە تەنگەبەرەکانی گەڕەکی قولەرەشەکاندا داگەڕان. شەو خەریك بوو بەسەردا دەهات، بەڵام شار کە جاری جاران لەم کات و ساتانەدا تەواو کپوبێدەنگ بوو، ئەوەندە چۆڵ بوو سەرت لێی سوور دەما. چەند دەنگێکی کەڕەنا لە ژێر میچی ئەو ئاسمانەی هێشتا ئاڵتوونی دەچۆوە، نیشانەی ئەوە بوو، کە سەربازەکان گەرەکیانە بڵێن بە ئیشی خۆیانەوە سەرقاڵن. لەم جەنگەیەدا بە درێژایی کۆڵانە لێژەکان و لە نێوان دیوارە شینە خشت مۆرە مەغریبییەکانەوە، رامبێر بە کەفوکوڵەوە قسەی دەکرد. ئەو خێزانەکەی لە پاریس دانابوو. یانی ژنی نەبوو، بەڵام هەر شتێکی ئاوا بوو. هەر لەگەڵ داخرانی شارەکەدا تەلەگرافی بۆ ناردبوو. لە پێشدا وای زانیبوو رووداوێکی تیژتێپەڕە و تەنیا بیری لەوە کردبۆوە نامە بگۆڕنەوە. ئەو هاوکارانەی لە ئۆران هەیبوون، پێیان گوتبوو هیچ شتێکیان لەدەست نایە. پۆستە و گەیاندن جوابی کردبوو و یەکێك لە سکرتێرەکانی پارێزگاری، گاڵتەی پێکردبوو. ئاخرییەکی پاش دوو سەعات چاوەڕوانی لە ریزێکی دوورودرێژدا توانیبووی تەلەگرافێك جێبەجێ بکات کە تێیدا نووسیبووی :" باشم. بەو هیوایەی بەیەکتر شاد بینەوە."

بەڵام بەیانی کە لە خەو هەستابوو، لەپڕ ئەو بیرە مێشکی داگرتبوو، کە نازانێ ئەو رەوشە هەتاکەی دەخایەنێ. بڕیاری دابوو لە ئۆران بڕوات. لەبەر ئەوەی راسپێردرابوون (هەندێ کارئاسانی بۆ رۆژنامەنووسان دەکرێ). توانیبووی چاوی بە سەرۆکی نووسینگەی پارێزگاری بکەوێ و پێی گوتبوو هیچ حەزی لە ئۆران نیە و کارەکەی ئەوە نییە لەوێ بمێنێتەوە و، بە رێکەوت رێی کەوتووەتە ئەم شارە و حەق وایە رێی بدەن لەو شارە بچێتە دەرێ، تەنانەت ئەگەر پێویست بکا پاش چوونەدەرێ، قۆناغی دابڕگە(قەرەنتینە)ش تێپەڕ بکا.

سەرۆکی نووسینگە گوتبووی تەواو لە مەبەستەکەی تێدەگا، بەڵام ناکرێ ئەو هەڵاوێرن. بەهەر حاڵ هەوڵی خۆی دەدا، بەڵام بە گشتی بارەکە نالەبارە و ناکرێ هیچ بڕیارێك بدرێ. رامبێر گوتبووی:

ـ بەڵام ئاخر من لەو شارە نامۆم.

ـ لەوە دڵنیام، سەرەڕای هەموو ئەو قسانەش هیواداریین ئەم پەتایە زۆر نەخایەنێ.

لە کۆتاییدا بۆ ئەوەی بتوانێ دڵی رامبێر بداتەوە وەبیری هێنابۆوە، ئەو ئێستا باشترین بابەتی ریپۆرتاژی لە ئۆران دەست دەکەوێ و، گوتبووشی ئەگەر مرۆڤ زۆر ورد بێتەوە، هیچ رووداوێك نیە لایەنێکی باشی نەبێ. رامبێر شانەکانی هەڵدەتەکاندن. گەیبوونە ناوەندی شار. دەیگوت:

ـ بێ مانایە دوکتۆر، تێدەگەی؟ خۆ ئەمن بۆ ریپۆرتاژنووسین لەدایك نەبوومە، بەڵام لەوانەیە بۆوە لەدایك بووبێتم لەگەڵ ژنێك بژیم. باشە ئەوە سرووشتی نیە؟

ریڤۆ گوتی بە هەموو لایەکدا بەجێیە.

شۆستەکانی ناوەندی شار وەك جاران قەرەباڵغ نەبوون. چەند رێبوارێك بە تاڵووکە بەرەو ماڵە دوورەکانیان دەڕۆیشتنەوە. هیچکام بزەیەکیان لەسەر لێو نەبوو. دواتر ریڤۆ ب زەینیدا هات کە، ئەوە ئاکامی ئەو راگەیانراوەیە وا ئەوێ رۆژێ رانسدۆك دەریکردبوو. پاش بیستوچوار سەعات هیوایەك لە دڵی خەڵکی شارەکەماندا بووژابۆوە، بەڵام ئامارەکانی ئەو رۆژە لە یادەوەرییاندا هەروا کۆن نەببوو. رامبێر بە بێ پێشەکی گوتی:

ـ مەسەلە ئەوەیە من و ئەو، تازە پێك گەیشتووین و زۆریش تەبا و رەباین.

ریڤۆ هیچی نەدەگوت. رامبێر لەسەری رۆیشت:

ـ ئەزیەتم دای. هەر دەمویست لێت بپرسم ئاخۆ دەتوانی پشتگیرییەك بدەیتە من و ئەوە پشتڕاست بکەیتەوە کە من ئەو پەتا نەفرەتییەم نەگرتووە. لەوانەیە بە کەڵکم بێت.

ریڤۆ بەسەر بۆی سەلماند، پڕی دایە ئەو منداڵە بچووکەی وا خۆی لە لاقەکانی وەراندبوو و لەسەرخۆ لەسەر هەر دوو پێ داینایە عەرزی. هەر وا رۆیشتن تا گەیشتنە پالاس دارم. لکوپۆی داری فیکۆس و خورما بێجووڵە و لەبە تەپوتۆز رەشداگەڕاو، پەیکەرە تۆزاوی و چڵکنەکەی کۆمارییان داپۆشیبوو. لە بن پەیکەرەکە راوەستان. ریڤۆ لاقی کە گەردێکی سپییان لێ نیشتبوو تەکاند. سەیری رامبێری کرد، رۆژنامەنووسەکە بە کڵاوی شاپۆوە کە برێك هەڵیکێشابوو و بە قۆپچەی کراسەوە کە لە بن بۆینباخەکەیەوە کرابوونەوە و بە ریشی نەتاشراوەوە، رواڵەتێکی هیوابڕاو و تووڕەی هەبوو. دوکتۆر ریڤۆ گوتی:

ـ دڵنیابە کە لێت تێدەگەم، بەڵام بەڵگەوبیانگەکەت هەو نیە. ئەمن ناتوانم پشتگیریت بدەمێ لەبەر ئەوەی لێك روون نییە ئاخۆ ئەو پەتایەت گرتووە یان نا؟ تەنانەت ئەگەر بیشیسەلمێنین، دیسانیش ناتوانم دڵنیا بم لەوەی کە لەو مەودایەی کە لە نووسینگەی کارەکەی من دێیتە دەرەوە هەتا ئەو کاتەی دەچیتە نێو پارێزگاری، تووش دەبی یان نا. دوای ئەوەش...

رامبێر گوتی:

ـ دوای ئەوە چی؟

دوای ئەوە تەنانەت من ئەگەر ئەو پشتگیرییەشت بدەمێ، هیچ سوودێکی بۆت نابێ.

ـ بۆچی؟

ـ لەبەر ئەوەی لەم شارەدا بە هەزاران کەس وەك تۆن و لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانن رێگەیان بدەن بچنە دەرێ.

ـ بەڵام ئەگەر ئەوانیش تاعوونیان نەبێ؟

ـ هەر ئەوەندە بەس نیە. دەزانم ئەم مەسەلەیە بێمانایە، بەڵام پێوەندیی بە هەموومانەوە هەیە. دەبێ شتەکە چۆنی هەیە، ئاوا قبووڵی بکەین.

ـ بەڵام خۆ من خەڵکی ئێرە نیم.

ـ بە داخەوە تۆش وەك هەموو ئەوانی دی، بوویتە خەڵکی ئێرە.

رامبێر هەڵچوو. گوتی:

ـ دڵنیات دەکەمەوە ئەمە مەسەلەیەکی مرۆییە. لەوانەیە تۆ لەوەی تێنەگەی کە دابڕان بۆ دوو کەس کە ئەوەندە پێکەوە هاوڕان، چ مانایەکی هەیە؟

ریڤۆ دەمودەست وەڵامی نەداوە. دوایی وتی پێم وایە تێ دەگەم. لە ناخی دڵەوە هیوای دەخواست رامبێر و ژنەکەی پێك بگەنەوە و ئەوانەی یەکتریان خۆش دەوێ، هەر هەموو پێك شاد و شوکر ببنەوە، بەڵام یاسا و رێسا لەگۆڕێ بوون، تاعوون لە گۆڕێ بوو، ئەم لەسەری بوو چ پێویستە ئەوە بکا.

رامبێر بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ نا، ئێوە تێناگەن. ئێوە بە زمانی بەڵگاندن قسان دەکەن. ئێوە دیلی خەیاڵەکانتانن.

دوکتۆر چاوی بڕییە پەیکەرەی کۆماری و گوتی: نازانم بە زمانی بەلگاندن قسان دەکەم یان نا، بەڵام ئەوەی روون و مسۆگەرە، بە زمانێکی روون و بێگرێ دەدوێم و ئەو دووانەش لەوانەیە جیاواز بن. رۆژنامەنووسەکە بۆینباخەکەی راستەوپاستە کرد و گوتی:

ـ دەی، بەو پێیە ئەمن دەبێ لە رێگەیەکی دیکەوە بگەمە ئەنجام.

ئینجا بە لەبزێکی شەڕانیەوە گوتی:

ـ بەڵام ئەمن لەو شارە دەچمە دەرێ.

دوکتۆر گوتی کە دیسانیش لە مەبەستەکەی تێ دەگا، بەڵام ئەو مەسەلەیە پێوەندیی بەوەوە نیە.

رامبێر لەنەکاو وەك برێشکە هەڵبەزییەوە و گوتی:

ـ بۆچی پێوەندیی بە تۆوە هەیە. ئەمن بۆیە هاتوومە ئێرە لەبەر ئەوەی پێیان گوتووم تۆ رۆڵێکی بەرچاوت لەو بڕیارانەدا هەیە کە دەدرێن. پێم وا بوو هەر نەبێ لە تاقە یەك شتدا، ئەوە لەبەرچاو مەگرە کە تێیدا بەشدار بووی، بەڵام ئەو مەسەلەیە بەلای تۆوە شتێکی وا نییە و تۆ مشووری کەس ناخۆی. تۆ حیساب بۆ ئەوانە ناکەی وا لێك دابڕاون.

ریڤۆ بۆی سەلماند کە لە لایەنێکەوە وایە. ئەو نەیویستووە ئەو مەسەلەیە لەبەر چاو بگرێ. رامبێر گوتی:

ـ ئەها، تێدەگەم. تۆ دەتەوێ باسی خزمەتی کۆمەڵ بکەی، بەڵام خێر و بەرژەوەندیی کۆمەڵ، لە بەختەوەریی یەك بە یەکی ئەوان پێك هاتووە.

دوکتۆر کە دەتگوت لە وڕی و گێژێتیەکەی هاتووەتە دەرێ گوتی:

ـ بەڵێ، ئەوەیە و شتێکی دیکەش. نابێ بڕیار بدەیت. تۆ لە هەڵە دای کە تووڕە دەبیت. ئەگەر تۆ بتەوێ خۆت لەو رووداوە دەرباز بکەی، ئەمن لە ناخی دڵمەوە شاد دەبم. ئەوەندەیە، هێندێ کار هەن پیشەکەم رێگەم نادا بیانکەم.

رامبێر بە وەڕەزیەوە سەری بۆ لەقاند و گوتی:

ـ بەڵێ، لە هەڵە دام تووڕە دەبم و بەو کارەم کاتێکی زۆرتان دەگرم.

ریڤۆ داوای لە رۆژنامەنووسەکە کرد لە رەوتی هەوڵەکانی ئاگاداری بکاتەوە و لێی دڵمەند نەبێ. بە دڵنیاییەوە نەخشەیەك هەبوو کە دەیانتوانی لەسەری رێك بکەون. رامبێر لە نەکاو دڕدۆنگ دیاربوو و، پاش برێك بێدەنگی گوتی:

ـ پێموایە. بەڵێ. بە پێی ئەوەی تۆ پێت وتم و بە قەناعەتی خۆشم پێم وایە.

پاش برێك دڕدۆنگی لێی زیاد کرد:

ـ بەڵام من ناتوانم قسەکانی تۆ بسەلمێنم.

کڵاوەکەی هێنایە نێوچاوانی و خێرا دوورکەوتەوە. ریڤۆ چاوی لێی بوو کە چووە نێو هوتێلی ژان تارۆ.

پاش ساتێك دوکتۆر سەری لەقاند. رۆژنامەنووس حەقی بوو بۆ گەیشتن بە بەختەوەری بێئۆقرە بێ، بەڵام ئاخۆ لەوەشدا حەقی بوو کە ریڤۆی تاوانبار دەکرد؟" ئێوە دیلی خەیاڵەکانتانن". ئاخۆ تێپەڕاندنی رۆژەکان لە نەخۆشخانەدا کە تاعوون تێیدا شەپۆلی دەدا و ژمارەی قوربانیەکانی لە حەوتوودا گەیاندبووە پێنسەت کەس، دەچووە خانەی خەیاڵاتەوە؟ بەڵێ لە چارەڕەشیدا بەشێك خەیاڵپڵاو و دووربوون لە راستی هەبوو، بەڵام کاتێك خەیاڵەکان دەست بە کوشتنت بکەن، دەبێ ئاوڕ لە خەیاڵاتیش بدەیتەوە. و ریڤۆ دەیزانی ئەم کارە ئەوەندەش سادە نیە. بۆ وێنە بەڕێوەبردنی ئەو نەخۆشخانە یارمەتیدەرەی خرابووە ئەستۆی وی ( ئێستا ببوونە سێ دانە) کارێکی ساکار نەبوو. لەو ژوورەدا کە بەسەر هۆڵی پشکنینی نەخۆشدا دەکرایەوە دیوێکیان تەرخان کردبوو، قوڵکەیەکیان تێدا کردبووە هەسێڵ(حەوز) و پڕیان کردبوو لە ئاوی (کرزیل)دار و لە نێوەڕاستەکەیەوە بە خشت دوورگەیەکیان ساز کردبوو. نەخۆشەکەیان دەگەیاندە ئەو دوورگەیە و بە خێرایی رووتیان دەکردەوە و جلەکانی دەکەوتنە نێو ئاوەکەوە و پاش شۆردنی نەخۆشەکە وشکیان دەکردەوە و کراسێکی زبری نەخۆشخانەیان لەبەر دەکرد و پاش ئەوەی ریڤۆ دەیپشکنی دەبردرایە یەکێك لە هۆڵەکانەوە. ناچار ببوون حەوشەی قوتابخانەیەك بۆ ئەم کارە تەرخان بکەن، کە پێنسەت قەرەوێڵەی تێدا جێ کرابۆوە و هەموویان گیرابوون. بەیانیان پاش وەرگرتنی نەخۆشەکان کە ریڤۆ خۆی بەسەریان رادەگەیشت و پاش دەرزی لێدان و قەڵاشتنەوەی کوانەکانیان ئامارێکی نوێی لێ دەگرتن و لە پاشان دەچووە سەردانەکانی دوانیوەڕوانی. ئەگەر لە کۆتایی

شەویشدا بوایە سەردانی نەخۆشەکانی هەر دەکرد و شەودرەنگان دەگەڕایەوە ماڵەکەی. شەوی پێشوو دایکی ئەو دەمەی تەلەگرامێکی مادام ریڤۆی دەدایە دەستی تێ گەیشتبوو کە دەستەکانی دوکتۆر دەلەرزن. خۆی دەیگوت:

ـ بەڵێ، بەڵام ئەگەر پشوودرێژتر بم هێندە بێ تاقەت نابم. بەهێز و خۆڕاگر بوو و هێشتا شەکەت نەببوو، بەڵام بۆ وێنە چاوپێکەوتنەکانی لێ ببوونە کێوێك. دەسنێشانکردنی "تا"ی تاعوونی، وای دەخواست بە خێرایی نەخۆشەکە لە ماڵەوە بەرنە دەرێ و ئەو دەمە بوو کە لە راستیدا خەیاڵاتی ریڤۆ و کێشەکانی کارەکەی دەستی پێ دەکرد. چونکە بنەماڵەی نەخۆشەکە دەیانزانی چ چاك بێتەوە و چ بمرێ ئیتر چاویان پێی ناکەوێتەوە. مادام لۆرێ دایکی ئەو کارەکەرەی لە هوتێلی تارۆ کاری دەکرد دەیگوت: "بەزەییت بێ دوکتۆر!" ئەم قسەیە چ مانایەکی هەبوو؟ دیارە دوکتۆر بەبەزەیی بوو، بەڵام ئەم بەزەییە هیچ گرێ کوێرەیەکی بۆ کەس نەدەکردەوە. ئەو ناچار بوو تەلەفۆن بکا. ئێستا نا ئێستا، لوورەی ئامبولانس بەرز دەبۆوە. لە پێشدا دەروجیران پەنجەرەکانیان دەخستە سەر پشت و دەیانڕوانی. دوایی بە پەلە دایاندەخستنەوە. ئەو کات مقۆمقۆ و پێداگری و بە کورتی خەیاڵات دەستیان پێ دەکردەوە. لەو ئاپارتمانانەدا کە "تا " و دڵەڕاوکێ گریان دابوون، دیمەنەکانی شێتی بەڕێوە بوون.

یەکەمین جارەکان تەنیا تەلەفۆنێکی بەس بوو و، پاشان بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی گەیشتنی ئامبولانس بێ، بەرەو نەخۆشەکان وەڕێ دەکەوت، بەڵام خزم و کەسی نەخۆش لەڕێوە دەرگای ماڵەکەیان دادەخست و بە تەنیا مانەوەیان لەگەڵ تاعووندا پێ باشتر بوو لەو دابڕانەی دەیانزانی بە کوێ دەگا. هاوارەکان، یاسای لێبڕاوانە، دەستێوەردانی پۆلیس و، بە کورتی بە زەبری هێزی سەربازی نەخۆشەکەیان بە زۆرەملێ دەبرد.

لە یەکەم حەوتووەکاندا، ریڤۆ ناچار ببوو هەتا گەیشتنی ئامبولانس راوەستێ. دواتر کە هەر پزیشکێك لەگەڵ لێکۆڵەرێکدا دەچووە سەردانی نەخۆشەکە، ریڤۆ توانیی لە ماڵی نەخۆشێکەوە بۆ ماڵی نەخۆشێکی دیکە رابکا، بەڵام لە سەرەتادا هەموو شەوەکان وەکوو ئەم شەوە بوو وا کاتێك ئاپارتمانەکە بە باوەشێن و گوڵە دەسکردەکانی مادام لۆرێ رازایەوە، دایکی نەخۆش بە بزەیەکی زۆرەملێ پێشوازیی لێکرد و گوتی:

ـ هیوادارم لەو تایە نەبێ وا خەڵك باسی دەکەن. و ریڤۆ کە سەرچەفە و بن کراسەکەی لادابوو، لە نێو بێ دەنگیدا سەیری پەڵەی سووری خوێنی لەسەر زگ و رانەکانی و ئاوسانی لووەکانی دەکرد. دایکە سەیری نێوگەڵی (نێوان لاقەکانی) کچەکەی دەکرد و بێ ئیختیار هاواری دەکرد. هەموو شەوێ، دایکەکان بەو جۆرە بە حاڵەتێکی نەناسراوەوە، لە بەرامبەر ئەو زگانەی بە هەموو نیشانە مەرگاوییەکانیانەوە لەبەر چاویان بوون، دەنووزانەوە. هەموو شەوان، دەستەکان لە باهۆکانی ریڤۆ دەهاڵان و قسەی بێ سوود و گفت و بەڵێن و گریان بە شوێن یەکتریدا دەهاتن و هەموو شەوان لوورەی ئامبولانس کە قەیرانیگەلێکی هێندەی بێهوودەیی ئازارەکانی دەخولقاند و لە کۆتایی ئەو زنجیرە شەوانەدا کە هەمووان لێك دەچوون، ریڤۆ نەیدەتـوانی جگە لە زنجیرەی دووردرێژی کۆمەڵە دیمەنێکی دیکەی وەك یەك کە بێ برانەوە دووپاتە دەبوونەوە، چاوەڕوانیەکی دیکەی هەبێ. بەڵێ تاعوون وەك خەیاڵەکانی ئەو یەکرەنگ بوو. لەوانەبوو یەك شت بگۆڕدرێ و ئەویش ریڤۆ خۆی بوو. ئەو شەوە لە بەردەم پەیکەرەی کۆماریدا دەیڕوانیە دەرگای هۆتێلەکە، کە رامبێر لەو دیویەوە لە چاوان ون ببوو و تەنیا ئاگاداری ئەو خەمساردییە کارلێنەکراوەی دەروونی بوو.

پاش ئەو حەوتووە پڕ لە شەکەتی و ماندووییەتیانە، دوای تەواوی ئەو زەردەپەڕانەی کە شار خەڵکەکەی خۆی بە کۆڵانەکان وەردەکرد بۆ ئەوەی لە خۆڕایی تێیدا بسووڕێنەوە ریڤۆ دەیزانی ئیتر شتێك نیە خۆی لە بەزەیی ببوێرێ. کاتێك بەزەیی بێ کەڵك دەبێ، مرۆڤ لە بەزەییش ماندوو دەبێ. و دکتۆر لە هەژانێکی دەروونیدا کە وردە وردە دەچووە قاوغی خۆیەوە، تاقانە هیوا و ئۆخژنی ئەو رۆژە تێکشکێنەرانەی دەدۆزییەوە. دەیزانی بەو شێوەیە ئەرکی سەر شانی سووکتر دەبێ. هەر بۆیەش پێی خۆشحاڵ دەبوو. کاتێك سەعات دوو و نیوی نیوەشەوێ دایکی بە پیریەوە دەهات لە نیگای بۆش و ساردی ئەو خەم دای دەگرت و دڵی بەو تاقانە ئۆخژنە دەسووتا کە لەو رۆژانەدا بە ریڤۆ دەبڕا. بۆ شەڕ لەگەڵ خەیالات دەبێ تاڕادەیەك وەکوو ئەوان بچی، بەڵام رامبێر چۆن دەیتوانی هەست بەوە بکا؟ خەیاڵەکانی ریڤۆ بە لای رامبێرەوە هەموو ئەو شتانە بوون کە لەگەڵ بەختەوەریی ئەو ناتەبا بوون. و لە راستیدا ریڤۆ دەیزانی رۆژنامەنووسەکە لە لایەکەوە حەقیەتی، بەڵام ئەوەشی دەزانی کە جاری وایە خەیاڵات لە بەختەوەرییەکان بەهێزتر دێنە پێشێ و لەو کاتەدا تەنیا لەو کاتەدا دەبێ حیساب بۆ ئەویش بکەیت. رامبێریش بە ناچار لەگەڵ وەها

شتێك بەرەوڕوو دەبوو و دوكتۆر بە هۆی ئەو شتانەی رامبێر دواتر لای ئەو دانی پێدا هێنان، توانیی بە هەموو وردەكارییەكانیەوە لەو شتە تێبگا. بەو جۆرە توانیی لە روانگەیەكی نوێوە لەو ململانێ خەفەتهێنەرە بڕوانێ وا لە نێوان بەختەوەریی هەر تاكێك و كۆی خەیاڵەكانی پەتای تاعووندا كە لەو دەمەوە ژیانی شارەكەی ئێمەی داگرتبوو، هەیە.

بەڵام لەوێ كە هێندێ كەس گشتیبوونی خەیاڵە زەینیەكانیان دەدی، هێندێكی تر حەقیقەتیان بەدی دەكرد. كۆتایی یەكەمین مانگی تاعوون بە هۆی تەوژمی دیاری پەتاكە و ئامۆژگارییەكی توندی پێرپانیلۆ قەشەی یەسووعی كە لەسەرەتای نەخۆش كەوتنەكەیدا یارمەتیی میشێلی پیری دابوو لێڵتر بوو. پێرپانیلۆ بە هۆی ئەو هاوكارییە لەرادەبەدەرانەی كە لە مێژ بوو لەگەڵ ئاژانسی دامەزراوەی جۆگرافیایی ئۆران هەیبوو و هەروەها بەو سروودە ئایینیانەی خوێندبوونیەوە ناوبانگی دەركردبوو، بەڵام بە پێشكەشكردنی زنجیرە وتارێك لەسەر تاكگەرایی نوێ، زۆر لە پسپۆڕێك زیاتر بیسەری بۆ خۆی پەیدا كردبوو. پێرپانیلۆ لەم وتارانەدا ببووە بەرگریكەرێكی تۆخی مەسیحییەت كە هەم لە پووچی و بێكەڵكیی ئەمڕۆ و هەمیش لەكۆنەپەرستیی سەدەكانی رابردوو بەدوور بوو. بەو بۆنەوە، بەمەبەستی ئەوەی راستییەكان بخاتە مێشكی بیسەرەكانیەوە قسەی كردبوو و ناوبانگەكەشی هەر لەو سۆنگەیەوە بوو.

كورتی ببڕینەوە، لە كۆتایی ئەو مانگەدا، بەرپرسانی كڵێسەی شارەكەی ئێمە بڕیاریان دا بە پشتبەستن بە تواناكانی خۆیان لەبەرامبەر تاعووندا راوەستن و حەوتووەكیان بۆ نزای گشتی تەرخان كرد. ئەو رێوڕەسمی نزا و پاڕانەوەو رازونیازە گشتییە دەبوایە رۆژی یەكشەممە بە یارمەتیوەرگرتن لە سەنرۆش پیرۆزی تاعوونلێدراو كۆتایی پێ بێ. بەو بۆنەوە داوا لە پێرپانیلۆ كرابوو هەودای قسەكردنەكە بەدەستەوە بگرێ. لە پازدە رۆژ لەوە پێشەوە قەشە ناچار ببوو كاروبارەكەی خۆی لە (سەنت ئاوگوستین) و كڵێسەی ئەفریقاییدا كە پێگە و دەرفەتێكی تایبەتی بۆ وی رەخساندبوو وەلاوە بنێ. ئەو كە میزاجێكی پڕ كەفوكوڵ و هەژاوی بوو، لێبڕاوانە ئەو ئەركەی وە ئەستۆ گرت كە پێیان سپاردبوو. زۆر پێش ئەو ئامۆژگارییە لە شاردا باسیان دەكرد و ئەم وتارە یەكێكە لە رووداوە بەرچاوەكانی مێژووی ئەو قۆناغە.

ژمارەیەکی زۆر بە پیر حەوتووی پاڕانەوەو نزاوە چوون. نەك لەبەر ئەوەی خەڵکی ئۆران لە ڕۆژە ئاساییەکانیشدا خەڵکێکی ئیماندار بووبێتن. بۆ وێنە یەکشەموان مەلەکردن لە دەریادا بە خەنیمێکی گەورەی ئایینی کڵێسا لەقەڵەم دەدرا. نەدەکرا بشڵێی کە لە نەکاو نووری ئیمان و باوەڕ تیرۆژی خستۆتە دڵیانەوە، بەڵام لە لایەکەوە لەبەر ئەوەیکە شار داخرابوو و چوون بۆ بەندەر قەدەغە بوو، ئیتر ڕێگە نەبوو بۆ مەلەکردن لە دەریادا و لە لایەکی دیکەشەوە ئەوان کەوتبوونە ڕەوشێکی دەروونیی تایبەتییەوە کە هەرچەندە لە ناخی دڵیانەوە ئەو ڕووداوە سرووشتیانەی بە سەریان دەهات ملیان بۆ ئەوە ڕاکێشابوو، بەڵام بە ڕوونی دەیانبینی کە شتێك گۆڕاوە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر کەس چاوەڕوان بوون کە پەتاکە ببڕێتەوە و ئەوان و بنەماڵەکەیان ڕزگار بن. بەو پێیە هێشتا خۆیانیان بۆ هیچ کارێك ناچار نەدەکرد. تاعوون بۆ هەموان شتێکی داسەپاوی بێزارکەر بوو کە دەبوایە ڕۆژێك باروبنەی بپێچێتەوە. هەرچەندە تۆقیبوون، بەڵام هیوابڕاو نەبوون و هێشتا وای لێ نەهاتبوو تاعوون ببێتە بیچم و شێوەیەك لە ژیانی ئەوانی و ئیتر ئەوان ئەو شێوە ژیانەیان لە بیر بچێتەوە کە بەر لە هاتنی ئەو (تاعوونەکە) هەیانبوو. بە کورتی، لە چاوەڕوانیدا دەژیان. لە بەرامبەر ئایینەکاندا، هەر وەك زۆربەی مەسەلەکانی دیکە، تاعوون حاڵەتێکی دەروونیی تایبەتی پێ بەخشیبوون کە هەم لە خەم ساردی و هەمیش لە کەفوکوڵ بەدوور بوو و دەکرا ناوی خۆ لێ گێلکردنی لێ بنرێ. زۆربەی ئەوانەی بەشداری حەوتووی پاڕانەوە بوون دەیانتوانی لە زمانی خۆیانەوە یەکێك لەو ڕستانە بڵێنەوە کە یەکێك لە ئیماندارەکان بە ریڤۆی گوت:" بە هەر شێوەیەك ئەم پەتایە ناتوانێ زیانێك بگەیەنێ." تارۆ خۆیشی پاش ئەوەی یادداشتەکانی شیی دەکاتەوە، چینیەکان لەوەها کات‌وساتێکدا لە بەرامبەر پەریی تاعووندا تەپڵیان لێ دەدا، ڕای خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ بەدڵنیاییەوە ناتوانین لەوە دڵنیا بین کە لە ڕاستیدا تەپڵی گەورە لە تەگبیر و پێشگیرییەکان کاریگەرترە یان نا؟ تەنیا ئەوەندەی لێ زیاد دەکا کە بۆ کۆتاییهێنان بەو باسە پێویست دەبێ لە پێشدا بزانین ئاخۆ "پەریی تاعوون" هەر لە گۆڕێیە یان نا؟ چونکە نەبوونی زانیاریمان لەسەر ئەم مەسەلەیە، هەموو ئەو باوەڕانەمان پووچەڵ دەکاتەوە کە دەکرێ لەم بارەیەوە هەمانبێ.

بە گشتی دەکرێ بڵێین کلێسەی شارەکەمان بە درێژایی حەوتوو پڕ بوو لە خەڵکی ئیماندار. لە یەکەمین ڕۆژەکاندا زۆربەی خەڵکی، لە باغاتی خورما و هەناردا کە لە بەردەم پێشخانەکەوە بە ریز چێنرابوون رادەوەستان و گوێیان لە شەپۆلی نزا و پاڕانەوە رادەگرت کە دەگەیشتە کۆڵانەکان. وردە وردە ئەم گوێدێرانەش بە چاولێکەری لەوانی دیکە چوونە ژوورەوە و بە دەنگی شەرمنانەیان دەبوونە هاودەنگییان و یەکشەممە جەماوەرێکی زۆر کلێسەیان پڕ کرد و تەنانەت لە پێشخانە و دوایین پلیکانەکانیش خەڵك راوەستابوون. لە شەوی پێشوەوە ئاسمان رەش داگەڕا بوو و باران بە غورەم دەباری. ئەوانەی لە درەوە راوەستابوون چەترەکانیان هەڵدابوو. کاتێك پێرپانیلۆ چووە سەر مینبەر، بۆنی بخور و پەڕۆی تەڕ کلێسەی تەنیبۆوە.

ئەو کابرایەکی مامناوەندی، بەڵام قەڵەوە بوو. کاتێك پاڵی وەقەراغی مێزەکەوە دا و چێوی قەراغەکەی لە نێوان دەستە زلەکانیدا رێك گوشی، تەنیا لە شتێکی خڕی رەش دەچوو کە کوڵمەسوورەکانی کەوتبووە ژێر چاویلکە چوارچێوە پۆڵایینەکەیەوە. دەنگێکی زل و پڕ کەفوکوڵی هەبوو کە لە دوورەوە دەبیسرا و کاتێك بە رستەیەکی تاڵ و ناخۆش پەلاماری خەڵکەکەی دا و گوتی:" برایان، بەڵاتان لێ باریوە و نەهامەتی بەرۆکتانی گرتووە، براکانم، ئێوە شیاوی ئەوە بوون." مقۆمقۆیەك کەوتە نێو خەڵکەوە و هەتا بەرهەیوانەکە چوو.

بە پێی عەقڵ نەدەبوایە وتارەکە هەر لەسەر ئەو پێشەکییە هەژێنەرە بڕوات. درێژەی وتارەکە خەڵکەکەی ئێمەی تێگەیاند لەوەی قەشەکە بەو کارامەییەی لە کاری وتارداندا هەیبوو، لەنەکاو وەك زەبرێکی وەشاندبێ قسەی دڵی خۆی کردووە. پانیلۆ دەمودەست پاش ئەو رستەیە دەقی "سفری وەدەرکەوتنی" لەسەر تاعوونەکەی میسر خوێندەوە و گوتی:"کاتێ بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا ئەو بەڵایە نازڵ دەبێ، بۆ سزادانی دوژمنانی خودایە. فیرعەون دژی بڕیارەکانی خودا رادەوەستێ و ئیتر تاعوون بە چۆکی دادێنێ. هەر لەو رێکەوتەوە بەڵای خودایی، کەسانی یاخی و دڵ کوێر لەبەردەم ئەودا دەخاتە سەرچۆك. لەم بارەیەوە بیر بکەنەوە و چۆك دادەن."

لە دەرێ باران وەك گۆزەی سەرەوبن دەهاتە خوارێ و ئەم رستەیەی دوایی کە لە نێو بێدەنگییەکی قووڵ و بێسنوورەوە دەربڕابوو، بێدەنگییەك کە بارانی سەر جامی پەنجەرەکە

قوولتری دەکردەوە، بە لەبزێکەوە دەنگی دایەوە کە چەند کەس لە بیسەران پاش چرکەیەك گومان و دڕدۆنگی لەسەر کورسییەکەیانەوە بەرەو کورسیی پاڕانەوە وەرسووڕان، ئەوانی تریش پێیان وابوو هەر دەبێ وا بکەن، شێوەیەك کە وردە وردە زۆر بەبێدەنگی، جگە لە دەنگی جوولەی چەند کورسییەك، ئەوی بیستبووی کڕنۆشی برد. ئینجا پانیلۆ راست بۆوە. پشوویەکی قوولی هەلکێشا و بە لەبزێکەوە کە جاربەجار توندتر دەبوو گوتی:" ئەگەر ئەمڕۆ تاعوون رووی لە ئێوە کردووە لەبەر ئەوەیە کات و ساتی بیرکردنەوە گەیوە. ئەوانەی ئاکار و کردەوەیان باشە، نابێ لەو بەلایە بترسن، بەلام خراپەکاران حەقیانە نۆبەتێ بیانگرێ. لە کادێنی هەراوی جیهاندا بەلای بێ ئامان گولە گەنمی مرۆیی دەهاڕێ، هەتا ئەو جێگەی کە "دان" و "کا" لێك جوێ دەبێتەوە. کا لە دان زیاتر دەبێ و پالێوراوانی سزادان پتر لە هەلبژێردراوەکانن. ئەم بەلایە ویستی خودا نەبوو. بۆ ماوەیەکی زۆر دوورودرێژ ئەم جیهانە ئاوێتەی خراپە بووە و ماوەی دوورودرێژتریش لە ئەمانی دلۆڤانیی خودادا بووە. تەنیا تۆبەیەك بەس بوو و رێگەش بۆ هەمووان ئاوەلا بوو و هەموو خۆیان لەوە بەهێزتر دەبینی کە پێویستییان بە پاڕانەوە بێ. هەموو کەسێك دلنیا بوو لەوەی لە کاتی خۆیدا تۆبەی دەکا. جارێ لە هەمووی ئاسانتر ئەوە بوو کە بە رێگەی خۆیاندا بڕۆن و ئەوی دیکەی بە بەزەیی خوا بسپێرن، بەلام بەردەوامبوونی ئەو رەوشە مەحال بوو. خودا کە بۆ ماوەیەکی وەها دوورودرێژ بەزەیی خۆی بەسەر ئەو شارەدا باراندبوو، ئێستێ کە لە چاوەڕوانی وەڕەز بووە و بەرهەمێکی لە هیوا درێژخایەنەکەی خۆی وەرنەگرتووە رووی خۆی لێ وەرگێڕاوین. ئێمە کە لە نووری خودا بێبەریی بووین، بۆ ماوەیەکی زۆر لە تاریکەسەلاتدا دەمێنینەوە."

لە تەلاری کلیسدا یەکێك وەك ئەسپی بێ ئۆقرە هانکەهانکی بوو. قەشە پاش بێدەنگییەکی کورت بە لەبزێکی هێورتر درێژەی بە قسەکانی دا:" لە بەسەرهاتی زێڕینی پیاوچاکاندا هاتووە، لە سەردەمی پادشایەتیی هومبێرتدا لە لیمباردی، ئیتالیا تووشی تاعوونێکی وا هات کە زیندووەکان بەشی ناشتنی مردووەکانیان نەدەکرد و ئەو تاعوونە بە تایبەتی لە رۆم و پاویا قوولەی دەکرد، لەو دەمەدا فریشتەیەکی خێر و چاکە لە پڕ دەرکەوت. ئەو فریشتەیە فەرمانی دا

بە فریشتەی شەڕ و خراپە کە نێزەیەکی بەدەستەوە بوو، بە نێزەکەی لە دەرگای ماڵان بدا. هەرچەند زەبرێکی وەدەرگای ماڵان دەکەوت، ئەوەندە مردووی لێ دەهات دەرێ."

لێرەدا پانیلۆ دەستەکانی خۆی بەرەو دەرگای هەیوانی کلێسە درێژ کردەوە، دەتگوت لەو دیو پەردەی بەجووڵەی بارانەوە شتێك نیشانی خەڵك دەدا. بە دەنگێکی بەهێز گوتی:" برایان، هەر ئەو راوە مەرگهێنەرەیە کە ئێستا لە کۆڵانەکانی ئێمەدا لەگەڕ دایە. سەیر کەن ئەو فریشتەی تاعوونە کە وەك ئیبلیس جوانە و وەك خودی شەڕ درەوشاوەیە لەسەر سەربانەکانتان قوت بۆتەوە و نێزەی سووری بە دەستی راستییەوە لەسەر تەپڵی سەری راگرتووە و دەستی چەپی بەرەو یەکێك لە ماڵەکانی ئێوە راداشتووە. لەوانەیە لەو ساتەدا دەستی بەرەو ماڵی تۆ راداشتبێ و نێزەکەی گرمە لە لاشیپانی دەرگاکە هەستێنێ. هەر لەو کاتەدا تاعوون دەخزێتە نێو ماڵەکەتەوە و لە ژوورەکەی تۆدا چاوەڕێی هاتنەوەت دەبێ. لەوییە، لەسەرخۆ و چاوەڕوان و دڵنیا وەکوو سیستەمی دنیا. هیچ هێزێکی زەوینی و تەنانەت جوان و دڵنیا بن زانستی بێهوودەی مرۆییش ناتوانێ ئێوە لەو دەستە رزگار بکا کە بەرەو ئێوەی راداشتووە و ئێوە لە خەرمانی خوێناویی ئازاردا جەنجەڕ کراون و لەگەڵ کا و قەسەڵ تووڕ دەدەرێن."

قەشە لێرەدا، بە رەوانتر درێژەی بە وێناکردنی وێنەی هەژێنەری بەڵاکە دا. لەتە دارێکی زلی هێنانە بەرچاو کە بەسەر شاردا دەسووڕێتەوە و زەبرێکی بە رێکەوت دەوەشێنێ و خوێن هەڵدەستێ و " بۆ ئەو تۆوچاندنەی کە حەقیقەتی لێ شین دەبێتەوە" خوێن و ئازارێکی زیاتر بە وڵات وەردەکا.

پاش ئەو قۆناغە دووردرێژە، پێرپانیلۆ بێدەنگ بوو. قژی سەری رژابوونە سەر تەوێڵی و جەستەی وا دەلەرزی کە لە دەستەکانیەوە گوازرایەوە بۆ مینبەرەکە. دوایی بە دەنگێکی لێڵتر، بەڵام بە لەبزێکی بوختانکەرانەوە لەسەر باسەکە رۆیشت:" بەڵێ کاتی بیرکردنەوە هاتووە. ئێوە پێتان وایە هەر ئەوەندە بەسە کە رۆژانی یەکشەمووان بێنە زیارەتی خودا و رۆژەکانی دیکە ئازاد بن. ئێوە پێتان وایە چەند کرنۆش و زمان چەورییەك، خەمساردیی جینایەتکارانەتان قەرەبوو دەکاتەوە، بەڵام خودا چاوەڕوانیی کەمی لێتان نیە. ئەو دیویست زیاتر بتانبینێ ،ئەو ئاوای خۆش دەوێن و ئەگەر راستیتان دەوێ، تاقانە رێگەی خوشویستن

ئاوایە. هەر بۆیەش کاتێك لە چاوەڕوانی هاتنی ئێوەدا بەرەو ئەو، ماندوو بوو تاعوونی بەردا کە بۆتان بێ، هەروەك لەسەرەتای مێژووی مرۆڤایەتییەوە بەرەو هەمووو شارە گوناحبارەکان چووبوو. ئێستا ئێوە لە گوناح ئاگادارن. هەر وەك قابیل و کوڕەکانی و مرۆڤەکانی بەر لە تۆفانی نووح و خەڵکی سدوم و عەموورە و فێرعەون و ئەیوب و هەموو خراپەکارانی دیکەش ئاگاداری بوون و لەو رۆژەوە ئەم شارە دیوارەکانی بە دەوری ئێوە و بەڵاکەدا هەڵچنیوە و ئێوەش هەر وەك ئەوان، بە روانگەیەکی نوێ لە هەموو بوونەوەران و شتەکان دەڕوانن. بەهەر حاڵ ئێستا ئێوە دەزانن کە دەبێ بگەڕێنەوە سەر بنچینەکە."

بایەکی شێدار لە ژێر میچی کلێسە دەگەڕا. بڵێسەی مۆمەکان بە چزەچز نوشتانەوە. بۆنی خەستی مۆم و دەنگی کۆکە و پشمینەکان بەرەو پێرپانیلۆ چوو و ئەویش بە شارەزاییەکی شیاوی تاریف کردنەوە گەڕایەوە سەر باسەکەی و بە لەبزێکی هێمنەوە درێژەی بە باسەکەی دا:" دەزانم ژمارەیەکی زۆرتان گەرەکیانە بزانن ئەمن دەمەوێ بە چ درەنجامێك بگەم. ئەمن دەمەوێ بەرەو حەقیقەت رێنوێنیتان بکەم و فێرتان بکەم وێڕای تەواوی ئەوانەی گوتم شاد بژین. ئیتر کاتی وەی نیە ئامۆژگاری یا دەستێکی برایانە بەرەو چاکە پاڵتان پێوەبنێ. هەنووکە حەقیقەت بەسەر هەموو شتەکاندا زاڵە. رێگەی رزگاریش ئەوا نێزەیەکی سوورە کە نیشانتانی دەدا و ئێوە بەرەو ئەوێ پەلکێش دەکا. لێرەدایە ئەی براکانی من، ئەلێرە دایە کە دەرەنجامی بەزەیی و بەخشینی خوایی دەردەکەوێ، کە لە هەموو شتێکدا چاکە و خراپە و تووڕەیی و بەزەیی و تاعوون و رزگاریی داناوە. ئەم بەڵایەش دەتانهاڕێ و پەرەوەردەتان دەکات و رێگەتان نیشان دەدا.

"زۆر لەمەوبەر مەسیحییەکانی حەبەشە تاعوونیان بە ئامرازی گەیشتن بە نەمری دەزانی و پێیان وابوو لە لایەن خواوەیە. ئەوانەی گیرۆدەی نەببوون خۆیان لە پەڕۆوپاڵی تاعوونلێدراوەکانەوە دەپێچایەوە بۆ ئەوەی مسۆگەر بمرن. بێگومان نابێ ئەم کەفوکوڵ و خولیای رزگاربوونە بکەینە رێبازی خۆمان. ئەوە پەلەیەکی جێگەی داخ و کەسەرە کە لە غەرەیی و لووتبەرزییەوە نزیکە. نابێ لە خودا بەپەلەتر بین و هەر کەسێکی پێی وابێ دەتوانێ وەپێش ئەو چارەنووسە نەگۆڕەی خودا بۆ جارێك و بۆ هەمیشە دایناوە بکەوێ، بەهەڵە و لاڕێدا دەچێ، بەڵام لانیکەم ئەو نموونەیە دەرسێکی لە خۆیدا

هەڵگرتووە. لە نێو ئێمەدا بەها و بایەخی نووری دڵخوازی ئەبەدییەت کە لە ناخی هەموو ئازارێك دایە، تەنیا بۆ ئەو مێشکانە دەردەخات کە گەشبینترن. ئەو نوورە ڕێگەکانی بەرەبەیانی کە بەرەو رزگاریی دەڕۆن، ڕووناك دەکاتەوە. ویستی خودایی دەردەخات کە بە بێ هیچ لاوازییەك خراپە دەکاتە چاکە. ئەمڕۆش لە ڕێگەی ئەم ڕێپێوانەی مەرگ و دڵەڕاوکێ و هاوارەوە ئێمە بەرەو بێدەنگیی سەرەتا و بەرەو بنەمای هەر چەشنە ژیانێك ڕێنوێنی دەکا. ئەوە بوو براکانم، ئەو ئۆخژنە مەزنەی کە ئەمن دەمویست بۆ ئێوەی دەستەبەر بکەم، بۆ ئەوەی ئێوە تەنیا بەو قسانەوە لێرە نەڕۆن کە باسی سزادان دەکەن، بەڵکو قسەی لەو جۆرەشتان پێ بن کە هێمنی و ئۆخژنتان پێ دەبەخشن."

وێدەچوو پانیلۆ ئامۆژگارییەکانی خۆی تەواو کردبێ. لە دەرێ باران خۆشی کردبۆوە و ئاسمانی گورگەزێ تیشکێکی تازەتری بەسەر گۆڕەپانەکەدا دەپژاند. لە کۆڵاندا دەنگی قسە و کەرەسەی هاتوچۆ و هەموو جۆرە زمانێکی شارێکی وەخەبەرهاتوو دەبیسرا. بیسەران سەرەڕای وڕ و کاس بوونیان بە دزییەوە خۆیان توندوتۆڵ دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا قەشە دەستی بە قسە کردەوە و گوتی پاش نیشاندانی سەرچاوەی خوایی تاعوون و لایەنی سەرکۆنەیی ئەم بەڵایە، کۆتایی بە قسەکانی خۆی هێناوە و نەیویستووە لە سەر وەها بابەتێکی خەفەتهێنەر، بۆ ئاکامۆەرگرتن لە قسەکانی خۆی پشت بە ڕەوانبێژییەکی بێجێ ببەستێ. پێی وایە دەبێ هەموو شتێك بۆ هەموان روون بێتەوە. تەنیا ئەوەی بیر هێنایەوە کە لە سۆنگەی تاعوونی گەورەی "مارسی"دا مێژوونووسێك بە ناوی "Matieu Marais" سکاڵای کردووە لەوەی لە دۆزەخێکی سەرەونخوونکراودا بە بێ پشتوپەنا و بێ هیوا دەژی. بەڵێ! ماتیۆ ماریێ دڵ کوێر بوو، بە پێچەوانەوە هیچکات پێرپانیلۆ هێندەی ئەمڕۆی هەستی بە یارمەتیی خودا و ئەو هیوایە نەکردووە وا بە مەسیحیەتی بەخشیوە. ئەو لەگەڵ هەر هیوایەکدا دیسانیش هیوادار بوو خەڵکی شارەکەمان سەرەڕای سامناکبوونی ئەو ڕۆژانە و هاوار و نووزەی نیوەزیندووان لەگەڵ تاقانە قسەیەکی کە باسی مەسیحیەت و ئەوینی خوداییە ڕوو لە ئاسمان دەکەن. ئەویتر هەمووی بە دەستی خودایە.

## (٢)

ئەستەمە بتوانین بڵێین ئەو ئامۆژگارییە کاریگەریی لەسەر هاووڵاتیانی ئێمە هەبوو ئان نا؟ ئۆسۆن ئەفەنیی لێکۆڵەر بە دوکتۆر ریڤۆی گوت، بە رای ئەو بێ ئەملاوئەولا وتارەکەی پێرپانیلۆ بۆ ئەوە نابێ رەتی بکەیتەوە، بەڵام هەمووان وەها باوەڕێکی روون و راشکاوانەیان نەبوو. ئامۆژگارییەکە تەنیا بۆ هێندێ کەس ئەو بۆچوون و باوەڕەی هەتا ئەو رۆژە بە لێڵی مابۆوە روون کردەوە، کە ئەوان بە تاوانی جینایەتێکی ناروون و نادیار تووشی وەها دیلێتییەکی دوور لە چاوەڕوانی هاتوون و، ئەو کات کە هێندێ کەس بەردەوام بوون لەسەر ژیانی سووك و چرووکی خۆیان و خوویان بە دوورەپەرێزی دەگرت، بە پێچەوانەوە، لەوە بەدواوە تاقە بیر و هزری ئەوانیتر راکردن لەو بەندیخانەیە بوو.

خەڵك لەسەرەتادا ئەوەیان قبوول کردبوو کە پێوەندییان لەگەڵ دنیای دەرەوەدا بپسێندرێ، هەروەك چۆن ملیان بۆ زۆربەی ئەو کێشە تێژتێپەڕانە رادەکێشا کە تەنیا چەتی لە عادەت و خووی رۆژانەیان دەخست*، بەڵام کتوپڕ بە هەستکردن بە جۆرە بەندکرانێك لە ژێر میچی ئاسمانێکدا کە گەرمای هاوین وردەوردە وێکی دێنا، بە شێوەیەکی ناڕوون هەستیان دەکرد ئەو تەریککەوتنەوەیە هەڕەشە لە ژیانیان دەکا و، کە شەویش دادەهات ئەو وزەیەی لە فێنکایی هەوا وەریاندەگرت، جاروبارە تووشی کۆمەڵێك کاری هیوابڕاوانەی دەکردن.

---

* چەت تێخستن: واتە لەمپەرسازکردنی بە ئانقەست. لەباربردنی هەوڵێك بە ئانقەست.

لە پێشدا دیار نیە بە ڕێکەوت بوو یان نا، هەر لەو یەکشەممەیەوە لە شاری ئێمەدا ترسەکە تەشەنای کرد و زۆر قوولّ بۆوە، بە جۆرێك کە دەکرا بلّێی خەلّکی شارەکەی ئێمە بە ڕاستی تێگەیون چییان لیّ قەوماوە. لەو ڕووەوە کەشی شارەکەی ئێمە بڕێك گۆڕا، بەلاّم لە ڕاستیدا ئەو گۆڕانە لە شارەکەی ئێمەدا بوو یا لە دلّی خەلّکەکەدا؟ مەسەلە ئەوە بوو.

چەند ڕۆژێك دوای ئامۆژگارییەکە، ریڤۆ کە لەگەلّ گرانت بەرەو گەڕەکەکانی دەرەوەی شار دەڕۆیشت و لەسەر ئەو مەسەلەیە قسەی لەگەلّ دەکرد، لە ناخی تاریکەشەودا تووشی کابرایەك بوو کە لە بەرامبەریاندا، بەبیّ ئەوەی بیەویّ ببزویّ، دەخولایەوە. لەم ساتەدا چراکانی شار کە جاربەجار درەنگتر دادەگیرسان دەستیان کرد بە نوور پژاندن. ئەو چرا بەرزەی کەوتبووە پشتیانەوە لە نەکاو ئەو کابرایەی دەرخست کە بە چاوی بەستراوەوە لەبەرخۆیەوە پێدەکەنی و دەتریقایەوە. سەروچاوی هەلّبزرکاوی کە بە هۆی نەشەبوونێکی وڕانەوە، لەبەریەك کشابۆوە شەتلّی ئارەقە ببوو. گرانت گوتی:

ـ شێتە.

ریڤۆ قۆلّی گرت بۆوەی بە دوای خۆیدا ڕایکێشیّ و هەستی کرد کارمەندەکەی شارەوانی وا هەژاوە دەلەرزیّ. ریڤۆ گوتی:

ـ زۆری پیّناچیّ لە نێو دیوارەکانی شارەکەماندا، لە شێت زیاتر هیچ نابینی.

لە شەکەتییان هەستی دەکرد گەرووی وشك بووە.

ـ با شتێك بخۆین.

چوونە نێو کافتریایەکی بچووك کە تەنیا بە گلۆپێك بەرهەیوانەکەی ڕووناك کرابۆوە و لە کەشە خەستەکەیدا کە سوور دەچۆوە، خەلّك بەبیّ هیچ هۆیەك بە دەنگێکی نزم قسەیان دەکرد. لەبەردەم هەیوانەکەوە و لە بەرامبەر چاوانی بە مۆلّەق وەستاوی دوکتۆردا داوای خواردنەوەیەکی کرد کە یەك بین هەلّیقوڕاند و گوتی زۆر بەهێز بوو. ئەوجار ویستی وەدەر کەون. ریڤۆ لە دەریّ پیّی وابوو شەو دارمالّە لە نووزە و نالّە. لە گۆشەیەکی ئاسمانی تاریکدا لە سەرووی چراکانەوە، لوورەیەکی لێلّ ئەو بەرداشە نادیارەی وەبیر هێنایەوە کە بێوچان هەوا گەرمەکەی هەلّدەسووڕاند. گرانت دەیگوت:

ـ بەختەوەرانە، بەختەوەرانە.

ريڤۆ نەيدەزانی ئەو دەيەوێ بڵێ چی. گرانت دەيگوت:

ـ بەختەوەرانە ئەمن ئيشم بۆخۆم هەيە.

ريڤۆ گوتی:

ـ بەڵێ ئەوەش خۆی نيعمەتێكە.

و لە حاڵێكدا كە بڕياری دابوو گوێ نەداتە دەنگی ئەو لوورەيە، لە گرانتی پرسی ئاخۆ لەو كارەی رازييە؟

ـ بەڵێ پێموايە هاتوومەتە سەربار.

ـ هێشتاش دەبێ زۆر بنووسی؟

گرانت تينێكی وەبەر هاتەوە، گەرمای خواردنەوەكە لە دەنگی گەڕا:

ـ نازانم، بەڵام مەسەلە ئەوە نيە دوكتۆر، نا، مەسەلە ئەوە نيە.

ريڤۆ لە نێو تاريكييەكەدا زانيی برادەرەكەی باسكەكانی رادەوەشێنێ. دەتگوت بە دوای دەستەواژەيەكدا دەگەڕێ كە لە پڕ بە رەوانی وەبيری هاتەوە:

ـ دەزانی دوكتۆر ئەوەی من گەرەكمە كاتێك نووسراوەكە دەچێتە بەردەستی خاوەنی دەزگای بڵاوكردنەوە، ئەو دوای خوێندنەوەی لە جێگەی خۆی هەستێ و بە هاوكارەكانی بڵێ:

ـ" هاوڕێيان كڵاوەكەتان لەسەرتان داگرن و كرنۆش بەرن."

ريڤۆ سەری لەو قسە لەنەكاوە سووڕ ما. وايزانی هاوڕێكەی كە دەستی بۆ سەری برد و باسكی لە حاڵەتی ئاسۆييدا راگرت، حاڵەتی كڵاوهەڵگرتنی بەخۆوە گرتووە. لەو سەرەوە دەتگوت ئەو لوورەلوورە سەير و سەمەرەيە بە هێزێكی زياترەوە دەستی پێكردبۆوە.

گرانت دەيگوت:

ـ بەڵێ دەبێ تەواو بێ.

هەرچەندە ريڤۆ زۆر ئاگاداری رێوشوێنەكانی رێز لێنان نەبوو، بەڵام هەستی دەكرد وێناچێ شتەكان ئاوا سووك و سانا ببڕێنەوە. زياتر بڵاوكەرەوەكان بە نووسينگەی كارەكەياندا دەبێ سەريان رووت بێ، بەڵام بە كردەوە كەس نەيدەتوانی لەوە دڵنيا بێ و، ريڤۆ وای بە باشتر زانی بێ

دەنگ بێ. بێ ئیختیار گوێی بە ورتەورتە ڕەمزاوییەکانی تاعوون دەسپارد. لە گەڕەکی گرانت نزیك دەبوونەوە و لەبەر ئەوەیکە ئەو گەڕەکە برێك بەرزتر بوو، شنەیەکی نەرم فێنکی دەکردنەوە و لە هەمانکاتدا شارەکەی لە هەموو دەنگەکانی دەپاڵاوت، بەڵام گرانت لەسەری دەڕۆیشت و ریڤۆ نەیدەتوانی سەرنج بداتە هەموو قسەکانی وی. تەنیا دەیتوانی لەوە تێ بگا کە ئەو بەرهەمەی باسی دەکرێ هەتا ئێستا لاپەڕەکانی زۆر بوونە، بەڵام ئەو زەحمەتەی نووسەرەکەی بۆ تەواوکردنی پێوەی دەکێشێ، تاقەتپرووکێنە:" شەوان و حەوتووان بە تەواوی لەسەر یەك وشە... تەنانەت پێتێکی سادەی پێوەندیی." گرانت لێرەدا بێدەنگ بوو و قۆپچەیەکی پالتۆکەی دوکتۆری گرت. وشەکان بە گومانەوە لە زارە ناشیرنەکەی دەهاتنەدەرەوە:

ـ سەیرکە دوکتۆر. کاتێك مرۆڤ ناچار بێت، ئیتر هەڵبژاردن لە نێوان "ئێمە" و "و"دا ئاسانە، بەڵام هەڵبژاردن لە نێوان "و" و " دوایی"دا دژوارترە. و کاتێك دەگەیتە "دوایی" و "دواتر" ئەم گرفتە قووڵتر دەبێتەوە، بەڵام بە دڵنیاییەوە لە هەمووی ناخۆشتر زانینی ئەوەیە کە ئاخۆ دەبێ "و"دابنێی یان نا؟

ریڤۆ گوتی: بەڵێ تێدەگەم.

ـــ و وەڕێ کەوت. گرانت شڵەژاو دیار بوو، بەڵام دیسان غیرەتێکی وەبەر هاتەوە و بە پرتەپرت گوتی: داوای لێبوردن، نازانم ئەمشەو چیم بەسەر دێ.

ریڤۆ بە نەرمی دەستی لەسەر شانی گرانت دانا و گوتی حەز دەکا یارمەتیی بدا و ئەم مەسەلەیەی پێ خۆشە. گرانت برێك گەش بۆوە و کاتێك گەیشتنە بەردەم ماڵەوە، پاش برێك دڕدۆنگی، پێشنیاری بە دوکتۆر کرد بۆ ساتێك بێتە سەرێ. ریڤۆ قەبووڵی کرد:

گرانت لە ژووری نانخواردنێ داوای لێکرد لەسەر مێزە پڕ لە کاغەزەکە دانیشێ. تەواوی ئەو کاغەزانە بە خەتێکی زۆر ورد نووسرابوون. گرانت بە دوکتۆری ـ کە نیگا پڕ لە پرسیارەکانی تێ بڕیبوو ـ گوت:

ـ بەڵێ وایە. بەراستی لەگەڵ خواردنەوەیەك چۆنی، حەزت لێیە؟ برێکم شەراب هەیە.

ریڤۆ قەبووڵی نەکرد. چاوی لە پەڕە کاغەزەکان کرد. گرانت گوتی:

ـ سەیری مەکە ئەوە یەکەمین رستەمە. زۆر ئازارم دەدا، زۆر.

خۆیشی سەیری تەواوی پەڕەکانی دەکرد. لە خۆوە دەستی بەرەو یەکێکیان چوو و بەرزی کردەوە و لەبەردەم گلۆپەکەدا رایگرت. پەڕەکە بە دەستییەوە دەلەرزی. ریڤۆ تێگەیی کە نیۆچەوانی کارمەندەکەی شارەوانی ئارەقەی کردووە. گوتی:

ـ دانیشە بۆمی بخوێنەوە.

گرانت سەیری کرد و سوپاسگوزارانە گوتی: ـ بەڵێ پێم وایە حەزم لێیە وا بکەم.

هەر بەو جۆرەی چاوی بڕیبووە کاغەزەکەوە بڕێك چاوەڕوان مایەوە. دوایی دانیشت. ریڤۆ لە هەمانکاتدا گوێی بەو قریوە و هەڵڵایە سپاردبوو کە دەتگوت وەڵامی لوورەلوورەکانی بەڵای دەدایەوە. لەم کاتە تایبەتەدا هێزێکی تێگەیشتنی لە رادەبەدەر تیژی هەبوو بۆ تێگەیشتن لەو شارەی هەتا بن پێیەکانی کشابوو، ئەو جیهانە داخراوەی کە ئەم شارەی لێ پێکدەهات و ئەو نووزەنووزە سامناکانەی تێیدا کپ دەبوون. دەنگی گرانت بە شێوەیەکی لێڵ بەرز بۆوە:" لە بەرەبەیانیەکی تەماویدا ژنێکی سوارچاکی تەڕپۆش، بە سواری ماینێکی کوێت، بە شەقامە گوڵ چێنراوەکانی جەنگەڵی "بۆلۆنی"دا تێدەپەڕی." بێ دەنگییەکە گەڕایەوە و بە شوێنیدا ورتەورتی لێڵی شارێك کە لە ئازاردا دەتلایەوە. گرانت لاپەڕەکەی لە سەر عەرزی دانا و هەروا کە چاوی تێوە بڕیبوو، پاش ساتێك چاوەکانی هەڵێنا:

ـ پێت چۆنە؟

ریڤۆ گوتی ئەو دەسپێکە مرۆڤ بەشوێن خۆیدا پەلکێش دەکات. گرانت بە هەژاوییەوە جوابی دایەوە کە ئەم بۆچوونە، بۆچوونێکی کۆك و تەبا نیە و دەستی بە کاغەزەکاندا دا.

ـ ئەم رستەیە بڕێك لە مەبەستەکەم و قسەی دڵم نزیك بۆتەوە. کاتێك بتوانم ئەو وێنەیەی لە خەیاڵمایە بە تەواوی بێنمە سەر کاغەزەکە، کاتێك رستەکەی من رێك وەك ئەو گەڕان و یۆرغەیە بچێت کە ئەسپ هەیەتی، یەك ، دوو، سێ، ئەو کاتە درێژەدانی ئاسانتر دەبێ و بە تایبەتی بۆ ئەوەی دەبێ چاوەڕێ بین کە لە سەرەتاوە بڵێن:"برایان، کرنۆش بەرن."

بەڵام هێشتا نەگەیشتبووە ئەو مەبەستە. هیچکات قایل نەدەبوو ئەم رستەیە بەو شێوەی هەیە بداتە چاپخانە. چونکە سەرەڕای ئەوەی جاروبارە لێی رازی دەبوو، بەو ئاکامە دەگەیشت کە ئەو رستەیە هێشتا تەواو لە حەقیقەت ناچێ و سادەبوونێکی لەبز و راوێژی تێدا هەبوو کە

دووراودوور نەك بە تەواوەتیش، ئەوی لە رستەیەکی دارێژراو نزیك دەکردەوە. گرانت بە گوتنی رستەگەلێکەوە خافڵابوو کە کەموزۆر هەر ئەو مانایەیان هەبوو. لەم جەنگەیەدا دەنگی پێڵاوی ئەو رێبوارانەی بە بەر پەنجەرەکاندا لە کۆڵانەوە رایان دەکرد، هات. ریڤۆ هەستایە سەر پێ، گرانت دەیگوت:

گوێت لێمە دەڵێم چی.

و لە حاڵەتێکدا کە بەرەو پەنجەرەکە وەرسووڕابوو گوتی:

ـ کاتێك ئەم شتانە تەواو بوون.

بەڵام دەنگی بەهەشتاوی پێیەکان دووپاتە بوونەوە. ریڤۆ گەیبووە سەر پلیکانەکان و کاتێك گەیشتە کۆڵانەکە دوو پیاو بە بەردەمیدا تێپەڕین. بە رواڵەت ئەوان بەرەو لای دەروازەی شار دەڕۆیشتن. لە راستی دا، هێندێ لە خەڵکی شارەکەی ئێمە کە لە نێو گەرماو تاعووندا گێژ ببوون هەر لە ئێستاوە خۆیان دابووە دەست توندوتیژی و هەوڵیان دەدا پارێزەرانی دیوارەکان بخافڵێنن و لە شار هەڵێن.

ژمارەیەکی دیکەی وەکوو رامبێریش هەوڵیان دەدا لەو کەشە سامناکە رابکەن کە دەخولڤا و، ئەگەر سەرکەوتنێکی گەورەشیان وەدەست نەهێنابا پێداگری و لێهاتووییەکی زیاتر لە هەوڵەکانیاندا هەبوو. رامبێر لە پێشدا بە فەرمی هەوڵی خۆی دابوو. وەك خۆی دەیگوت هەمیشە پێی وابوو سووربوون و پێداگربوونی بەردەوام سەرکەوتنی لێ دەکەوێتەوە و لە لایەکیشەوە زیرەکی و رێگەدۆزینەوە پیشەی ئەو بوو. هەر بۆیەش سەردانی بەشێك لەو بەرپرسانەی کردبوو کە هیچ گومانێك لە دەستڕۆیشتوویی و لێهاتووییەکەیاندا نەبوو، بەڵام ئێستا ئەم دەستڕۆیشتۆییە قازانجێکی بۆ وی نەبوو. ئەوانە کەسانێك بوون کە زیاتر لەسەر پرسگەلی پێوەندیدار بە بانك و هەناردەکردن و کشتوکاڵ، یان بازرگانیی شەرابدا را و بۆچوونی راشکاوانە و لێبڕاوانەی خۆیان هەبوو. هەر وەها لە پرسگەلی پێوەندیدار بە ماف و بیمەدا ـ ئەویش بەرمەرجێك حیساب بۆ بڕوانامەی باوەڕپێکراو و نیازپاکیی ئاشکرایان بکەین ـ

زانیاریی بەڵگەنەویستیان هەبوو. بە تایبەتی ئەوەی لە هەمواندا بە زەقی بەدی دەکرا، نیازپاکی بوو، بەڵام سەبارەت هیچیان لە تاعوون نەدەزانی و هەرەیان لە بەرەی نەدەکردەوە*.

لەگەڵ ئەوەشدا رامبێر لە بەرامبەر هەرکامەیاندا، ئەوەندەی بۆی کرابوو، داخوازییەکەی خۆی هێنابووە گۆڕێ. بنەمای بەڵگە هێنانەوەکەشی ئەوە بوو کە ئەو خەڵکی شارەکەی ئێمە نیە و بێگانەیە و دەبێ بە شێوەیەکی ناوازە بە داخوازیەکەی ئەو رابگەن. بە گشتی بەردەنگەکانی کاکی رۆژنامەوان بەو پەڕی دڵاوابییەوە ئەو قسەیەیان لێ وەردەگرت، بەڵام زۆرجاران بۆیان شی دەکردەوە کە خەڵکێکی زۆری دیکەش وەك ئەویان لێ قەوماوە، کەوابوو دۆخەکەی ئەو بەو جۆرەش کە خۆی پێی وایە ناوازە و ریزپەڕ نیە. رامبێر دەیتوانی وەڵامیان بداتەوە کە ئەم خاڵە هیچ گۆڕانێك لە بەڵگەهێنانەوەکەی ئەودا پێك ناهێنێ، بەڵام ئەوانیش وەڵامیان دەدایەوە کە ئەم مەسەلەیە ئەو بەشە لە کێشە ئیدارییەکانی ئەوان دەگۆڕێ وا دژی هەرچەشنە جیاوازی خستنێکە و ئەو جیاوازیدانانەش دەبێتە هۆی ئەوەی بە لەبزێکی ناشیرنەوە پێی دەگوترێ "پێشینە". بە پێی ئەو پۆلینبەندییەی رامبێر بۆ دوکتۆر ریڤۆی دەخستە روو، ئەو جۆرە بەڵگەهێنەرانە دەچوونە ریزی فۆرمالیستەکانەوە. هێشتا دەکرا لە تەنیشتیان کەسانی وا بەدی بکەیت کە بە قسەزانی داواکارەکەیان قایل دەکرد بەوەی وێناچێ ئەو رەوشە بەردەوام بێت. هەرکات داوایان لێدەکرا بڕیارێك بدەن، ئامۆژگاریی لەرادەبەدەریان دەکردن و بە گوتنی ئەوەی: "ئەم کێشەیە تێژتێپەڕە"، رامبێریشیان ئەهوەن دەکردەوە. کارمەندگەلێکی داهێنەریش هەبوون کە داوایان لە داواکار دەکرد، داخوازییەکەیان لە یادداشتێکی کورتکراوەدا پێشکەش بکەن و ئەوان تاوتوێی دەکەن و پێی رادەگەیەننەوە. دەیانویست ئیجازەی مانەوەی بە خۆڕایی بۆ دەرکەن یا ئەوەی ناونیشانی پانسیۆنە هەرزانەکانی بدەنێ. کارمەندە رێکوپێکەکان، کە سەرەتا پسوولەیەکیان پێ دەدا بۆ ئەوەی پڕی بکاتەوەن دوایی پسوولەکەیان لە پەنا ئەوانی دیکەوە دادەنا. وەگیانهاتووەکان (ئەوانەی تەواو وەرەس ببوون) کە دەستیان رادەوەشاند و وەڕەزبووەکانیش کە ئاوڕیان دەدایەوە بە کورتی

---

* هەرەی لە بەرەی ناکاتەوەك سەری لێ دەرناکات. هیچی لێ نازانێ.

نەریتخوازەکان بوون کە ژمارەیان لە هەموان زیاتر بوو و رامبێریان بەرەو ئیدارەیەکی دیکە یا بۆ هەولێکی دیکە رێنوێنی دەکرد.

ئەو چاوپێکەوتنانە پشوویان لە رۆژنامەنووس بڕیبوو و، بە هۆی چاوەڕوانی لەسەر کورسییە مەخمەرییەکان لە بەرامبەر ئەو ئاگادارییانەی وا خەڵکیان بانگهێشت دەکرد بۆ کڕینی پسوولەی خەزێنەی(حکوومی) بەبێ مالیات، یا بوون بە ئەندامی سوپای کۆلۆنیالی و، هەروەها بە هۆی چوونی بۆ ئەو نووسینگانەی روخساری فەرمانبەرەکانی لە شتومەکی نێو چەکمەجە و قەفەزەکان ئاسانتر لە ئەنجامی داواکەیان تێ دەگەیاند، تێگەیشتبوو کە بەراستی شارەوانی و پارێزگاری یانی چی. رامبێر بە لەبزێکەوە کە ئاسەوارێکی تاڵیی پێوە دیار بوو، بە ریۆی دەگوت، هەمووی ئەو شتانە قازانجەکەیان لەوەدایە کە مرۆڤ لە دۆخە راستەقینەکە دووربخاتەوە. ئەو بە کردەوە ئاگای بەسەر تەشەنەی تاعوونەوە نەمابوو. بە سەرنجدان بەوەیکە بەو شێوەیە رۆژەکان خێراتر تێدەپەڕین و لەو دۆخەی کە تەواوی شاری تێدابوو دەکرا بڵێین کە تێپەڕینی هەر رۆژێك هەموو کەسێك ـــ بەو مەرجەی نەمرێ ـــ لە کۆتایی ئەو ئازارانە نزیکتر دەکاتەوە. ریۆ ئەوەی پشتڕاست کردەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا راستییەکی لەرادەبەدەر گشتی و هەموانیە.

لەو نێوەدا، رامبێر تروسکایی هیوایەکی لە دڵ گەڕا. پرسیارنامەیەکی سپیی لە پارێزگارییەوە پێ گەیبوو و داوای لێ کرابوو بە وردی پڕی بکاتەوە. لە پرسیارنامەکەدا پرسیار لە ناو و شۆرەت و باری بنەماڵەیی و سەرچاوەی داهات لەئێستێ و رابردوودا و، لە رەوتی ژیانی کرابوو. پێی وا بوو ئەوە پرسیارنامەیەکە بۆ ناساندن و بەسەرکردنەوەی ئەوانەی کە دەبێ بنێردرێنەوە زێد و نیشتمانەکەی خۆیان. ئەو بڕە زانیارییە ناڕوونەش کە لە یەکێك لە دایرەکان پێی درابوو ئەو بۆچوونەی بڕێك پشتڕاست دەکردەوە، بەڵام پاش چەند هەولێکی راشکاوانە توانیی ئەو رێکخراوە بدۆزێتەوە کە ئەو پرسیارنامەیەی ناردوە و پێیان گوت ئەو زانیارییانە بۆ هێندێ شتی تایبەتی ئامادە کراون. رامبێر پرسیی:

ـ بۆ چ مەبەستگەلێك؟

ئەو کات بۆیان روون کردەوە کە مەبەست کۆمەڵێك شتە، کە ئەگەر ئەو تووشی تاعوون بێت و پێی بمرێ، ئەوکات دەبێ لە لایەکەوە بنەماڵەکەی ئاگادار بکەنەوە و لە لایەکی ترەوە

بزانن که پارەی نەخۆشخانە لەسەر گوژمەی شار حیساب بکەن یا نەخێر چاوەڕوان بن یەکێك لە کەسوکارەکەی بیدات. ئەو خاڵە نیشانەی ئەوە بوو، ئێستێ کە کۆمەڵگە ئەوانی خوێندۆتەوە (بەسەر کردووەتەوە)، بە دڵنیاییەوە ئەو بە تەواوی لەو ژنە دانەبڕاوە کە چاوەڕێیەتی، بەڵام ئەوە دڵی ئاوپڕژێن نەدەکرد. ئەوەی سەرنجڕاکێش بوو و هەر بۆیەش رامبێریش لێی خافڵ نەبوو، ئەوە بوو کە ئیدارەیەك دەیتوانی لە جەنگەی کارەساتدا، ئەرکی خۆی بەجێ بگەیەنێ و راست وەکوو کاتەکانی دیکەی و زۆر جار بە بێ ئاگاداریی بەرپرسانی سەرەوە، تەنیا لەبەر ئەوەیکە بەو مەبەستە دامەزراوە، کۆمەڵە بڕیارێك بدا.

ئەو قۆناغەی وا بە دوای ئەم خولەدا بەسەر رامبێر هاتبوو، هەم ئاسانترین و هەمیش دژوارترین قۆناغەکان بوو. سەردەمی داهێزراوی و بێهێزی بوو. ئیدراە نەمابوو سەری پێدا نەکات و ئەوەندەی لە توانایدا بوو هەوڵی خۆی دابوو و تەنیا لەم رێگەیەوە تەواوی دەرگەکانی لەسەر داخرابوون. ئیتر بە سەرلێشێواوییەوە لەم کافتریاوە دەچووە ئەویتر. بەیانیان لە هۆڵی کافتریایەکدا و لە بەردەم پەرداخێك بیرەی شلەتێندا، دادەنیشت و رۆژنامەیەکی دەخوێندەوە بەو هیوایەی لەوێدا هێما و نیشانەیەك لە کۆتایی بەم زووانەی پەتاکەی تێدابێ. لە رووخساری رێبوارەکانی کۆڵانی دەڕوانی و بە دیتنی حاڵەتی خەمناکی ئەوان بە دڵمەندییەوە رووی وەردەگێڕا و پاش ئەوەی کە بۆ سەدەمین جار لە تابلۆی دووکانەکانی دەڕوانی کە لەبەر چاوی بوون و بانگەشەی ئەو شەرابە جۆراوجۆرانەی دەخوێندەوە کە ئیتر نەدەخورانەوە، هەڵدەستا و بەبێ مەبەست رووی دەکردە کۆڵانە زەردەکانی شار. بە سەردانی تەنیای کافتریاکان و لە کافتریاکانەوە بۆ ریستورانتەکان.... بەو شێوەیە رۆژەکانی دەکردە شەو. رۆژێکیان ریڤۆ بەرەبەری ئێوارێ لەبەردەم کافتریایەك چاوی پێی کەوت کە نەیدەزانی بچێتە ژوورەوە یان نا. ئاخری دەتگوت بڕیاری دا و وەژوورکەوت و چوو لەلای سەروو دانیشت. هەروا سەعاتێك دەبوو کە بە پێی بڕیاری دەوڵەت تا ئەو جێگەی کرابایە درەنگتر چراکانیان دادەگیرساند، زەردەپەڕ وەکوو ئاوێکی لێڵ ژوورەکەی تاریك دادەگێڕا. سوورایی ئاسمانی دەمەوئێوارە لە شووشەکاندا رەنگی دەدایەوە و مەڕمەڕی مێزەکان لە سەرەتای بوولێڵدا نەرم نەرم دەبریسکانەوە. لە نێوەڕاستی هۆڵە قاوەییەکەدا رامبێر لە سێبەرێکی ونبوو دەچوو و، ریڤۆش پێی وابوو کاتی

ئەوە هاتووە خۆی بەدەستەوە بدات و بەچۆکدا بێ. بەڵام ئەوە ئەو کاتە بوو کە تەواوی بەندییەکانی ئەو شارە هەستیان بەوە دەکرد کە بە چۆکدا هاتوون و بۆ دەستوبردێك لە پێناوی رزگارکردنیاندا، پێویست بوو هەوڵێك بدرێ. ریڤۆ گەڕایەوە.

رامبێر بۆ ماوەی چەندین سەعات لە هێڵی شەمەندەفەر دەمایەوە. کەس بۆی نەبوو بچێتە سەر سەکۆکان، بەڵام هۆڵەکانی چاوەڕوانی کە دەکرا لە دەرەوە بچیتە ناویانەوە، کراوە بوون و جاری واش بوو سواڵکەرەکان لە رۆژە گەرمەکاندا پەنایان دەبردە ئەوێ چونکە سێبەر و فێنك بوون. رامبێر لەوێ کات و ساتەکانی جارانی وەرێکەوتنی شەمەندەفەر و ئاگادارییەکانی قەدەغەکردنی تف فڕێدان و بڕیارەکانی پۆلیسی شەمەندەفەری دەخوێندەوە. ئەوجار لە گۆشەیەك دادەنیشت. هۆڵەکە نیوە تاریك بوو. کۆنە سۆپەیەکی ئاسنیی لە نێو خشتە کۆنەکانی عەرزەکە چەند مانگێك بوو سارد ببۆوە. لەسەر دیوارەکان، چەند بانگەشەیەکی (ریکلام)ـی کۆن، خەڵکی بانگهێشت دەکرد بۆ ژیانی ئازاد و خۆش رابواردن لە باندۆلBandol و کانCannes .

رامبێر لێرە دەبووە بەو ئازادییە سامناکە دەگەیشت کە مرۆڤ لە ناخی بێبەشیدا پێی دەگا. بەو پێیەی ریڤۆ دەیگوت ئەو شتەی تەحەمولکردنەکەی لەرادەبەدەر بۆ ئەو دژوار بوو، بیرکردنەوە لە پاریس بوو. دیمەنێك لە بەردی کۆن و ئاو، کۆتری پالاس رۆیال، وێستگەی شەمەندفەری باکوور و گەڕەکە چۆڵەکانی پانسیۆن و چەند شوێنی دیکەی شار کە ئەو خۆی نەیدەزانی ئەوەندەی حەز لێیان بووە، بەردەوام بەشوێنیەوە بوون و نەیاندەهێشت دەست بۆ هیچ شتێك بەرێ. ریڤۆ پێی وابوو ئەو، ئەم بیرۆکانە بە بیرۆکەکانی خۆشەویستیی خۆی دەچوێنێ و ئەو رۆژەی رامبێر پێی گوت حەز دەکا سەعات چواری بەیانی لەخەو هەستێ و بیر لە شارەکەی خۆی بکاتەوە، ریڤۆ بە پێی ئەزموونەکانی خۆی بە سادەییەوە پێی وا بوو، ئەو حەزی لێیە بیر لەو ژنە بکاتەوە وا لەوێ بەجێی هێشتوە. چونکە لە راستیدا ئەوە ئەو سەعاتە بوو کە رامبێر دەیتوانی بەسەریدا زاڵ بێت. دیارە مرۆڤ هەتا سەعات چواری بەیانی کار ناکا و لەو سەعاتەدا دەخەوێ، تەنانەت ئەگەر شەوەکە شەوی خیانەتیش بێ. بەڵێ مرۆڤ لەو کاتەدا دەنوێ و ئەوەش دڵنیاییکەرەوەیە، چونکە ئارەزووی گەورەی دڵێکی پڕ، ئەوەیە کە بە

شێوەیەکی تاهەتایی ببێتە خاوەنی خۆشەویستەکەی خۆی یا بتوانێ ئەو دەمەی کاتی لێکدابڕان گەیوەتێ، ئەو بوونەوەرە(خۆشەویستەکەی) لە خەوێکی بێ خەونی ئەوتۆدا نوقم بکا کە هەتا رۆژی بە یەك گەیشتن، بەخەبەر نەیە.

## (٣)

دوای ئامۆژگارییەکە هێندەی پێنەچوو کە گەرما هەڵیکرد. مانگی ژووئەن بەرەو کۆتایی دەچوو. سبەینێی ئەو بارانە ناوەختانەی نیشانەی یەکشەممۆی ئامۆژگاریکردن بوون، هاوین بە پەلامارێك، لە ئاسماندا و بەسەر ماڵانەوە دەرکەوت. لە پێشدا بایەکی توندی گەرم و سووتێنەر هەڵیکرد، کە رۆژێك هەتا ئێوارێ نەکەوت و دیوارەکانی هەڵبرینگاند. خۆر تیرێژی دەباراند. بە درێژایی رۆژ، شەپۆلی بەردەوامی گەرما و تیشك، شارەکەی دەئاخنی. لە دەرەوە کۆڵان و ئاپارتمانەکان، دەتگوت تەنانەت خاڵێکی شار نەماوەتەوە تیشکی چاوکوێرکەری پێنەگەیشتبێ. خۆرەتاو لە هەموو کۆڵانەکانی شاردا وەشوێن هاووڵاتییەکانمان دەکەوت و هەر رادەوەستان، ئەو هەڵیدەکوتایە سەریان و دایدەپەلۆسین، چونکە ئەم دەسپێکی گەرمایە هاوکات بوو لەگەڵ هەڵکشانی ژمارەی قوربانیەکان و گەیشتنی ژمارەیان بە حەوسەت کەس، بۆیە جۆرێك لە بێهیوایی و داهێزراوی شارەکەی داگرت. قەرەباڵغییەکەی گەڕەکەکانی دەرەوەی شار و کۆڵانەکان و ئەو ماڵانەی وا بەرهەیوانیان هەبوو، کەم بۆوە. لەو گەڕەکانەدا کە خەڵك بەردەوام لەبەردەم دەرگای حەوشەکانیان بوون، هەموو دەرگاکان داخرابوون و پەردەکان دادرابوونەوە و کەس نەیدەزانی خەڵك دەیانەوێ خۆیان لە گەرما بپارێزن یا لە تاعوون. لەگەڵ ئەوەشدا لە زۆربەی ماڵەکانەوە دەنگی نووزە وناڵەناڵ دەهات. جاری جاران شتێکی ئاوا قەومابایە زۆربەی جار کەسانێکی بە قسەوباست دەبینی کە لە کۆڵانەکاندا رادەوەستان و گوێیان هەڵدەخست، بەڵام پاش ئەو ترسە درێژخایەنانە،

وەك بڵێی دڵی هەموان بۆتە بەرد و هەرکەسە، یا بە تەنیشت ناڵینەکاندا تێپەڕ دەبوو یا لەگەڵی دەژیا و دەتگوت ئەو ناڵینانە زمانی سرووشتیی مرۆڤەکانن.

لەبەردەم دەروازەکانەوە کۆمەڵێك ئاڵۆزی ساز بوون، کە سەربازەکان بە ناچارییەوە دەستیان بۆ چەك برد و ئەو رووداوانە پشێوییەکی لێڵیان ساز کرد. بە دڵنیاییەوە کەسانێك بریندار ببوون، بەڵام لە شارەکەدا کە هەموو شتێك بە هۆی گەرما و ترسەوە رەنگی زێدەڕۆیی بەخۆوە دەگرت، باسی کوژرانی چەند کەسێك دەکرا. بە هەرحاڵ گومان لەوەدا نەبوو کە نارەزایەتییەکان هەر دەهات و پەرەی دەگرت و بەرپرسە حکومییەکان دەترسان لەوەی نەکا دۆخەکە خراپتر بێ، بۆیە لەترسی ئەوەی نەکا ئەو خەڵکە بەلاَلێدراوە راپەڕن، هێندێ رێوشوێنیان گرتبوونە پێشێ و قایمکارییان کردبوو. رۆژنامەکان کۆمەڵە بڕیارێکیان بلاَو دەکردەوە کە دیسان باسی قەدەغەبوونی چوونەدەرەوەیان لە شار دەکردەوە و (رایاندەگەیاند) هەر کەس ئەو بڕیارانە بشکێنێ، لە بەندیخانە توند دەکرێ. پشکێنەر بە شاردا دەگەڕان. زۆربەی جاران لە کۆلاَنە داغ و چۆڵەکاندا، لە پێشدا دەنگی سمی ئەسپ دەبیسران و دوایی دەتبینی کە زێرەڤان بە سواری ئەسپ، بە بەردەم پەنجەرە داخراوەکاندا تێدەپەڕن. پاش تێپەڕینی زێرەڤانەکان بێدەنگیەکی قورس و گوماناوی باڵی بەسەر شاری هەڕەشە لێکراودا دەکێشا. لە دوورەوە دەنگی فیشەکی ئەو تاقمە تایبەتانە دەبیسران، کە بە پێی بڕیارێکی نوێ کوشتنی پشیلە و سەگەکانیان پێ ئەسپیاردبوون. لەبەر ئەوەی لەوانە بوو ئەو ئاژەلاَنە کێچەکان بە ولاَت وەرکەن. ئەم تەقینەوە وشکانە حالەتێکی سامناکی لە شارەکەدا خولقاندبوو.

لە نێوان گەرما و بێدەنگییەکەدا، ئیتر هەر هەموو شتێك بە تایبەتی بۆ دڵە ترساوەکەی خەڵکەکەی ئێمە گرینگ و بایەخی تایبەتی دەبوو. بۆ یەکەمین جار هەموان هەستیان بە رەنگەکانی ئاسمان و بۆنەکانی زەوی ـــ کە نیشانەی تێپەڕینی وەرزەکانن ـــ دەکرد. هەموان بە ترس و لەرزەوە تێدەگەیشتن لەوەی گەرما پەتاکە توندتر دەکات و لە هەمان کاتیشدا هەموو کەس دەیدی کە هاوین هاتووە و خێوەتی هەڵداوە. دەنگی پەڕەسێلکەکان لە ئاسمانی شاردا توندتر دەبوون و ئیتر لەگەڵ بەرەبەیانیەکانی مانگی جوون، کە لە نیشتمانەکەی ئێمەدا ئاسۆی

بەرینتر دەکردەوە، یەکیان نەدەگرتەوە. ئیتر گوڵەکان بە خونچەیی و بە نەپشکووتوویی نەدەهاتنە بازاڕەوە، ئەوان لە پێشدا دەپشکوتن و پاش فرۆشرانی بەیانیان، پەلکەکانیان شۆستە پڕ لە تۆز و خۆڵەکانیان دادەپۆشی. بە روونی دەتدی کە بەهار پشووی لێبڕاوە، گیانی خۆی بە خەسارەوە لێرە و لەوێ بەسەر هەزاران گوڵی گەشاوەدا پەخشان کردووە و، ئێستێ دەیەوێ چاو لێکبنێ و، وردە وردە لە ژێر قورسایی دوو لایەنەی تاعوون و گەرمادا لەناو بچێ. بۆ هەموو خەڵکی شارەکەی ئێمە ئەم ئاسمانەی هاوین، ئەو کۆڵانانەی لە ژێر پەردەی تۆزی خەفەتدا بزرکابوون، هەر هەمان مانای پڕ هەڕەشەی سەدان مردووەیان هەبوو، کە چۆکیان لەسەر سینگی شارەکەی ئێمە دادابوو. هەتاوی بەردەوام و ئەو ساتانەی تامی خەو و رابواردنیان هەبوو، ئیتر وەکوو رابردوو مرۆڤیان بۆ بەزم و خۆشی و چێژ و شەهوەت بانگهێشت نەدەکرد. بە پێچەوانەوە زەنگە بۆشەکەی ئەو سەعاتانە لە شارێکی داخراو و کپ و بێدەنگدا زرەی دەهات. ئەوان زایەڵەی مسینی وەرزەکانی بەختەوەرییان پێوە نەمابوو. هەتاوی تاعوون تەواوی رەنگەکانی کاڵ دەکردەوە و هەموو جۆرە خۆشییەکی دەتاراند.

ئەوە یەکێك لە شۆڕشە گەورەکانی پەتاکە بوو. جاری جاران، تەواوی هاووڵاتییەکانی ئێمە بە شادمانییەوە بە پیر هاوینەوە دەچوون، ئینجا شار بەرەو دەریا دادەگەڕا و هەموو گەنجەکانی دەڕشتە نێو گۆمیلکەکانەوە. ئەم هاوینە بە پێچەوانەوە دەریا نزیکەکە قەدەغە بوو و، جەستە مافی نەبوو چێژ و سوود لە خۆشییەکان وەربگرێ. دیسانیش هەر تارۆیە کە وردترین وێنەکانی ژیانی ئێمەی لەو کاتانەدا خستۆتە روو. ئەو بە شێوەیەکی گشتی تەشەنەکردنی تاعوونەکەی لە ژێر چاوەدێریدا بوو و دەینووسیی، هەواڵەکانی رادوێ نیشانەی قۆناغێکی نوێن لە تاعوون، چونکە ئیتر رادوێ لە حەوتوودا هەواڵی سەدان مەرگ بڵاو ناکاتەوە بەڵکو نەوەدونۆ، سەتوحەوت و سەتوبیست مەرگ لە رۆژێکدا رادەگەیێنێ. " رۆژنامە و بەرپرسەکان یارییەکی زیرەکانە لەگەڵ تاعووندا دەکەن. ئەوان پێیان وایە تۆزێك لە تەوژم و هێزەکەی کەم دەبێتەوە، چونکە سەتوسیویەك ژمارەیەکە زۆر لە نۆسەت و دە بچووکتر." ئەو هەروا دیمەنە خەمهێنەر و سەرەنجڕاکێشەکانی پەتاکەی دەگێڕایەوە. بۆ وێنە ئەو ژنەی وا لە گەڕەکێکی چۆڵ کە پەردەی دادرابوونەوە، لە نەکاو پەنجەرەیەکی ژوور سەری

خۆی دەکاتەوە و پاش دوو هاواری بەرز هەردوو تای پەنجەرەکەی بەرەو تاریکاییە خەستەکەی ژوورەکەی پاڵ پێوەناوە، بەڵام لە شوێنێکی دیکەش یاداشتی کردبوو کە حەبی جاترە لە دەرمانفرۆشییەکاندا تەواو بووە، چونکە خەڵکێکی زۆر ئەو حەبانە دەمژن، بۆ ئەوەی تووشی ئەو پەتایە نەبن و پارێزراو بن.

ئەو هەروا بەردەوام بوو لە سەردانی ئەو کەسانەی لەبەرچاوی بوون. بەو پێیە پیرە وردیلەش کە سەرقاڵی پشیلەکان بوو لە کارەساتدا دەژیا، دەمەوبەیانیەك دەنگی فیشەکێك بەرز ببۆوە و بە گوێرەی نووسینەکەی تارۆ، هاویژرانی چەند قورقوشم، زۆربەی پشیلەکانی کوشتبوو و ئەوانیتری وا تۆقاندبوو روو لەو کۆڵانە نەکەنەوە. هەر ئەو رۆژە پیرە وردیلە لە کاتی خۆیدا هاتبۆ سەر بانیژەکە و لە چەقی کۆڵانەکەی روانیبوو و ناچار ببوو چاوەڕوان بێ. بە دەستەکانی نەرم نەرم لە میلەی بانیژەکەی دەدا. دیسان چاوەڕێ ببوو و بڕێکی کاغەز ورد کردبوو. چووبۆوە نێو ژوورەکەی و دیسان هاتبۆوە دەرێ. دوایی، پاش ماوەیەك لە نەکاو ون ببوو و پەنجەرەکانی بە تووڕەییەوە پێوەدابوو. رۆژەکانی دواییش هەر ئەو دیمەنانە دووپاتە بوونەوە، بەڵام دەکرا لە روخساری پیرە وردیلەدا بە روونی پەژارە و شڵەژاوی بەدی بکەی. تارۆ پاش حەوتوەك لەخۆڕا چاوەڕێی وەدەرکەوتنەوەی بوو، بەڵام پەنجەرەکان لاسارانە بەسەر خەم و پەژارەیەکی هەستپێکراودا بە داخراوی مانەوە. لە یادداشتەکاندا بەو شێوەیە دەرەنجامگیری کرابوو:" لە جەنگەی تاعووندا، تف بە پشیلەدادان قەدەغەیە."

لە لایەکی دیکەیەوە تارۆ کە نیوەشەوان دەگەڕاوە، هەمیشە دڵنیا بوو روخساری گرژی دەرکەوانی شەوانەی هۆتێلەکە دەبینێ ، کە بە داڵانەکەدا دێ و دەچێ. ئەو کابرایە دەگەیشتە هەر کەسێك دەیگوت، پێشبینیی ئەو بەڵایەی کردبوو. تارۆ بۆی دەسەلماند کە پێشبینیی نەهامەتییەکەی لە زاری ئەو بیستووە، بەڵام وەبیری دەخستەوە، کە بەربێژییەکەی ئەو، هەواڵی بوومەلەرزەیەك بوو. پیرەی دەرکەوان وەڵامی دەداوە:" ئاخ، خۆزگە بوومەلەرزە بوایە! تەنیا راتڵەکانێکە و تەواو دەبێ... مردوو و زیندووان دەژمێرن و ئیتر تەواو، بەڵام ئەو پەتا تووکلێکراوە! تەنانەت ئەوانەی تووشیشی نەبوونە، لە دڵیاندا پێوەی دەناڵن."

بێئۆقرەیی بەڕێوەبەرەکەش لەو کەمتر نەبوو. سەرەتا، موسافیرەکان کە بۆیان نەبوو لە شارەکە بچنە دەرێ بە هۆی داخرانی شارەوە ناچار ببوون لە هۆتێلەکاندا بمێننەوە، بەڵام وردەوردە لەگەڵ درێژەکێشانی نەخۆشییەکەدا زۆربەیان وایان پێ باش بوو بڕۆنە ماڵی دۆست و برادەرەکانیان و هەر ئەو هۆکار و بیانوانەی وا تەواوی ژوورەکانی هۆتێلی پڕ کردبوو، لەمەودوا دەبووە هۆی چۆڵبوونیان. لەبەر ئەوەی ئیتر موسافیرێکی تازە سەری بە شارەکەی ئێمەدا نەدەکرد. تارۆ یەکێك بوو لە موسافیرە دەگمەنەکانی هوتێل و بەڕێوەبەری هوتێل بەردەوام وەبیری دێنایەوە کە ئەگەر لەبەر دڵی ئەو چەند مشتەرییەی دوایی نەبوایە، لە مێژبوو هوتێلەکەی داخستبوو. ئەو بەردەوام داوای لە تارۆ دەکرد بڵێ، ئاخۆ بە رای وی، ئەو نەخۆشییە چەندە دەخایەنێ. تارۆ بەو جۆرە رای خۆی دەردەبڕی:" دەڵێن سەرما ئەو جۆرە نەخۆشیانە ناهێڵێ." بەڕێوەبەر هەڵدەچوو و دەیگوت:"، بەڵام لێرە هەوا قەت بە راستی سارد نابێ، هەرچۆنێك بێ، هەتا چەند مانگێکی دی بەرۆکمان بەرنادا." ئەو لەوە دڵنیا بوو کە دوای ئەوەش بۆ ماوەیەك موسافیر روو لەو شارە ناکەنەوە. ئەم تاعوونە بە واتای هەرەس و شکستی گەشتیاری بوو.

لە ریستورانت پاش دیارنەبوونێکی کورت، مسیۆ ئۆسۆن، کابرا بایەقۆشیەکە، دیسان سەروسەکتی پەیدا بۆوە، بەڵام ئەمجارەیان تەنیا دوو تولە بە ئەدەبەکەی بە شوێنەوە بوون. بە پێی ئەو زانیارییانەی بەدەست هاتن، ژنەکەی چاوەدێریی دایکیی کردبوو و بە خاکی ئەسپاردبوو و، ئێستاش ئەوە لە دابڕگە(قەرەنتینە)ــیە. بەڕێوەبەری هوتێلەکە بە تارۆی وت:"

ـ هیچ پێم خۆش نیە. ئەو لە ژێر چاوەدێریدا بێ و یان نەبێ، گومانلێکراوە، کەوابوو ئەوانەش جێگەی گومانن.

تارۆ گوتی جا بەو پێیە تەواوی خەڵك جێی گومانن.

بەڵام بەڕێوەبەرەکە کابرایەکی مکووڕ بوو و لەسەر مەسەلەکان راشکاوانەی ڕای خۆی دەگوت:"

ـ نا کاکە، نەخێر نە تۆ گومانت لەسەرە و نە منیش، بەڵام ئەوان با.

بەڵام مسیۆ ئۆسۆن بەو جۆرە شتانە نەدەگۆڕدرا و، ئەمجارە تاعوون کاری تێنەکردبوو. هەر هەر بە دامودەستوورەکەی جاران دەهاتەوە نێو هوتێلەکە، لە بەرامبەر منداڵەکانی دادەنیشت و خۆگرانە و بە زمانێکی زبر دەیدواندن. تەنیا کوڕێژگەکە قەڵافەتی گۆڕابوو: ئەویش وەك

خوشکەکەی جلی ڕەشی پۆشیبوو و کەمێك خزیبووە قەپیلکی خۆیەوە و بەو قەڵافەتەوە مۆدیلێکی بچووکی باوکی بوو. دەرکەوانی شەو کە هیچ کەیفی بە مسیۆ ئۆسۆن نەدەهات بە تارۆی دەگوت:

ـ ئاخ! ئەوە هەر بەو جلوبەرگانەوە دەمرێ. بەو جۆرە ئیتر کفن و مفنی ناوێ و ڕاست دەچێتە ئەو دنیا.

ئامۆژگاریەکانی پانێلۆش لە یادداشتەکانی تارۆدا هاتبوون، بەڵام پێم وایە:" ئەمن لەو جۆشوخرۆش و جوامێرییە ڕاکێشەرە تێدەگەم. لە سەرەتای بەڵاکاندا و هەر وەها کاتێك کۆتاییان دێ، بەردەوام بڕێك پەنا دەبەنە بەر ڕەوانبێژی. سەبارەت بە یەکەمیان هێشتا خوو و خدەکان لە بیر نەچوونەتەوە و سەبارەت بە دووهەمیشیان ئەو تازە دەستی پێکردووە. لە جەنگەی چارەڕەشی دایە کە مرۆڤ خوو بە ڕاستەقینە و واقیعەوە دەگرێ واتە بە بێدەنگیەوە. با چاوەڕێی بین."

تارۆ هەروا نووسیوێتی، وتوێژێکی دوورودرێژی لەگەڵ دوکتۆر ریڤۆ هەبووە و تەنیا ئەوە بیر دێنێتەوە کە ئاکام و دەرەنجامی باشیان لەو وتووێژە وەرگرتووە و بەو، بۆنەوە ئاماژە بە ڕەنگی قاوەیی چاوەکانی دایکی دوکتۆر ریڤۆ دەکا و بە شێوەیەکی لێڵ دەنووسێ: نیگایەك کە ئەو هەمووە بەزەییەی تێدا بەدی دەکرێ، دیارە لە تاعوون بەهێزتر دەبێ {تاعوون زەفەری پێ نابا} . ئینجا کۆمەڵێك ڕستە بۆ پیرەمێردە پشووسوارەی کە دوکتۆر خەریکی چارەسەرکردنێتی تەرخان دەکا.

ئەو پاش چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ دوکتۆر چووبووە سەردانی ئەو نەخۆشە. پیرەمێردەکە بە وردە بزە و ڕێکخشاندنی دەستەکانی، پێشوازیی لە تارۆ کردبوو. ئەو لە نوێنەکەیدا پاڵی وەبالیفەکەی دابوو و دوو قابلەمەی نۆك لە پێش بوو. کە تارۆی دیتبوو وتبووی:"ئاخ، ئەوە یەکێکی دیکەش. کاری دنیا پێچەوانە بۆتەوە. ژمارەی دوکتۆرەکان لە نەخۆشەکان پترن. دیارە پەتاکە پەرەی گرتووە. ها؟ قەشە هەقیەتی، مافی خۆمان بوو." بۆ سبەینێ تارۆ بە تەنێ سەردانی کردبۆوە.

بەو پێیەی لە یادداشتەکانی تارۆدا نووسراوە، کابرا پیرەکە جۆلا بووە و لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا هاتبووە سەر ئەوەی، کە ئەو زەحمەتی خۆی کێشاوە و چەندی پێویست بووە خۆی ماندوو کردووە. هەر لەو کاتەوە خزیبووە نوێنەکانیەوە و نەهاتبۆ دەرێ. لە حاڵێکدا لەسەرپێبوون، بۆ دەردی پشووسوارییەکەی باشتر بوو. داهاتێکی بچووکی هەبوو کە هەتا

تەمەنی حەفتاوپێنجساڵی، خۆشبژیوانە پێی ژیابوو. چاوی بە سەعات هەڵنەدەهات. لە تەواوی ماڵەکەیدا تەنانەت تاقە سەعاتێکی نەبوو. دەیگوت:" سەعات هەم گرانە و هەم بێ مانایە." ئەو کاتەکانی خۆی و بە تایبەتی کاتی خواردنەکانی کە هەر ئەو کات و ساتانەشی بۆ گرنگ بوو، بە دوو قابڵەمە نۆك دیاریی دەکرد، کە بەیانی ئەو دەمەی لە خەو هەڵدەستا یەکێك لەو دوانە پڕ بوو لە نۆك. ئەو قابڵەمەکەی دیکەی بە جووڵەیەکی هاو ریتم و رێك، دەنك دەنك پڕ دەکرد لە نۆك. بەو شێوەیە بە درێژایی رۆژ کە بە قابڵەمە نۆکەکان ماوەکەی دیاری دەکرا، ئەو کاتانەی دەدۆزیەوە کە پێویستی پێیان بوو. دەیگوت:" هەر کات پازدە قابڵەمە بگۆڕدرێ، دەبێ زگم تێر بکەم. زۆر سادەیە."

وەکی ژنەکەی دەیگوت ئەو هەر لە سەردەمی گەنجێتییەوە سرووشتی خۆی نیشان دابوو. هیچکات هیچ شتێ سەرنجی ئەوی بۆ لای خۆی رانەکێشابوو. نە کارەکەی و نە دۆست و برادەر و نە کافتریا و نە مۆسیقا و نە ئافرەت و نە گەڕان و رابواردن. هیچ کات لە شارەکەی خۆی وەدەرنەکەوتبوو. جگە لەو رۆژەی ناچار ببوو بۆ کارێکی بنەماڵەیی بچێتە ئەلجەزیرە، ئەویش لە نزیکترین وێستگەی شەمەندەفەردا راوەستابوو و ئیتر نەیتوانیبوو دوورتر بچێ و بە یەکەمین شەمەندەفەر گەڕابۆوە ماڵێ.

تەواو بۆ تارۆی ـ کە ئەوەندە سەری لەو ژیانە دوورەپەرێزەی ئەو سووڕمابووـ لە بنی کوولەکەی دابوو کە بە پێی قسە ئایینیەکان نیوەی یەکەمی ژیانی مرۆڤ سەردەمی هەڵکشانە و نیوەی دوهەم سەردەمی داکشان و، لەم قۆناغەی داکشاندا ئیتر رۆژەکانی مرۆڤ لە دەستی خۆیدا نین و لە هەر ساتێکدا دەتوانن لێی وەرگرنەوە. کەوابوو هیچی لەدەست نایە و باشترین رێگە ئەوەیە هیچ نەکا. هیچ لەوەش نەدەترسا قسەکانی یەکتر نەگرنەوە، چونکە بڕێك دواتر بە تارۆی گوتبوو: خودایەك لەئارادا نیە، چونکە ئەگەر هەبوایە قەشەکان شتێکی زیادی دەبوون(پێویست نەدەبوون)، بەڵام بە شوێن مشتومڕ و چەلەحانێکانی دواتردا، تارۆ تێگەیشت کە ئەو فەلسەفەیەی ئەو لەگەڵ تووڕەییەکەیدا پێوەندییەکی نزیکی بەو یارمەتییە بەردەوامانەوە هەیە کە کلیسای گەڕەك کۆی دەکردنەوە، بەڵام ئەوەی روخساری ئەو کابرایەی

روون دەکردەوە ئاوات و ئارەزوویەکی قوولّ بوو کە ئەو چەندین جار لە بەردەم بەرامبەرەکەیدا دووپاتەی کردنەوە:" بە ئاواتەوە بوو ئەو کاتەی دەمریّ زۆر باش پیر بووبیّ.

تارۆ لەبەرخۆیەوە دەیگوت:" ئاخۆ ئەم کابرایە پیاوچاکە؟" و وەڵامی دەدایەوە:" بەلّیّ ئەگەر پیرۆزایەتی بریتی بیّ لە کۆمەلّیّك خوو و خدە."

بەلاّم هەر لەو کاتەدا تارۆ دەست دەکا بە شیکردنەوەیەکی وردی رۆژیّکی شارە تاعوونلیّدراوەکە و بەو شیّوەیە را و بۆچۆنیّکی دروست لەسەر سەرقالّی و ژیانی هاوولاّتییەکانی ئیّمە لە جەنگەی ئەو هاوینەدا دەخاتە روو. تارۆ دەلّیّ:" جگە لە مەست و سەرخۆشەکان هیچ کەس بزەی نازیّتە لیّوان و، ئەوانیش لەرادەبەدەر پیّدەکەنن." لیّرەوە دەست دەکا بە لیّکدانەوەکەی خۆی:

"گەردوگولّی بەیانی، شنەبایەکی نەرم لە شاردا کە هیّشتا چۆلّە، هەلّدەکا. لەو سەعاتەدا و لە مەودای نیّوان مردنەکانی شەو و نیوەشەوان و ئاویلکەدانەکانی رۆژدا، هەر دەلّیّی تاعوون بۆ ساتیّك دەست لە چالاکی هەلّدەگری و پشوویەك دەدا. تەواوی دووکانەکان داخراون، بەلاّم رستەی (بەهۆی تاعوونەوە داخراوە) کە بەسەر هیّندیّکیانەوەیە ئەوە نیشان دەدا، کە ئەوانە و دووکانەکانی دیکەش هەتا ماوەیەکی دیکە ناکریّـنەوە. رۆژنامەفرۆشەکان کە هەروا خەوالّوون هیّشتا بۆ هەوالّەکان دەنگ هەلّنابرِن، بەلّکو لە گۆشەیەکی کۆلاّنەکاندا پشتیان بە دیوارەکانەوە ناوە و وەك بلّیّی بە دەم خەوەوە برِۆن، کالاّکانیان وەبەر تیشکی فانۆسەکان دەدەن. ماوەیەك دواتر لەگەلّ تیّپەرِینی شەمەندەفەرەکاندا، بە هەموو ولاّت وەردەبن و تەواوی ئەو لاپەرِانەیان بە دەستەوە دەبیّ کە وشەی تاعوونیان لەسەر نووسراوە:"ئاخۆ تاعوون پاییزیشی بە شویّندا دیّ؟ پرۆفیسۆر ب هاوار دەکا:"نەخیّر!" سەتوبیستوچوار مردوو بیلانی نەوەدوچوارەمین تاعوون."

سەرەرِای قەیرانی کاغەز کە رۆژ لەگەلّ رۆژ زیاتر دەبیّت و هیّندیّ چاپەمەنیەکانی ناچار کردووە لاپەرِەکانیانی کەم بکەنەوە، رۆژنامەیەکی دیکە دەستی بە بلاّوبوونەوە کردووە بە ناوی"هەوالّی پەتای پەرەگر" کە بەو شیّوەیە باسی ئەرکی خۆی کردووە:"ئاگادارکردنەوەی هاوولاّتییەکانمان بە بیّلایەنی و سەرنجدان بە پەرەئەستاندن یا پاشەکشەی پەتاکە. ئاشناکردنی ئەوان لەگەلّ بۆچوونی شارەزاترین کەسەکان سەبارەت بە داهاتووی پەتاکە، پشتیوانی لە تەواوی کەسانی ناسراو و نەناسراو و هەموو ئەو گرووپانەی ئامادەی بەرەنگاربوونەوەی بەلاّکانن.

پاراستنی مەعنەویاتی خەڵك و ڕاگەیاندنی بڕیاری بەرپرسانی پایەبەرز و بە کورتی کۆکردنەوەی هەموو نیازپاکیەکان لە یەك شوێن بۆ بەرەنگاربوونەوەیەکی کاریگەر لەگەڵ ئەو پەتایەی کە دەمانهاڕێ." لە ڕاستیدا ئەو ڕۆژنامەیە بەم زووانە تەنیا ڕاگەیەندراوی دەرمانە تازەکان چاپ دەکا کە لە پێشگیری لە تاعووندا حەشر دەکەن."

دەوروبەری سەعات شەشی بەیانی لەو ڕیزانەدا کە لەبەردەم دووکانەکانەوە سەعاتێك بەر لە کرانەوەیان دەبەسترێن و، دوایی لە شەمەندەفەرە پڕ لە موسافیرەکاندا کە لە گەڕەکەکانی دەوروبەرەوە دەگەنێ، تەواوی ئەو ڕۆژنامانە دەست بە فرۆشتن دەکەن. شەمەندەفەرەکان بوونەتە تاقە ئامرازی هێنان و ڕاگواستن، لە حاڵێکدا کە بەردەرگاکەشیان جێگەی موسافیری نابێتەوە بە زەحمەت بەرێگەدا دەڕۆن. سەیر ئەوەیە لەگەڵ ئەو قەرەباڵغیەشدا تەواوی موسافیرەکان ئەوەندەی پێیان بکرێ پشت لە یەکتری دەکەن بۆوەی نەهێڵن لە یەکتری بگرنەوە. هەر شەمەندەفەرەی لە ئێستگەکاندا بارێك ژن و پیاو هەڵدەڕێژێ کە پەلەی ئەوەیانە خێراتر دوور بکەونەوە و تەنیا بمێننەوە. بە هۆی ئەو حاڵەتە گرژییەی وا وردەوردە درێژخایەن دەبێ، زۆربەی جاران خەڵك پێك هەڵدەپڕژێن.

" پاش تێپەڕینی یەکەمین شەمەندەفەرەکان، شار وردەوردە لەخەو هەڵدەستێ، یەکەمین بیرەفرۆشەکان دەرگاکانیان هەڵدەگرن. لە بەرهەیوانەکانیان ئاگاداریی لەو چەشنە هەڵواسراون:"قاوەمان نیە." "قەند و شەکر لەگەڵ خۆتان بێنن".... دوایی دووکانان دەکرێنەوە و کۆڵانەکان گیانیان وەبەر دێتەوە. هەر لەو جەنگەیەدا ڕووناکایی زیاد دەکا و گەرما وردەوردە ئاسمانی جووڵای قورقوشمین دەکا. لەو کاتەدا ئەوانەی بێکارن، ڕوو دەکەنە شەقامەکان. زۆربەی ئەوانە دەڵێی پێیان ئەسپێردراوە بە وەدەرخستنی جوانکاری و ڕازێنەرەوەکانیان سیحر و جادووی تاعوون پووچەڵ بکەنەوە. هەموو ڕۆژێ دەوربەری سەعاتی یازدە پۆل پۆل ژن و پیاو خەریکی پیاسەن و دەکرێ شەپۆل و جووڵەی ژیانیان تێدا بەدی بکەی کە لە ناخی چارەڕەشییە گەورەکاندا خۆی دەردەخا. ئەگەر پەتا پەرەئەستێنەکە تەشەنە بکا، سنوورەکانی ئەخلاقیش دوورتر دەبنەوە. و ئێمە جارێکی دیکەش لە تەنیشت گۆڕەکانەوە کۆڕ و کۆبوونەوەی بێ سەروبەرە بەچاو دەبینینەوە.

"کاتی نیوەڕۆ رستورانتەکان لە چاوترووکانێکا پڕ دەبن. زۆر زوو گرووپگەلی بچووك کە جێگەیان دەست نەکەوتوە لە رستورانتەکاندا پێك دێن، ئاسمان وردەوردە بە هۆی تەوژمی گەرما هەڵدەبزرکێ. لە تەنیشت ئەو کۆڵانانەوە کە لە ژێر تیرێژی خۆرەتاودا هەڵدەچۆقێن، لە سێبەری پەردە مەزن و گەوەرکانەوە، ئەوانەی هاتوون خۆراك و خواردن وەرگرن چاوەڕێی نۆرەی خۆیانن. پڕبوونی رستورانتەکان لەبەر ئەوەیە کە ئەوان کێشەی چێشتلێنان ئاسانتر دەکەنەوە، بەڵام ناتوانن دڵەڕاوکێی گرتنەوەی پەتاکە لەنێو بەرن. مشتەریەکان ماوەیەکی کاتەکانیان بۆ تاقیکردنەوەی کەوچك و چەتاڵ بە فیڕۆ دەدەن. هەتا ماوەیەك لەمەوبەر رستورانتەکان رایاندەگەیاند: " لێرە کەوچك و چەتاڵەکان پاکژ کراونەتەوە."، بەڵام وردەوردە ئەوان خۆیان لە هەرچەشنە پروپاگەندەیەك بوارد، لەبەرە ئەوەی مشتەرییەکانی هەر ناچار بوون بێن. لە لایەکی ترەوە مشتەری بە دڵاوایییەوە پارە خەرج دەکا. خواردنەوەی باشترین شەرابەکان یا ئەوانەی ناوبانگیان هەیە و هەروەها خوارنی گرانبایی، سەرەتای تەڕاتێنێکی بێ هەوسارە. دەڵێن لە یەکێك لە رستورانتەکاندا، ترسێکی توند خەڵکی داگرتووە لەبەر ئەوەی یەکێك لە مشتەریەکان دڵی تێکەڵ هاتووە و رەنگی پەڕیوە، دوایی هەستاوە بە لەتردان بە خێرایی لە رستورانتەکە وەدەر کەوتووە.

" دەورووبەری سەعات دوو، شار وردەوردە چۆڵ دەبێ و لەو کاتەدایە کە بێدەنگی و تەپوتۆز و خۆر و تاعوون لە کۆڵانەکاندا بە تەنێ دەمێننەوە. رەنگی گەرما بە درێژایی خانووە گەورە خۆڵەمێشییەکان لەگەڕ دایە. ئەو سەعاتە درێژخایەنانەی بەندیخانە، لە ئێوارەگەلێکی سووربۆوەدا کە بە سەر شاری پڕ حەشیمەت و زۆربڵەدا دەبارێ کۆتاییان دێ. لە جەنگەی یەکەمین رۆژەکانی گەرمادا دیار نیە سەر لە ئێوارەکان چۆڵ بوون، بەڵام ئێستا یەکەمین فێنکایی هەوا، ئەگەر هیوایەکیش لەگەڵ خۆی نەهێنێ هێمنیەك دێنێ. ئەو کاتە هەموان دەڕژێنە نێو کۆڵانەکانەوە و بە چەنەلێدان خۆیان دەخافڵێنن و پێکەوە دەکەونە مشتومڕ یا چاو دەبڕنە یەکدی و لە ژێر ئاسمانی سووری جوولایدا شارەکە پڕ لە جووت و دەنگەدەنگ و زەنازەنا، بەرەو شەوێك کە هەناسەبڕکییەتی، دەکشێ. شەو تا بەیانی لە شەقامەکاندا پیرەمێردێکی ئیماندار کە کڵاوێکی شەپقەی لەسەر دایە و بۆینباخێکی پانی بەستووە بە نێو خەڵکەکەدا تێدەپەڕێ و لە خۆڕایی بەردەوام دەڵێ:" خوا گەورەیە. روو لەو کەن." بە پێچەوانەوە خەڵك هەموان بەرەو شتێك رادەکەن

که به باشی نایناسن و یا به لایانەوە لە خودا واجبترە. سەرەتا کاتێك وەیانزانی ئەوەش پەتایەکە وەك پەتاکانی تر ، ئیتر ئایین شوێنی خۆی هەبوو، بەڵام کە دیتیان نەخێر گاڵتەی پێ ناکرێ، ئیتر کەوتنە بیری رابواردنەوە. ئەو دڵەڕاوکێیەی بە درێژایی رۆژ بە رووخساریانەوە دیارە، لە زەردەپەڕێکی سووتێنەر و خۆڵاویدا و لە جۆرە هەژانێکی دڕندە و ئازادییەکی نەناسراودا کە تای خستۆتە نێو هەموو خەڵکەکەوە، دەتوێتەوە و دەسڕێتەوە. "و ئەمنیش وەك ئەوانم. چ دەکرێ.! مەرگ بۆ مەمانان* چ نیە. رووداوێکە کە لای ئەوان دەگرێ و دەڵێ ئەوان حەقیانە."

* مەمانان: ئێمەومانان، ئێمەمانان.واتە ئەوانەی وەك ئێمەن.

## (٤)

ئەو چاوپێکەوتنانەی تارۆ لە یادداشتەکانیدا باسیان دەکا، لەسەر داوای خۆی لەگەڵ ریڤۆدا پێك هاتبوون. شەوێك کە ریڤۆ چاوەڕێی بوو، چاوی بڕیبووە دایکی کە بە هێمنی لە ژووری نانخواردندا لەسەر کورسییەك دانیشتبوو. کاتێ کارەکانی ماڵێ تەواو دەبوون، ئەو باقی ڕۆژەکانی خۆی لێرە بەسەر دەبرد. ریڤۆ تەنانەت دڵنیاش نەبوو لەوەی ئاخۆ دایکی چاوەڕوانی دەبێ یان نا. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك ئەو دەردەکەوت شتێك لە روخساری دایکیدا دەگۆڕدرا. تەواوی ئەو لێڵی و بێدەنگیەی کە ژیانی بە زەحمەتی ماڵەوە خستبوویە سەر روخساری، لەپڕ گیانیان وەبەر دەهاتەوە. دوایی دیسان بێدەنگی دەگەڕایەوە. ئەوێ شەوێ ئەو لە پەنجەرەوە لە کۆڵانەکەی دەڕوانی کە چۆڵ و بێ هەست و خوست بوو. چراکانی ئەوێ دوو هێندەی جاران کەم کرابوونەوە و لە دوورەوە گڵۆپێکی زۆرکز تیشکێکی داویشتە تاریکاییەوە. مادام ریڤۆ گوتی:

ـ ئاخۆ گەرەکیانە لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە تاعوون هەیە، هەر ئەوەندە روناکاییە بدەنە شارەکە؟

ـ لەوانەیە.

ـ بە مەرجێك کە هەتا زستانێ درێژەی نەبێ. ئەو کات زۆر بێ تام دەبێ.

ریڤۆ گوتی:

ـ بەڵێ.

ریڤۆ لە روانینەکەی دایکیەوە کە کەوتبووە سەر نێوچاوانی، دەیزانی، ناخۆشی و کاری زۆری ئەو رۆژانەی دوایی چاوی بەقوولڵدا بردووە. مادام ریڤۆ گوتی:

ـ ئەم بەیانیە دۆخەکە نالەبار بوو؟

ـ ئاه، وەك خۆی.

وەك خۆی، واتە ئەو سیرۆمانەی کە لە پاریسەوە دەنێردران، لە سیرۆمەکانی جاران بێ کاریگەرتر دیار بوون و، زیان و خەسارەکان هەر دەهات و پتر دەبوون. هێشتا نەلواوە ئەو بنەماڵانەی کە ساغن سیرۆمیان لێ بدرێ، تەنیا لەو بنەماڵانە دراوە کە نەخۆشییەکەیان تێدا بەدی کراوە. بۆ وەشاندنی گشتی کارمەندی زۆر دەوێ. زۆرجار کوانەکان ناقەڵەشنەوە لەبەر ئەوەی کاتی ئەوەیان گەیشتووە رەقهەڵێن و ئەوەش نەخۆش ئازار دەدا. لە دوێ شەوێوە دوو نەخۆشیی لە جۆری لێگرەوە و پەرەئەستێن(گوازراوە) لە شاردا بینراون. بەو شێوەیە تاعوون دەیداتە سیپەلکەکانیان و هەر لە کۆبوونەوەیەکی ئەو رۆژەدا پزیشکە ماندوو و شەکەتەکان لە بەرامبەر پارێزگاردا کە ئەویش خۆی نازانێ چ بکا بۆ پێشگرتن لە پەرەئەستاندنی زار بە زاری تاعوونی سیپەلکی، داوای رێوشوێن و یاسای نوێیان کردووە و سەرکەوتووش بوون. وەك دیارە کەس نازانێ دەگاتە کوێ.

چاوی لە دایکی کرد. روانینی جوانی چاوە قاوەییەکان، ئەو خۆشەویستییەی وەجۆش هێنایەوە کە چەندین ساڵ بوو دڵی تەنیبوو:

ـ دایە دەترسی؟...

ـ لە تەمەنی مندا مرۆڤ بە دەگمەن لە شت دەترسێ.

ـ رۆژەکان درێژن و ئەمن دەکرێ بڵێم هەر لە ماڵێ نیم.

ـ کاتێك بزانم دێیتەوە و چاوەرێت بم بۆم گرینگ نیە و کاتێك لێرە نیت بیر لەو کارە دەکەمەوە کە دەیکەی. هەواڵی تازەت هەیە؟...

ـ بەڵێ ئەگەر ئەو بابەتانە قەبووڵ بکەم کە بە دوایین تەلەگرام گەیشتوون کارەکان دەچنە پێشێ، بەڵام دەزانم لەبەر دڵی من ئەو قسانە دەکەی.

دەنگی دەرگا هات. دوکتۆر بزەیەکی هاتێ بۆ دایکی و چوو دەرگا بکاتەوە. لە پێگۆڕکە نیوە تاریکەکەدا، قەڵافەتی تارۆ لە ورچێکی زلی خۆڵەمێشی دەچوو. ریڤۆ لەسەر مێزی کارەکەی داینا

و خۆی لە پشت کورسییەکەی مێزەکەیەوە وێستا. تاقە گڵۆپی داگیرساوی ژوورەکە کە پێ بوو ئەوانی لێك جوێ دەکردەوە.

تارۆ بە بێ سێودوو گوتی:

ـ دەزانم، کە دەکرێ بە بێ توێکڵ قسەت لەگەڵ بکەم.

ریۆ بە بێدەنگی بۆی سەلماند.

ـ هەتا پازدە رۆژ یا مانگێکی دیکە بوونی تۆ لێرە هیچ کەڵکی نامێنێ و شەپۆلی رووداوەکان وەسەرت دەکشێ.

ریۆ گوتی:

ـ وایە.

ـ رێکخستنی یارمەتییە پزیشکیەکان وەزعی شڕە. تۆ نە کەست بە دەستەوەیە و نە کاتیش.

ریۆ دیسانیش بۆی سەلماند کە راست وایە.

ـ بیستوومە پارێزگاری لە فکری هەرەوەزییەکی نیشتمانی دایە کە خەڵکە تەندروست و لەشساغەکان ناچار بکا لە هەڵمەتی رزگارکردنی گشتیدا بەشدار بن.

ـ تۆ زانیاریی پێویستت هەیە، بەڵام نارەزایەتی زۆرە و پارێزگار بە گومان و دڕدۆنگە.

ـ ئەی بۆچی خۆبەخشیان ناوێ؟

ـ ئەوەشیان کردووە، بەڵام ئاکامێکی وای لێ نەکەوتۆتەوە.

ـ ئەو کارەیان لە رێگەی فەرمیەوە کردووە بە بێ ئەوەی خۆیشیان هیچ باوەڕێکیان پێی هەبێ. ئەوەی وا ئەوان نیانە هێزی خەیاڵ و بیرکردنەوەیە. ئەوان قەت قەت بە تاعوون ناوەستن و باشاری ناکەن. ئەو دەرمانانەش کە لە مێشکیان دایە بەحاڵەحاڵ لە ئاستی هەڵامەتێکدان. ئەگەر بەریان بەردەین ئەو کارانە بکەن، تێدا دەچن و ئێمەش لەگەڵ خۆیان نوقم دەکەن.

ریۆ گوتی:

ـ لەوانەیە. پێویستە پێت بڵێم کە بۆ راپەڕاندنی ئەو کارانەی باسم کردن، گەرەکیانە کەڵك لە بەندییەکان وەرگرن.

ـ ئەمن وام پێ باشتر بوو لە خەڵکی ئازاد کەڵك وەرگرن.

ـ ئەمنیش، بەڵام بۆچی؟

ـ ئەمن لە مەحکوومبوون بە مەرگ تۆقیوم.

ریڤۆ چاوی لە تارۆ کرد و گوتی:

ـ ئەوکات چی؟

ـ ئەو کات ئەمن پلانێکم بۆ رێکخراوە تەندرووستییە خۆبەخشەکان هەیە. لێم گەڕێن با ئەو کارە راپەڕێنم و واز لە بەرپرسانی دەوڵەتی بێنین. جگە لەوەش بە رادەی پێویست چەرمەسەرییان هەیە. ئەمن کەموزۆر لە هەموو شوێنێ برادەرم هەن و ئەوان کەسانی سەرەکی دەبن و دیارە خۆیشم تێیدا بەشدار دەبم.

ریڤۆ گوتی:

ـ خۆت دەزانی، ئەمن خۆم بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە ئەو کارە وەئەستۆ دەگرم. مرۆڤ هەمیشە پێویستیی بە یارمەتییە. بە تایبەتی لەم پیشەیەدا. ئەمن ئەوە وەئەستۆ دەگرم کە پارێزگار قایل بکەم ئەو بیرۆکەیە وەرگرێ. جگە لەوەش ئەوان رێگەیەکی دیکەیان نیە، بەڵام...

بیرێکی کردەوە و لەسەری رۆیشت:

ـ بۆخۆت دەزانی لەوانەیە ئەم کارە مردنی پێوە بێ. چار نیە ئەمن دەبێ ئێوە لەم شتە ئاگادار بکەمەوە. باشتان بیر لێکردۆتەوە؟

تارۆ بە چاوە خۆڵەمێشی و هێمنەکانی دیڕوانی:

ـ دوکتۆر ئەدی ئامۆژگارییەکانی پانیلۆ؟

پرسیارەکە زۆر سرووشتی کرابوو و، ریڤۆش زۆر ئاسایی وەڵامی دایەوە:

ـ ئەمن  ئەوەندە لە نێو نەخۆشخانەکاندا ژیاوم، کە فشەم بە بیرۆکەی سزای گشتی دێ، بەڵام خۆ دەزانن مەسیحییە ئیماندارەکان زۆربەیان بەو شێوەیە قسە دەکەن، بەبێ ئەوەی بە راستی وا بیر بکەنەوە. ئەوان لەوە باشترن کە دەنوێنن.

ـ لەگەڵ ئەوەشدا تۆش وەك پانیلۆ پێتوایە تاعوون لایەنی چاکەکاریشی تێدایە و دەبێتە هۆی چاوکراوەیی و بیرکردنەوە؟

دوکتۆر بەبێ ئۆقرەییەوە سەری بۆ لەقاند و گوتی:

ـ وەکوو تەواوی نەخۆشییەکانی ئەم جیهانە. ئەوەی بۆ ژانەکانی ئەم جیهانە راست بێ بۆ تاعوونیش راستە. تاعوون یارمەتیدەر دەبێت بۆ ئەوەی یەکێك گەورە بێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك مرۆڤ ئەو نەهامەتییە دەبینێ کە تاعوون لەگەڵ خۆی دەیهێنێ، مەگەر شێت یا کوێر یا ترسنۆك بێ، دەنا ملی بۆ کەچ ناکا.

ریڤۆ برێك دەنگی لێ هەڵێنابوو، بەڵام تارۆ دەستێکی لێ راوەشاند کە دەتگوت گەرەکیەتی هێوری بکاتەوە و بزەیەکی هاتێ.

ریڤۆ شانی هەڵ تەکاند و گوتی:

ـ بەڵێ، بەڵام خۆ وەڵامت نەدامەوەوە. ئاخۆ بیرت لێکردۆتەوە؟

تارۆ لە قەنەفەکەدا برێك بارەوباری کرد و لە رووناکاییەکەدا سەری هێنایە پێشەوە:

ـ دوکتۆر تۆ باوەڕت بە خودا هەیە؟

دیسان پرسیارەکە ئاسایی هاتە گۆڕێ، بەڵام ئەمجارەیان ریڤۆ دڕدۆنگ بوو:

ـ نەخێر، بەڵام مەبەستت چییە؟ ئەمن لە ئەنگوستەچاوی شەودام و هەوڵ دەدەم بەرچاوڕوون بم. زۆر لە مێژە ئەم بابەتە بە لای منەوە کۆن بووە.

ـ ئاخۆ هەر ئەوە نیە کە تۆ لە پانیلۆ جوێ دەکاتەوە؟

ـ پێم وا نیە. پانیلۆ پیاوی خوێندنەوە و موتاڵاکردنە. ئەو مەرگی مرۆڤەکانی بە چاو نەدیتوە، هەر بۆیەشە بە ناوی حەقیقەتەوە قسان دەکا، بەڵام بچووکترین قەشەی ئاواییش کە هەرێمی کڵێسەکەی خۆی بەرێوە دەبا و، گوێی لە هەنیسك و ئاویلکەدانی کەسێك بووە، وەکوو من بیر دەکاتەوە. ئەو نەگبەتی و چارەڕەشییەکان چارەسەر دەکا، بەبێ ئەوەی باشییەکانی بسەلمێنێ.

ریڤۆ هەستا. ئەوجار روخساری بە تاریکیدا رۆچووبوو. گوتی:

ـ ئێستا کە ناتەوێ وەڵام بدەیتەوە با واز لەم باسە بێنین.

تارۆ بە بێ ئەوەی بجووڵێتەوە بزەیەکی هاتێ:

ـ دەکرێ بە پرسیارێك وەڵام بدەمەوە؟...

دوکتۆریش بە نۆرەی خۆی بزەیەکی هاتێ:

ـ تۆ حەزت لە قسەی بە توێکڵ و ناڕوونە. دەی باشە فەرموو.

تارۆ گوتی:

ـ پرسیارەکەی من ئەوەیە: ئەتۆ کە باوەڕت بە خودا نیە، ئەو هەمووە فیداکاری و خۆبەخشییە لەبەر چی دەکەی؟ لەوانەیە وەڵامەکەی تۆ یارمەتیم بدات ئەمنیش وەڵام بدەمەوە.

ریڤۆ بە بێ ئەوەی لە تاریکیەکە بێتە دەرێ گوتی لەوە پێش وەڵامی ئەو پرسیارەی داوەتەوە و ئەگەر بڕوای بە خودایەکی تاقانە بوایە دەستی لە چارەسەریی خەڵك هەڵدەگرت و ئەو ئەرکەی بە خودا دەسپارد، بەڵام هیچ کەسێ لە دنیا تەنانەت پانیلۆش کە پێی وایە باوەڕمەند و ئیماندارە، باوەڕی بە خودایەکی لەو چەشنە نیە، چونکە هیچ کەس بە بە یەکجاری ملکەچ نابێ.

بەراستی خۆی (ریڤۆ) لەم بارەیەوە پێی وایە بە راوەستان لە بەرامبەر سیستەمی سرووشتدا بەو جۆرەی کە هەیە، لە سەر شارێبازی حەقیقەتە.

تارۆ گوتی:

ـ یانی ئەوە باوەڕی تۆیە لەسەر ئەو پیشەیەی هەتە؟

دوکتۆر کە بەرەو رووناکاییەکە دەگەڕایەوە وەڵامی دایەوە:

ـ تا ڕادەیەك.

تارۆ فیکەیەکی سەبری لێدا و سەیری ئەوی کرد و گوتی:

ـ تۆ بە خۆت دەڵێی ئەو کارە پێویستیی بە ورە هەیە، بەڵام بڕوات هەبێ ئەمن ئەو ورەیەم هەیە کە پێویستە. ئەمن نازانم چ شتێ چاوەڕێمە، یان بە دوای ئەو هەمووە شتەدا چم بەسەر دێ. جارێ ئەوە نەخۆش هەن و دەبێ چارەسەر بکرێن. دوایی ئەوانیش بیر دەکەنەوە و ئەمنیش، بەڵام جارێ با ئەوان چارەسەر بکرێن. ئەمن ئەوەندەی دەتوانم بەرگرییان لێ دەکەم. هەر ئەوەندە.

ـ لەبەرامبەر کێ دا؟...

ریڤۆ بەرەو پەنجەرەکە گەڕایەوە. لە دوورەوە دەریای لە ئاسۆ تۆختر دەبینی. تەنیا هەستی بە شەکەتیی خۆی دەکرد و لەگەڵ ئەو ئارەزووە لەنەکاو و بێجێیەش لە ململانێدا بوو کە دیسانیش سفرەی دڵی خۆی بۆ ئەم کابرا سەیروسەمەرەیە بکاتەوە وا لەگەڵی وەك برای لێهاتبوو یان نا.

ـ نازانم تارۆ، بە سەری تۆ نازانم. ئەمن کە ئەو پیشەیەم هەڵبژارد، لەبەر هێندێ هۆی ناڕوون ئەو کارەم کرد. بۆ وێنە لەبەر ئەوەی پێویستیم پێی هەبوو. لەبەر ئەوەی پیشەیەك بوو وەك

ئیشەکانی دیکە. یەکێك لەو کارانەی کە گەنجان مزگێنیەکەی بە خۆیان دەدەن. لەوانەشە لەبەر ئەوەی ئەو کارە بۆ کوڕە کرێکارێکی وەکوو من دژوار بوو. دوابیش پێویست بوو مەرگی مرۆڤەکان ببینم. دزانی، کەسانێك هەنە کە نایانەوێ بمرن؟ قەت گوێت لە دەنگی ژنێك بووە کە لە سەرەمەرگدا هاوار دەکا:"هەرگیز"؟ ئەمن گوێم لێ بووە و دوایی تێگەیوم کە ناتوانم لەگەڵی رابێم. ئەوکات ئەمن گەنج بووم و تووك و نەفرەتم لە سیستەمی دنیا دەکرد. لەودەمەوە خاکەڕاتر بوومە، بەڵام قەت عادەتم بە دیتنی مەرگ نەگرت. ئیتر هیچ نازانم، بەڵام پاش تەواوی ئەو قسانە...

ریڤۆ بێدەنگ بوو و دانیشت. هەستی دەکرد زاری وشك بووە.

تارۆ بە هێمنی پرسیی:

ـ پاش تەواوی ئەو قسانە؟...

دوکتۆر گوتی:

ـ دوای تەواوی ئەو قسانە...

دیسان درڕدۆنگ بۆوە و بە وردی سەیری تارۆی کرد:

ـ ئەوە شتێکە کە پیاوێکی وەکوو تۆ تێی دەگا. ئێستێ کە جڵەوی دنیا دراوەتە دەست مەرگ، لەوانەیە بە قازانجی خودا بێ کە خەڵك باوەڕیان پێی نەبێ و بێ ئەوەی چاو ببڕنە ئەو ئاسمانەی ئەو بێدەنگ تێیدا دانیشتوە، بە هەموو توانایانەوە لە بەرامبەر مەرگدا راوەستن.

تارۆ بۆی سەلماند:

ـ بەڵێ ئەمن تێ دەگەم، بەڵام سەرکەوتنەکانی تۆ هەمیشە کاتین. تەواو.

ریڤۆ برێك گرژ بوو:

دەزانم هەمیشە، بەڵام ئەوە نابێتە هۆی ئەوەی ئێمە دەست لە تێکۆشان هەڵگرین.

ـ نەخێر، نابێتە هۆی ئەوە، بەڵام خەریکم بیر لەوە دەکەمەوە کە لەوەها دۆخێکدا ئەو تاعوونە بە لای تۆوە چ دەبێ؟

ریڤۆ گوتی:

ـ بەڵێ. شکستێکی بێ کۆتایی.

تارۆ ساتێك چاوی لە دوکتۆر بڕی. دوایی هەستا و بە قورسی بەرەو دەرگا وەڕێ کەوت و ریڤۆش وەشوێنی کەوت. کاتێك گرتییەوە، تارۆ کە دەتگوت چاوی بڕیوەتە پێڵاوەکانی خۆی گوتی:

ـ کێ ئەو شتانەی فێر کردووی دوکتۆر؟

دەمودەست وەڵامی درایەوە:

ـ نەهامەتی!

ریڤۆ دەرگای نووسینگەی کارەکەی کردەوە و لە داڵانەکەدا بە تارۆی گوت، ئەویش دێتە خواریٚ بۆوەی بچێتە سەردانی نەخۆشێکی، لە یەکێك لە گەڕەکەکانی دەورووبەر. تارۆ گوتی ئەویش لەگەڵ خۆی بەریٚ و، دوکتۆر قەبووڵی کرد. لەو سەری داڵانەکە تووشی مادام ریڤۆ هاتن و دوکتۆر تارۆی پیٚ ناساند و گوتی:

ـ برادەرێکی خۆمە.

مادام ریڤۆ گوتی:

ـ چاوم روون بۆوە.

کە ئەو رۆیشت تارۆ دیسان گەڕاوە و سەیری کرد. لەسەر پێگۆڕکەی پلیکانەکە، بۆ داگیرساندنی گڵۆپەکە، پەنجەی بە دوگمەکەدا هێنا، بەڵام سوودێکی نەبوو و پلیکانەکە لە تاریکیدا مایەوە. دوکتۆر لە خۆی دەپرسی بڵێی ئەوەش بڕیارێکی نویٚ بیٚ بۆ دەستپێوەگرتن؟ بەڵام سەری لێی دەرنەدەچوو. ماوەیەك بوو هەموو شتێکی نێو ماڵەکان و نێو شار شڵەژابوو. لەوانەیە تەنیا لەبەر ئەوە بووبیٚ کە دەرکەوان و هاووڵاتییەکانی ئێمە ئیتر وریای هیچ شتیٚ نەدەبوون، بەڵام ئیتر دوکتۆر کاتی نەبوو بیر لەوە بکاتەوە. چونکە دەنگی تارۆ لە پشتەوەڕا هات:

ـ دوکتۆر دیسانیش قسەیەکی تر! تەنانەت ئەگەر فشەشت پێی بیٚ: تۆ چەندە لەسەر راستەڕیی؟

ریڤۆ لە تاریکی دا شانی هەڵتەکاندن و گوتی:

ـ بەراستی ئەمن هیچ نازانم، بەڵام تۆ چی لیٚ دەزانیت؟

تارۆ بە بیٚ ئەوەی شلویٚ بیٚ، گوتی:

ـ ئەمن دەگمەن شتێك هەیە نەیزانم.

دوکتۆر راوەستا و تارۆ لە پشتەوەی هەڵخلیسکا. تارۆ خۆی بە شانەکانی ریڤۆ گرتەوە. ریڤۆ پرسیی:

ـ پێت وایە هەموو شتێك لە سەر ژیان دەزانی؟

وەڵامەکە لە تاریکیدا هەر بەو دەنگە هێمنە دووپاتە بۆوە؟

ـ بەڵێ.

کە گەیشتنە کۆڵانێ، زانییان زۆر درەنگە و لەوانەیە سەعات یازدە بێ. شار کش و مات بوو و تەنیا دەنگێکی کپی لێوە دەهات. لوورەی ئامبولانس لە دوورەوە بەرز بۆوە. ئەوان لێی سواری ماشێن بوون و ریڤۆ دایگیرساند و گوتی:

ـ ئەتۆ دەبێ بۆ لەخۆدانی دەرزیی پێشگری بێیتە نەخۆشخانە، بەڵام بۆوەی کۆتایی بەم باسە بهێنین و بەر لەوەی لەو مەسەلەیە قووڵ بیتەوە با بزانی، لە سێ شانس شانسێکت هەیە ئەگەر بە سلامەتی دەربچی.

ـ دوکتۆر ئەتۆش وەك خۆم دەزانی کە ئەم لێکدانەوانە بێ مانان. سەت ساڵ لەمەوبەر پەتایەکی تاعوون حەشیمەتی شارێکی یەکێك لە شارەکانی ئێرانی خاشەبڕ کرد، جگە لەو مردووشۆرەی بۆ ساتێکیش چییە دەستی لە کارەکەی هەڵنەگرتبوو، جووقەواری لێ بڕین.

ریڤۆ بە دەنگکێك کە لەنەکاو لێڵ ببوو گوتی:

ـ ئەو، راست سێهەم شانسەکەی پاراستوویەتی. تەواو، بەڵام ئەوەش راستە کە هێشتا دەبێ زۆر شت لەم رووەوە فێر بین.

خەریك بوون دەچوونە نێو گەڕەکەکانی قەراغ شارەوە. چراکانی ترۆمبیلەکە تیشکی بە کۆڵانە چۆڵەکاندا دەپژاند. راوەستان. لە پێش ترۆمبیلەکەوە ریڤۆ لە تارۆی پرسی، دەیەوێ بچێتە ژوورێ؟ تارۆ وتی ئەرێ. تیشکێك لە ئاسمانەوە روخساری روون دەکردنەوە. ریڤۆ لە پڕ پێکەنینێکی خۆمانەی هاتێ و گوتی:

ـ دەی تارۆ، چ شتێك ناچارت دەکا شان بدەیە بەر ئەم کارە؟

ـ نازانم، لەوانەیە ویژدانم.

ـ کامە ویژدان؟

ـ تێگەیشتن.

تارۆ بەرەو دەرگایماڵەکە گەڕایەوە و ریڤۆ ئیتر روخساری نەدیت هەتا ئەو دەمەی لە ماڵی پیرەمێردە پشووسوارەکە وەژوور کەوتن.

## (٥)

تارۆ بۆ سبەینێکەی دەستبەکار بوو و یەکەمین گرووپی پێك هێنا کە گرووپەکانی دیکەش بە شوێنیدا پێك هاتن.

مەبەستی گێڕەرەوە ئەوە نیە ئەو ڕێکخراوە تەندرووستیانە بکاتە شتێکی زۆر زۆر گرنگ. راستە ئەگەر زۆربەی هاوولاتییەکانی ئێمە لە جێگەی ئەو بوونایە، ئەمڕۆ پێیان خۆش دەبوو رۆڵی ئەوان لەوە گەورەتر نیشان بدەن، بەڵام گێڕەرەوە پێی وایە کاتێك گرینگیی لە رادەبەدەر بدەینە کردەی باش و درەوشاوە، ئەوا رێزێکی تایبەت و ناڕاستەوخۆمان لە خراپە گرتووە. چونکە لەوەها حاڵەتێکدا وامان داناوە کە ئەو کردەوانە بۆیە گرینگن، چونکیٚ دەگمەنن و خراپە و خەمساردی پاڵنەری سەرەکیی کردەوەی مرۆیین و، ئەوەش بۆچوونێکە کە گێڕەرەوە باوەڕی پێی نیە. شەڕ و خراپە کە لە دنیادا هەیە، بەردەوام لە نەزانیەوە سەرچاوە دەگرن و نیازپاکییش ئەگەر لە رووی تێگەیشتنەوە نەبیٚ، لەوانەیە هێندەی خراپە و چەوتی، خەسار و زیانی لیٚ بکەوێتەوە. خەڵك زۆربەیان باشن نەك خراپ، لە راستیدا مەسەلەکەش ئەوە نیە. بەڵکو ئەوان کەم تا زۆر نەزانن و، هەر ئەوەشە ناوی لیٚ دەنریٚ مەزنێتی یا شەرمەزاری. هیواکوژترین شەرمەزارییەکان، شەرمەزاریی ئەو نەزانەیە کە پێی وایە هەموو شتێك دەزانیٚ و هەر بۆیەش ئیزن بە خۆی دەدا ئینسان بکوژێت: رۆحی پیاوکوژ کوێرە و، چاکەی راستەقینە یا ئەڤینی جوان و بێخەوش بە بیٚ گەشبینیی پێویست لە هیچ کویٚ نیە.

هەر بۆیەش ڕێکخراوە تەندروستییەکانی ئێمە کە بە هەوڵ و تێکۆشانی تارۆ پێك هاتن، دەبێ بە ڕەزامەندییەکی بێ لایەنانەوە داوەرییان لەسەر بکرێ. هەر بۆیەش گێڕەرەوە لەخۆڕا بە ئازایەتی و بوێرییەك هەڵناڵێ کە تەنیا گرینگییەکی ژیرانەی تێدا بەدی دەکا، بەڵکو دیسانیش دەبێ بە مێژوونووسی ئەو دڵە پڕخوێن و ئاواتانەی، کە تاعوون لەگەڵ خۆی بۆ هەموو خەڵکەکەی ئێمەی هێنا.

ئەوان کە خۆیان بۆ ڕێکخراوە تەندرووستییەکان تەرخان کرد، لە ڕاستیدا  بەو کارەی خۆیان ڕێزێکی لە ڕادەبەدەریان بەدەست نەهێنا، چونکە دەیانزانی ئەوە تاقە کارێکە کە دەبێ بکرێ. ئەوەی لەگەڵ ئەقڵ یەکی نەدەگرتەوە، ئەوە بوو کە دەست لەسەر دەست دانێین و هیچ نەکەن. ئەو ڕێکخراوانە یارمەتیی هاوولاتیانی ئێمەیان دا، بچنە نێو تاعوونەوە و ئەوانیان قایل کرد بەوەی کاتێك نەخۆشی لە گۆڕێیەن بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵیدا دەبێ چی لەدەستت دێ، بیکەی. لەبەر ئەوەی تاعوون بەو شێوەیە دەبوو بە ئەرکی تاقمێك، بە شێوەی ڕاستەقینەی خۆی واتە بە شێوەی مەسەلەیەك دەردەکەوت کە هەموان لەگەڵی دەستەویەخە بوون.

ئەوە وایە، بەڵام کەس پیرۆزبایی بەو مامۆستایە ناڵێ کە خەڵك فێری ئەوە دەکا، ٢ لە ٢ دەکاتە ٤. لەوانەیە لەبەر ئەوەی پیرۆزبایی پێ بلێنـ کە ئەو ئیشە مەزنەی هەڵبژاردوە. باشتر بڵێین تارۆ و هاوڕێکانی لەبەر ئەوە جێگەی شانازی و دەستخۆشی بوون، کە بڕیاریان دا بیسەلمێنن  دوو لە دوو دەکاتە چوار نەك پێچەوانەکەی، بەڵام با ئەوەش بڵێین کە ئەوان لەم نیازپاکییەیاندا لەگەڵ مامۆستا و لەگەڵ تەواوی ئەوانەی هاوڕای مامۆستان و لە پێناوی شانازیی مرۆڤایەتیدا ژمارەیان لەوە زیاترە کە بیری لێدەکەنەوە، هاودەنگ و هاوڕابوون یا لانیکەم گێڕەرەوە پێی وایە. گێڕەرەوە باش ئاگاداری ئەو ڕەخنەیەیە کە لێی دەگیردرێ. پێی دەگوترێ ئەم کەسانە گیانی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە، بەڵام بەردەوام لە مێژوودا کات و ساتگەلێك بەسەردا دێن کە تێیاندا، ئەوەی ئازابێ و بوێرێ بڵێ دوو لە دوو دەکاتە چوار، دەکوژرێ. مامۆستا باش لەوە ئاگادارە و مەسەلە ئەوە نیە چ سزا یا خەلاتێك چاوەڕێی ئەو بەڵگاندنەیە. مەسەلە ئەوەیە بزانین دوو لە دوو دەکاتە چوار، بەڵێ یان نا؟ بۆ ئەو کۆمەڵە لە

هاووڵاتییانی ئێمە وا گیانی خۆیان خستبووە مەترسییەوە ئەو بڕیارە لە ئاردا بوو کە ئەوان نووقمی تاعوون ببوون (بەڵێ یان نا؟) و دەبوایە بەرەنگاری ببنەوە (بەڵێ یان نا؟)

گەلێك ئەخلاقگەرای تازەپێگەیشتوو لە شارەکەی ئێمەدا وەشوێن کاری خۆیان دەکەوتن و دەیانگوت هیچ کارێك سوودی نیە و دەبێ بە چۆکدا بێن و تارۆ و ریڤۆ و هاوڕێکانیان دەیانتوانی بەم جۆرە یا بەو شێوەیە وەڵامیان بدەنەوە. بەڵام بەردەوام ئەو ئاکامەی لێ دەکەوتەوە و دەگەیشتنە ئەوەی کە: لە هەر حاڵێکدا دەبێ بەربەرەکانێ بکرێ و نابێ بە چۆکدا بێن. لەسەر یەك مەسەلەکە ئەوە بوو کە چەندی پێیان دەکرێ پێش بە مردنی زیاتری مرۆ و ئاشنابوونیان لەگەڵ دابڕانی تاهەتایی بگرن و، بۆ ئەو کارەش تەنیا یەك رێگە هەبوو و، ئەویش تێکشکاندنی تاعوون بوو. ئەو راستییە سەرسووڕهێنەر نەبوو. تەنیا عەقڵ دەیسەلماند.

بەو هۆیەش سرووشتی بوو کە کاستێلی پیر هەر لەوێ و بەوەندە کەرەسە و ئامرازەی بەدەستیەوەیە، تەواوی باوەڕ و هەموو تین و توانای خۆی بۆ دروستکردنی سیرۆم بخاتە گەڕ. ئەو و ریڤۆ هیوادار بوون ئەگەر بێت و سیرۆمێك هەر لەو میکرۆیە دروست بکرێ وا شارەکەی پیس کردووە، کاریگەرییەکەی لەو سیرۆمگەلە زیاتر دەبێ کە لە دەرەوەڕا دەیهێنن. لەبەر ئەوەی هەر ئەو میکرۆبە، جیاوازییەکی لەگەڵ ڤایرۆسە ناسراوەکەی تاعووندا هەبوو. کاستێل هیوادار بوو، یەکەمین نموونە بە خێرایی ئامادە بکرێ.

دیسان هەر لەبەر ئەوەش ئاسایی بوو کە گرانت بەبێ ئەوەی هیچ نیشانێکی قارەمانێتیی هەبێ، جۆرە ئیشێکی وەك سکرتێری بۆ رێکخراوە تەندرووستییەکان وەئەستۆ بگرێ. بەشێك لەو گرووپە تەندرووستییانەی تارۆ پێکی هێنابوون هێز و توانای خۆیان بۆ پێشگیری لە گەڕەکە پڕ حەشیمەتەکاندا تەرخان کرد. هەوڵیان دەدا پاكوخاوێنیی پێویست لەم گەڕەکانەدا پەرە پێ بدەن. راپۆرتیان لەسەر ئەو عەمبار و ژێرزەمینانەی پاکژ نەکرابوونەوە، دەنووسی. بەشێکی دیکە لەم گرووپانە لەگەڵ پزیشکەکان دەچوونە سەردانی نەخۆشان و راگواستنی نەخۆشەکانیان وەئەستۆ دەگرت و تەنانەت کاتێك شۆفێر نەبوایە ترۆمبیلی گواستنەوەی نەخۆش و مردووەکانیشیان لێ دەخوڕی. تەواوی ئەو کارانە پێویستییان بە یادداشتکردن و سەرژمێری هەبوو و، گرانت وەئەستۆی گرتبوون.

بە باوەڕی گێڕەرەوە، گرانت لەم رووەوە تەنانەت لە ریڤۆش پتر نوێنەری ئەم فەزیلەت و چاکە بێ بەرامبەرە بوو کە رێکخراوە تەندرووستییەکانی وەجوولە دەخست.

بێگومان ئەو بەو نیازپاکییەی تایبەت هی خۆی بوو گوتبووی "بەڵێ"، تەنیا تکای کردبوو لە ئیشە بچووکەکاندا کەڵکی لێ وەرگیردرێ. هێندە بەتەمەن بوو، بۆوەی نەدەبوو لە کارەکانی دیکەشدا یارمەتیی لێ وەرگرن و لە سەعات شەشەوە هەتا هەشتی ئیوارێ کاتی خۆی بۆ ئەم کارە تەرخان بکا. کە ریڤۆ بە دڵگەرمییەوە سوپاسی دەکرد، سەری سوورِ دەما و دەیگوت: " ئەوە کارێکی گران نیە. ئێستا تاعوون لەگۆڕێیە و دەبێ بەرگری لە خۆمان بکەین، روون و ئاشکرایە. ئاخ! خۆزگە تەواوی کارەکان ئەوەندە ساکار بوایەن." و قسەکەی خۆی وەبیر دەهاتەوە. کاتێك نیوەشەوان ئیشی رێکوپێککردنی پسوولەکان تەواو دەبوو، ریڤۆ لەگەڵ گرانت قسەی دەکرد. دواتر تارۆشیان خستبووە نێو ئەم گفتوگۆیانەوە و گرانت بە چێژێکی ئاشکراوە لەگەڵ ئەو دوو هاوڕێیەدا باسی نهێنی و رازەکانی خۆی دەکرد. ئەو جووتە بە وردی چاویان بەسەر ئەو ئیشەوە بوو کە گرانت بە لەسەرەخۆیی و پشوودرێژی لە نێو جەرگەی تاعووندا رایدەپەڕاند. ئەوانیش لە تەنیشت ئەو هەستیان بە جۆرێك هێمنی دەکرد. تارۆ زۆربەی جاران دەیپرسی: "وەزعی ژنە سوارچاکەکە چۆنە؟" و گرانت هەمیشە لە بزەیەکی خەمناکەوە وەڵامی دەدایەوە:" بە یۆرغە دەڕوا". شەوێکیان گرانت گوتی، ئاخری سیفەتی تەڕپۆشی لەسەر ژنەسوارکارەکەی لابردوە و بەژن"زراڤ"ی لە جێگەی داناوە. و لێی زیاد کرد:"ئەوەیان زیاتر لێی دەکاڵێتەوە."جارێکی دیکەش بۆ دوو بیسەرەکەی خۆی رستەی یەکەمی کتێبەکەی بەو شێوەیە گۆڕیبوو:"بەرەبەیانیەکی جوانی مانگی مای، ژنێکی بەژن زراڤ بە سواری ماینێکی سوورباو، بە شەقامە گوڵچنراوەکانی "جەنگەڵی بۆلۆنی"ــدا تێدەپەڕی.

گرانت گوتی:

ـ وا نیە؟ ئاوا جوانتر دەنوێنێ. ئەمن پێم باشتر بوو بنووسم :"لە بەرەبەیانیەکی جوانی مانگی مای دا" چونکە "مانگی مای" حاڵەتی نەرمەغارەکە برێك درێژتر دەکاتەوە.

دوای ئەوە دەرکەوت وشەی بەشکۆ زۆر مێشکی بەخۆوە خەریك کردووە. پێی وا بوو ئەو وشەیە روون نیە و ئەو بە شوێن واتایەکدا دەگەڕا کە یەکجێ وێنەی ئەو ماینە گەردن بەرز و رازاوەیە بکێشێ وا ئەو لە مێشکیدا وێنای کردبوو. "قەڵەو و گۆشتن" جوان نەبوو، تەواو بوو، بەڵام برێك سواو و رەشۆکیانە بوو. " زریقە و بریقەدار" بۆ ساتێك وەسوەسەی کردبوو، بەڵام ئاوازەکەی لەگەڵ رستەکەدا یەکی نەدەگرتەوە. شەوێك سەرکەوتوانە رایگەیاند کە دۆزیویەتەوە:" ماینێکی رەشی مەیلەوسوور". پێی وابوو رەنگی رەش ئەو شکۆ و مەزنێتییەی لەخۆدا حەشار داوە. ریڤۆ گوتی:

ـ ئەوە مەحاڵە.

ـ بۆچی؟

ـ سووربا‌و رەگەزی ئەسپەکە نیشان نادا، بەڵکو نیشاندەری رەنگەکەیەتی.

ـ چ رەنگێك؟

ـ رەنگێك کە هەر شتێك بێ بەڵام رەش نیە.

قسەکە کاری تێکرد و گرانت گوتی:

ـ سوپاس. جا چا نییە تۆم هەی، بەڵام خۆ ئاگات لێیە چەند ئەستەمە.

تارۆ گوتی:

ـ رات لەسەر وشەی رازاوە چییە؟

گرانت سەیری کرد. بیرێکی لێکردەوە و گوتی:

ـ بەڵێ، بەڵێ.

و وردە وردە بزەیەك لە لێوانی گەڕا.

دوای ماوەیەك وتی کە وشەی "گوڵچنراو" ئازاری دەدا. لەبەر ئەوەی لە ئۆرانو مۆنتێلیمار بەولاوە هیچ شوێنێکی دیکەی نەدیبوو. چەند جارێك لە هاورێیانی خۆی پرسیبوو ئاخۆ شەقامەکانی جەنگەڵی بۆلۆنی بە چ شێوەیەك گوڵکاری کراون. ئەگەر راستیتان دەوێ هیچکات سەرنجی ئەوانی رانەکێشابوو، بەڵام دڵنیاییەکەی گرانت ئەوانی تووشی سەرسووڕمان دەکرد و گرانتیش سەری لە دڕدۆنگییەکەی ئەوان سووڕ دەما. "تەنیا هونەرمەندان دەتوانن بە چاوی دڵ ببینن." رۆژێك دوکتۆر

چاوی پێی کەوت کە خەریك بوو باڵ بگرێ. وشەی "گوڵچنراو"ی لەگەڵ "پڕگوڵ" گۆڕیبۆوە. دەستی لێك دەخشاندن. "ئاخرییەکەی خوێنەر دەیانبینێ. هەست دەکا. کوڕینە کرنۆش بەرن." سەرکەوتووانە ڕستەکەی خوێندەوە" بەرەبەیانیەکی جوانی مانگی مای، ژنە سوارچاکێکی بەژن زراڤ، بە سواری ئەسپێکی رازاوەی سووربا و، بە شەقامە پڕگوڵەکانی جەنگەڵی "بۆلۆنی"ـدا تێدەپەڕی."، بەڵام کاتێك سێ وشەی لێك زیادکراو بە دوای یەکدا خوێنرانەوە لە گوێچکەی گرانتدا دەنگدانەوەیەکی ناخۆشی بوو و ئەو زمانی تەتەڵەی کرد. بە پەشۆکاوی لە جێی خۆی دانیشتەوە. ئەوجار ئیزنی لە دوکتۆر خواست. پێویستیی بە بڕێك بیرکردنەوە هەبوو.

لەو جەنگەیەدا بوو کە ئەو لە دایرەی شوێنەواردا شڵەژاویەکی خستەوە و ئەو حاڵەتەی ئەو لەو ڕۆژانەدا کە شارەوانی ناچار بوو بە هێزی کەمترەوە کاری تاقەتپڕووکێن ڕاپەڕێنێ، داخ و کەسەری لێ کەوتەوە. ئەو حاڵەتەی وی زیانی بە ئیدارەی گۆڕین* گەیاند و سەرۆکی ئیدارەکە سەرکۆنەی کرد و پێی گوت، ئەو بۆ کارێك مووچە وەردەگرێ کە جێبەجێی ناکا. سەرۆکی ئیدارەکەی وتی:

ـ وا دیارە تۆ دوای تەواوبوونی کاتی ئیدارە، دڵخوازانە کار بۆ ڕێکخراوە تەندروستییەکان دەکەی! ئەوە پێوەندیی بە منەوە نیە، بەڵام ئەوەی پێوەندیی بە منەوە هەیە کارەکەی تۆیە و، یەکەمین ڕێگەی بە کەڵکبوون لەم دۆخە ترسناکەدا ئەوەیە کارەکەت ڕاپەڕێنی. ئەگەر وا نەبێ شتەکانی دیکە هیچ کەڵکیان نیە.

گرانت بە ریڤۆی گوت:

ـ ڕاست دەکا.

دوکتۆر بۆ سەلماند: بەڵێ ڕاست دەکا.

ـ بەڵام ئەمن شێواوم و نازانم کۆتایی ڕستەکە چ لێ بکەم؟

بیری لەوە کردبۆوە کە وشەی بۆلۆنی لابەرێ، بەڵام ڕوخساری ڕستەکە وای لێدەهات دەتگوت لەبری وشەی شەقامەکان وشەی گوڵ لەسەر شانی قورس دەنوێنێ. دیسانیش بیری

---

*گۆڕین: واتە ناوبراو، تاین. کەسێك یان شتێك کە پێشتر ناوەکەی هاتووە. ئیدارەی گۆڕین، واتە ئەو ئیدارەیەی باسمان کرد. بۆ پێشگرتن لە دووپاتەبوونەوەی ناوەکە.

کردبۆوە کە لەوانەیە بنووسیٚ:" شەقامەکانی جەنگەڵ کە بە گوڵ داپۆشرابوون."، بەڵام بوونی دوو فرمان بە دوای یەکدا لە کۆتایی رستەدا وەکوو چقڵێك بە لەشیدا رۆدەچوو. بەراستی شەوی وا بوو، ئەو زۆر لە ریڤۆ ماندووتر دیار بوو.

بەڵیٚ، ئەو لە سۆنگەی ئەم لێکۆڵینەوەیەوە کە شیلەی گیانی دەمژی ماندوو بوو، بەڵام بەردەوام بوو لەسەر ئەو کۆکردنەوە و سەرژمێرییانەی رێکخراوەکانی تەندرووستی پێویستییان پێی هەبوو. هەموو شەویٚ بە هێمنی و لەسەرەخۆ ژمارەی پسوولەکانی کۆ دەکردنەوە و لەگەڵ خشتەکان دەیخستنەوە سەر یەك و، ئەوپەڕی هەوڵی دەدا بە روونترین شێوە دۆخەکە نیشان بدا. زۆربەی جاران لە یەکێك لە نەخۆشخانەکان خۆی دەگەیاندە ریڤۆ و لە یەکێك لە نووسینگە یا بەشەکاندا داوای مێزێکی لیٚ دەکرد. ئیتر هەر بەو جۆرەی لە شارەوانی لە پشت مێزەکەی خۆی دادەنیشت، بە کاغەزەکانیەوە لە پشت ئەو مێزە دادەمەزرا. و لەو کەش‌وهەوایەدا کە بە هۆی دەرمانی پاکژکەرەوە و بە هەناسەی نەخۆشان خەست ببۆوە، کاغەزەکانی رادەوەشاندن بۆوەی جەوهەرەکەیان وشکەوە بیٚ. لەو ساتەدا بە دڵپاکیەوە هەوڵی دەدا ئیتر بیر لە ژنە "سوارچاکەکەی" نەکاتەوە و تەنیا خەریکی ئیشی پێویست بیٚ.

بەڵیٚ ئەگەر دروست بیٚ، ئەوەی خەڵك حەزیان لێیە نموونە و سەرچەشنێك بۆخۆیان هەڵبژێرن کە ناوی پاڵەوانیان لیٚ دەنێن و، ئەگەر بە شێوەی رەها پێویستە پاڵەوانێك لەم چیرۆکەدا هەبیٚ، گێڕەرەوە هەر ئەم پاڵەوانە کەمبایەخ و بوودەڵەیە پێشنیار دەکات کە برێکی چاکەخوازی لە دڵدا و ئامانجێکی بەرواڵەت گەپجاڕانەی لە مێشکدا بوو. ئەم کارە بەها و بایەخێك بە حەقیقەت دەدا کە شیاوی حەقیقەتە، بە کۆی"دوو لە دوو" کە دەکاتە "چوار" و بە "پاڵەوانێتیی" ئەو کە دەبیٚ پلەی دووهەمی هەبیٚ، واتە پلەیەك کە راست دەکەوێتە دوای ئارەزووی تاسەبارانەی بەختەوەری، بەڵام هەرگیز ناکەوێتە پێشییەوە و لێی تێناپەڕیٚ. هەروەها ئەو کارە تایبەتمەندییەکی تاقانە بە سەربردەی ئێمە دەبەخشیٚ، واتە تایبەتمەندیی پێوەندییەك کە بە هەستی چاکەکاری پێك هاتووە: هەستێك کە نە راشکاوانە خراپە و نە وەك لایەنی دزێوی شانۆیەك سەرنجڕاکیش.

لانیکەم دوکتۆر ریڤۆ کاتێك لە رۆژنامەکاندا پەیام و هاندانەکانی جیهانی دەرەوەی بۆ شاری تاعوونلێدراو دەخوێندنەوە، یا لە رادویٚکانەوە دەیبیستن، وای بیر دەکردەوە. لەگەڵ ئەو

یارمەتییانەدا کە لە زەوی و ئاسمانەوە دەنێردران، هەموو شەوێ لەسەر شەپۆلی رادوێ یا لە بڵاڤۆکاندا، لێکدانەوە و راڤەی پڕ لە بەزەیی یا هاندەرانە، بە سەر ئەم شارە تەریککەوتەیەدا، دەباری. هەموو جارێکیش ئەم راوێژە حەماسی یا فەرمییە، ریڤۆی دەهری دەکرد. دیارە دەیزانی ئەم مشوورخوادرنە روالّەتی نیە، بەڵام هەر بەو زمانە گرێبەستیانەیە دەردەبڕدرا کە مرۆڤەکان هەولّیان دەدا لە رێگەیەوە هاودەنگی و یەکیەتیی خۆیان بە کۆمەڵگەی مرۆیی رابگەیەنن و، ئەو زمانەش لەگەڵ هەوڵە بچووکەکانی رۆژانەی گرانت یەکی نەدەگرتەوە. بۆ وێنە نەیدەتوانی لێکی بداتەوە ئاخۆ بوونی گرانت لە ناخی تاعووندا چ مانایەکی هەیە.

هێندێ جار نیوەشەوێ، لە جەرگەی بێدەنگیی شەوێکدا کە لەوساتەدا چۆڵ ببوو، دوکتۆر ریڤۆ کە بۆ خەوێکی کورت دەچووە نێو جێوبانەکەیەوە، دوگمەی رادوێی بادەدا و لە سنوورەکانی جیهانەوە لە هەزاران کیلۆمەتر ئەو بەرەوە، دەنگی نەناسراو و برایانە، بە ناشارەزایی هەولّیان دەدا هاوخەمیی خۆیان دەربڕن و لە راستیشدا دەریان دەبڕی، بەڵام هەر لەو دەمەشدا ئەوەشیان نیشان دەدا کە مرۆڤ کاتێك بیەوێ لە ژانێکدا بەشدار بێ کە ناتوانێ ببیینێ، لە چ بێدەسەڵاتییەکی قووڵدا گیر دەکا:" ئۆران، ئۆران." لە خۆڕایی ئەو دەنگە دەریاکانی دەبڕی و، لەخۆڕا گوێی دەدایە. قسەکردن دەستی پێدەکرد و دیسان ئەو جودایی و کەلێنە بنەڕەتییەی جوانتر دەردەخست، کە گرانت و بێژەرەکەی لێك نامۆ دەکرد. ئۆران، ئۆران". جا ریڤۆ لەبەرەخۆیەوە دەیگوت:"نەخێر، خۆشویستن دەبێ بەیەکەوە بێ، یا مەرگی بە یەکەوە. رێگەیەکی دیکە بۆ رزگاربوون نیە. ئەوان زۆر دوورن."

## (٦)

بەر لەوەی بگەینە تەشق و لووتکەی تاعوون ئەوەی کە دەبێ باسی بکەین هەوڵە بەردەوام و پەیتاپەیتاکانی دوایین کەسە پێداگرەکانی وەك رامبێرە. ئەوانە، لەو جەنگەیەدا کە بەڵا هەموو هێزەکانی خۆی کۆ دەکردنەوە بۆوەی بەسەر شاریدا بدا و یەکسەر داگیری بکا، لە هەوڵی ئەوەدا بوون بەختەوەرەیی خۆیان وەدەست بێننەوە و ئەو بەشە لە بوونی خۆیان کە هەوڵیان دابوو لە هەموو زیانێك بیپارێزن لە چنگی تاعوونیشی دەربێنن و، ئەوەش رێگەی ئەوان بوو بۆ ملبادان لەو کۆیلایەتییەی هەڕەشەی لێ دەکردن. هەرچەندەش ئەو نکوڵیکردن و ملبادانە ئیتر کاریگەرییەکی نەبوو، گێڕەرەوە پێی وایە ئەوەش مانایەکی بۆخۆی هەبوو و، سەرەڕای پووچی و ناتەباییەکانی، نیشانەی ئەو لووتبەرزی و لەخۆباییبوونە بوو، کە لە تاك بەتاکی ئێمەدا هەبوو.

رامبێر ملەی لەگەڵ تاعوون دەکرد، بۆ ئەوەی نەهێڵێ داگیری بکات. ئێستا بۆی دەرکەوتبوو کە لە رێگەی یاساییەوە ناتوانێ لە شار وەدەرکەوێ، هەروەك بە ریڤۆی گوتبوو بڕیاری دابوو رێگەی دیکە بگرێتەبەر.

رۆژنامەنووسەکە، سەرەتا لە کارەکەرەکانی کافتریاکەوە دەستی پێکرد، بەڵام ئەو کارەکەرانەی ئەو وەبەر پرسیاری دان، بە تایبەتی ئاگاداری ئەو سزا قورسانە بوون کە لە سۆنگەی ئەو جۆرە کارانەوە تووشی دەبوون. تەنانەت جارێکی بیریان لەوە کردەوە کە ئەو دەیەوێ دنەیان بدا.

چاوپێکەوتن لەگەڵ ریڤۆ رێگەیەکی خستبووە بەردەمی. ئەو رۆژە ئەو و ریڤۆ دیسانیش باسی ئەو هەوڵە بێ سوودانەیان کردبوو کە رۆژنامەنووس لە ئیدارە دەوڵەتییەکاندا دابووی. چەند رۆژ دواتر کۆتار لە کۆڵانێ رامبێری بینی و بەو راستگۆییەوە کە لەو رۆژانەدا تێکەڵاوی تەواوی پێوەندییەکانی دەبوو، پێشوازیی لێ کرد. پرسی:

ـ هێشتا هیچت دەست نەکەوتووە؟

ـ نەخێر. هیچ.

ـ ئیدارەکان هیچیان پێ ناکرێ. ئەوانە قسە نابیستن.

ـ وایە، بەڵام ئەمن بە شوێن رێگەیەکی دیکەوەم. دیارە ئەستەمە.

کۆتار گوتی:

ـ بەڵێ. تێدەگەم.

ئەو رێگەیەکی پێ دەزانی و بۆ رامبێری ـ کە سەری سوورِ مابوو ـ روون کردەوە کە ماوەیەکە هاموشۆی تەواوی کافتریاکانی ئۆران دەکا و، لەو کافتریایانەدا کۆمەڵێك برادەری هەن و لە رێگەی ئەوانەوە بەو رێکخستنانەی زانیوە کە خەریکی ئەو جۆرە کاروبارانەن. لە راستیدا کۆتار کە لەو رۆژانەدا خەرج‌وموخاریجی لە داهاتەکەی پتر بوو، بەشداریی کاری قاچاخچێتیی ئەو کەرەسانەی کردبوو کە دابەش کرابوون. خەریکی بازرگانیی جگەرە و مەشرووبی خراپ بوو کە رۆژ بە رۆژ گرانتر دەبوون و لەم رێگەوە سامانێکی کەمی وەسەر یەك نابوو.

رامبێر پرسی:

ـ دڵنیای؟

ـ بەڵێ، پێشنیاریان بە خۆم کردووە.

ـ تۆ ئەو هەلەت نەقۆزتۆتەوە؟

کۆتار بە قەڵافەتێکی ساویلکانەوە گوتی:

ـ بیری خراپ مەکەوە. بۆخۆم بۆیە نەمکردووە، چونکە حەزناکەم برۆم. من بیانووم هەیە بۆ مانەوەم لێرە.

دواى برێك بێدەنگی لێی زیاد کرد:

ـ ناپرسی ئەو بیانوانەم چین؟

رامبێر گوتی:

ـ پێموایە پێوەندییان بە منەوە نیە.

ـ لە لایەکەوە حەقتە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە... بەهەر حاڵ، مەسەلەیەك روونە و ئەویش ئەوەیە کە لەو کاتەوە تاعوونمان پێوەنووساوە، ئێرەم پێخۆشترە.

رامبێر گوێی بۆ ئەم قسانە راگرت و دوایی پرسی:

ـ ئەو رێکخستنانە چۆن دەدۆزرێنەوە؟

کۆتار گوتی:

ـ ئاسان نیە. لەگەڵ من وەرە.

سەعات چواری دوانیوەڕۆ بوو. لە بن میچی ئاسمانێکی قورسدا، شار وردەوردە هەڵدەچۆقی. تەواوی دووکانەکانە سەیوانەکانیان هێنابوونە خوارێ. شۆستەکان چۆڵ بوون. کۆتار و رامبێر کۆڵانە تاقدارەکانیان گرتە بەر و ماوەیەك بە بێ دەنگی رۆیشتن. یەکێك لەو دەموساتانە بوو کە تاعوون خۆی دەشاردەوە. ئەم بێدەنگییە، ئەم مەرگی رەنگ و جووڵانە، دەکرا هەر لەو کاتەدا بە بێدەنگیی مەرگی هاوین و هەروەها مەرگی تاعوونیش لەقەڵەم بدرێ. دیار نەبوو قورسایی هەوا لە سۆنگەی هەڕەشەکانەوەیە یان تەپوتۆز و هەڵقرچان. بۆ دۆزینەوەی تاعوون روانین و بیرکردنەوە پێویست بوو. چونکە تەنیا خۆی لە کۆمەڵێك هێمای شاراوەدا دەردەخست. کۆتار کە لەگەڵی رێککەوتبوو، توانیی سەرنجی رامبێر بۆ وێنە، بۆ لای دیارنەمانی سەگەکان راکێشێ، کە لە راستیدا بە زۆری لە چەقی رێگەکاندا وەردەکەوتن بۆ فێنکاییەکی مەحاڵ هانکەهانکیان بوو.

روویان کردە بۆلڤاری پالمیە Boulevard des palmiers، پلاس درامیان تێپەڕاند و گەیشتنە گەڕەکی لامارین. بە لای چەپەوە کافتریایەك کە رەنگی کەسکی لێدرابوو، خزیبووە بن ساباتێکی کەوانیەوە کە لە پارچەیەکی زەرد ساز کرابوو. کۆتار و رامبێر کە وەژوور کەوتن، ئارەقەی نێوچەوانیان سڕییەوە. لەسەر کورسییەکانی باخەکە کە لە پشت کۆمەڵێك مێزەوە دانرابوون و لە راستیدا لەسەر{مێزەکان}کووپەی کەسك بوون دانیشتن. هۆڵەکە بە تەواوەتی چۆڵ بوو. مێشومەگەز گێزەگێزیان بوو. لەو قەفەزەدا کە لەسەر رەفە کەوانیەکە دایاننابوو

تووتییەکی پەڕ و باڵ هەڵوەریوی لێ بوو، لەسەر چڵەدارەکە کڕ کەوتبوو. کۆمەڵێك تابلۆ بە دیوارەوە بوون کە دیمەنگەلی سەربازییان نیشان دەدا و لە بەر تەونی جاڵجاڵۆکە و لەبەر تۆز و چڵك دیار نەبوون. لەسەر تەواوی مێزە کووپەییەکان تەنانەت لەبەر دەم رامبێریشدا جیقنەی پەلەوەری لێ بوو. ئەو نەیدەزانی ئەو جیقنەومیقنەیە لە کوێوە هاتوون هەتا ئەوەیکە لە قوژبنێکی تاریکەوە، پاش بڕێك دەنگە دەنگ، کەڵەبابێکی زل بە هەڵبەز دابەز هاتە دەرێ.

لەو ساتەدا دەتگوت پلەی گەرما دیسانیش هەڵکشایەوە. کۆتار چاکەتەکەی خۆی داکەند و لە کووپەکەی دا. پیاوێکی وردیلە کە بەروانکەیەکی شین هەتا بەری پێی داگرتبوو، لەو سەری کافتریاکەوە هاتە دەرێ و هەر لە دوورەوە سڵاوی لە کۆتار کرد. بە شەقێکی توند کەڵەبابەکەی لادا و هاتە پێشێ و لە نێو قاسپەقاسپ و زەنازەنای کەڵەبابەکەدا پرسیی حەزتان لە چییە. کۆتار داوای شەرابی سپیی کرد و لە سەروسۆراخی کابرایەکی بە ناوی گارسیای پرسی. وەکی گارسۆنە قوڵەبنەکە دەیگوت چەند رۆژێك بوو نەیاندیبوو بێتە کافتریا.

ـ پێت وایە ئەمشەو بێ؟

ـ گارسۆنەکە گوتی:

ـ خۆ من لە دڵی ئەودا نیم، بەڵام خۆت دەزانی چ سەعاتێك دێ؟

ـ بەڵێ، بەڵام زۆر گرینگ نیە. هەر دەمویست یەکێك لە برادەرەکانمی پێ بناسێنم.

گارسۆن دەستە تەڕەکانی خۆی بە پێشبەندەکەی وشك دەکردنەوە:

ـ ئەها، کاکیشم معامەلەچییە؟

کۆتار گوتی:

ـ بەڵێ.

گارسۆنی کورتەباڵا چڵمی هەڵلوشییەوە و گوتی:

ـ باشە ، ئەمشەو کوڕەکەی بەدووودا دەنێرم ئاگاداری بکاتەوە.

کەدەهاتنە دەرێ، رامبێر پرسیی، مەسەلەی معامەلە چییە؟

ـ قاچاخ! ئەوان لە دەروازەکانی شارەوەماڵی قاچاخ دێنن و دەبەن و بە نرخی گران دەیفرۆشنەوە.

رامبێر گوتی:

ـ باشە! کەوابوو کاری نایاسایی دەکەن؟

ـ دیارە!

شەوێ سەیوانیان هەڵدابوونەوە، تووتی لە قەفەزەکەیدا چەنەوڕی دەکرد و سەر مێزە کووپەییەکان پڕ بوون لە پیاوی بێ چاکەت و باڵتۆ. یەکێکیان کە کڵاوە حەسیرییەکەی بە تیلاکی سەرییەوە نابوو سینگیشی دەتگوت زەوییەکی سووتاوە لە یەخەی کراسە سپیەکەیەوە دەرکەوتبوو، لەگەڵ وەژوورکەوتنی کۆتار هەستایە پێ. بە روخساری رێکوپێك و قاوەیی و چاوی رەشی ورد و ددانە سپیەکانیەوە دەوروبەری سی ساڵانی دەنواند و، دوو سێ ئەموستیلەی لە قامکەکانیدا بوون. وتی:

ـ سڵاو، لە بەرهەیوانەکە پێکێك بخۆینەوە.

بە بێ ئەوەی قسەیەك بکەن خواردیانەوە، ئاخری گارسیا وتی:

ـ چۆنە بچینە دەرەوە؟

بەرەو بەندەرگە داگەڕان و گارسیا پرسیی چیان لێی دەوێ؟ کۆتار گوتی معامەلەیەکی سەتاسەت لە گۆڕێ نیە، بەڵکو دەیەوێ رامبێری پێ بناسێنێ، تەنیا بۆ مەسەلەی بردنەدەرەوە. گارسیا لە پێشەوە دەڕۆیشت و جگەرەی دەکێشا. کۆمەڵە پرسیارێکی دێنایە گۆڕێ و کاتێك باسی رامبێری دەکرد دەیگوت"ئەو"، وەك بڵێی ئاگای لێی نیە لەوێیە، دەیگوت:

ـ بۆ دەیەوێ ئەو کارە بکا؟

ـ ژنەکەی لە فەڕەنسایە.

ـ ئەها!

پاش تاوێك بێدەنگی گوتی:

ـ کاری چییە؟

ـ رۆژنامەنووسە.

ـ ئەوانەی لەو ئیشەدان زۆری لێ دەڕێسن.

رامبێر بێدەنگ بوو. کۆتار گوتی:

ـ برادەری خۆمە.

ماوەیەك بە بێدەنگی رۆیشتن. گەیشتبوونە شوێنەکانی بارخستن کە بۆ پێشگرتن لە چوونی ئەوان میلەی ئاسنینیان لێ کێشابوو، بەڵام ئەوان بەرەو سەیوانێکی بچووك وەرێکەوتن کە تێیدا ماسیی ساردینی سوورکراوەیان دەفرۆشت و بۆنەکەی بەسەریاندا هات. ئاخری گارسیا پرسی:

ـ بەهەر حاڵ ئەم مەسەلەیە کاری من نیە کاری رایۆڵە، ئەمن دەبێ وەیدۆزم . ئەوەش کارێکی سادە نیە.

کۆتار بە هەژاوی پرسی:

ـ بۆ مەگەر خۆی حەشارداوە؟

گارسیا وەڵامی نەدایەوە. لە نزیك سەیوانەکەوە راوەستا و بۆ یەکەمین جار سەیری رامبێری کرد و گوتی:

ـ دووسبەی، سەعاتی یازدە، قولینچکی بینای سەربازگەی گومرك. سەرووی شار.

هات بڕوا، بەڵام رووی لەوان کرد و گوتی:

ـ لە بیرتان نەچێ خەرجی تێدەچێ.

وەبیر هێنانەوەیەك بوو. رامبێر بۆی سەلماند.

ـ بە دڵنیاییەوە.

دوای ماوەیەك رۆژنامەنووس سوپاسی کۆتاری کردو کۆتار بە رووگەشی وتی:

ـ نەخێر، خزمەتی جەنابت بۆ من سەربەزییە. جگە لەوەش تۆ رۆژنامەنووسی و بە گشتی رۆژێك ئەم خزمەتە قەرەبوو دەکەیەوە.

بۆ دووسبەی رامبێر و کۆتار بەو کۆڵانە بێ سێبەر و دوورودرێژانەدا تێپەڕین کە بەرەو سەرووی شار دەچوون. بەشێك لە سەربازگەی گومرك کرابووە نەخۆشخانە و لەبەردەم دەروازەی گەورەدا، کەسانێك راوەستابوون. ئەوانە یا چاوەڕێی چاوپێکەوتن بوون کە محاڵ بوو رێیان بدرێ، یا هاتبوون بە شوێن ئەو زانیارییانەدا، کە سات بە سات خەریك بوو بێنرخ دەبوون. بەهەرحاڵ ئەو کۆبوونەوەیە،

ببووە هۆی هاتوچۆیەکی لەڕادەبەدەر لەو شوێنە. دەکرا وای دانێین کە هەر لەبەر ئەوەش بووە وا ئێرە بۆ شوێنی چاوپێکەوتنی گارسیا و رامبێر دیاری کراوە. کۆتار گوتی:

ـ ئەو پێداگرییەی خەڵك بۆ چوونەدەرەوە بەڕاستی شیاوی بیستنە. لە حاڵێکدا ئەو رووداوانەی خەریکن دەقەومێن، بەڕاستی جێگەی سەرنجن.

رامبێر وەڵامی دایەوە:

ـ بۆمن سەرنجڕاکێش نیە.

ـ بەڵێ وایە جێگەی مەترسییە بۆ مرۆڤ، بەڵام بەر لە تاعوونیش کاتێك مرۆڤ دەیویست بە چوارڕێیانێکی قەرەباڵغدا تێپەڕێ هەر ئەوەندەی مەترسیی لەسەر بوو.

لەو کاتەدا ترۆمبیلەکەی ریڤۆ لە تەنیشتیان راوەستا. تارۆ لێی دەخوڕی و ریڤۆ خەونووچکە دەیبردەوە. بۆ ناساندنیان لەخەو هەستا.

تارۆ گوتی:

ـ ئێمە یەکتر دەناسین. لە هوتێلێکدا دەژین.

جا پێشنیاری بە رامبێر کرد بیگەیەنێتە شاری.

ـ نەخێر لێرە قەراری چاوپێکەوتنمان هەیە.

ریڤۆ سەیری رامبێری کرد و گوتی:

ـ بەڵێ!

کۆتار بەسەرسووڕمانەوە گوتی:

ـ لێکۆڵەر وا بەرەو ئێرە دێ.

کۆتار قەڵافەتی خۆی گۆڕی. هەر بەراستی ئۆسۆن ئەفەنی بە کۆڵانێدا دەهاتە خوارێ و بە هەنگاوی پتەو و رێکو پێك لێیان نزیك دەبۆوە. کاتێك بە بەردەم ئەو گرووپە بچووکەدا تێدەپەڕی دەستی بە سینگیەوە نا. تارۆ گوتی:

ـ سڵاو جەنابی لێکۆڵەر.

لێکۆڵەر وەڵامی دانیشتوانی نێو ترۆمبیلەکەی دایەوە و دوایی سەیرێکی کۆتار و رامبێری کرد کە لە دواوەترەوە راوەستابوون و بە حاڵەتێکی جیددی سەری بۆ لەقاندن. تارۆ، کۆتار و

رۆژنامەنووسەکەی پێ ناساند. لێکۆڵەر بۆ ساتێك سەیری ئاسمانی کرد و ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی سەردەمێکی خەفەتهێنەرە.

ـ جەنابی تارۆ، دەڵێن بەڕێزت بەشداری چالاکیە تەندرووستییەکان بووی. ئەمن ئەو هەولاّنەی تۆم زۆر بە کەیفێ نیە، تۆ پێت وایە نەخۆشینەکە پەرە دەستێنێ؟

ریڤۆ گوتی دەبێ هیوادار بین پەرە نەگرێ و لێکۆڵەر دووپاتەی کردەوە کە دەبێ هیوادار بین، چونکە مەحاڵە بزانین خودا چیی موقەدەر کردووە. تارۆ لێی پرسی ئاخۆ رووداوەکان برەویان بە کارەکەی ئەو داوە؟

ـ بە پێچەوانەوە، ئەو کارانەی ناوی مافی گشتیمان لەسەر داناون کەم دەبنەوە. ئەمن بەس کارم بە لادانی لەرادەبەردەر لەو یاسا نوێیانەیە. خەڵك قەت قەت ئەوەندەی ئێستا رێزیان لە یاساکانی جاران نەگرتووە.

تارۆ گوتی:

ـ لەبەر ئەوەی، لەچاو یاسای ئێستا ئەوان باشتر دیارن.

لێکۆڵەر لەو حاڵەتە خولیاییەی هاتە دەرێ و چاوی لەسەر ئاسمان هەڵگرت و ساردوسڕانە سەیری تارۆی کرد، گوتی:

ـ کەڵکی چییە؟ ئیتر باس لە یاسا نیە باس لە مەحکومکردنە. ئێمە هیچمان لەدەست نایە.

که لێکۆڵەر رۆیشت، کۆتار گوتی:

ـ ئەوەیان یەکەم دوژمنمە.

ترۆمبیلەکە وەڕێکەوت.

ساتێك دواتر رامبێر و کۆتار چاویان بە گارسیا کەوت کە دەهات. ئەو بەبێ ئەوەی ئاماژەیەکیان پێ بکا بەرەو لایان هات و وەك سلاّو گوتی:"دەبێ چاوەڕێ بن."

لە دەورووبەریان، جەماوەر، کە زۆربەیان ژن بوون، لە بێدەنگییەکی بێ سنووردا چاوەڕوان بوون. دەکرێ بڵێی هەموان سەلەیەکیان بە دەستەوە بوو، بەو هیوا پووچەوە کە دەتوانن ئەوانە بگەیەننە خزم و کەسە نەخۆشەکانیان و بەو بۆچوونە شێتانەیەوە کە نەخۆشەکان دەتوانن کەڵك

لەو بژیو و پێداویستیانە وەرگرن. پێشقەرەوڵە چەکدارەکانی بەردەم دەرگەکان چاویان دەگێڕا و جاروبارە هاوارێکی سەیر لەو حەوشەیەوە کە کەوتبووە نێوان سەربازگە و دەرگەی چوونە دەرەوەڕا دەبیسترا. ئیتر لە نێو جەماوەرەکەدا روخسارە پەشۆکاوەکان بەرەو نەخۆشخانە وەردەسووڕان.

سێ پیاوەکە سەیری دیمەنەکەیان دەکرد، کە لە پشت سەریانەوە گوێیان لە سڵاوێکی گەرموگوڕ بوو و ئاوڕیان دایەوە. رایۆل سەرەڕای گەرماکە، جلوبەرگێکی پۆشتە و رێکوپێکی پۆشیبوو. ئەو کە کەڵەگەت و بەخۆوە بوو، قاتێکی بۆری پۆشیبوو و کڵاوێکی لەنگەریی کە لێوارێکیانی هەڵگەڕابۆوە لەسەر نابوو. روخساری زۆر هەڵبزرکا بوو. چاوەکانی خورمایی بوون و لێو و لیچێکی تێکقوپاوی هەبوو و بەپەلە و روون قسەی دەکرد.

گوتی:

ـ بەرەو خوارووی شار داکشێن. گارسیا دەکرێ تۆ بە جێمان بهێڵی.

گارسیا جگەرەیەکی داگیرساند و راوەستا بۆوەی ئەوان دوورکەونەوە. ئەوان بە خێرایی وەڕێکەوتن و خێرایی خۆیان لەگەڵ رایۆل کە کەوتبووە نێوانیانەوە، هاوسەنگ دەکرد. گوتی:

ـ گارسیا بۆی باس کردووم. ئەو کارە دەکرێ. بەهەرحاڵ ئەو کارە بۆ تۆ دە هەزار فرانکی تێ دەچێ.

رامبێر گوتی، قەبووڵمە.

ـ نانی سبەی نیوەڕۆت لە ریستورانتی ئیسپانیایی شەقامی لامارین لەگەڵ من بخۆ.

رامبێر گوتی باشە و رایۆل دەستی گوشی و بۆ یەکەمین جار بزەی هاتێ. کۆتار دوای رۆیشتنی ئەو داوای لێبوردنی کرد کە سبەینێ بێکار نیە و، جگە لەوەش رامبێر خۆی ئیتر پێویستیی بەو نەمابوو.

بۆ سبەینێ کە رۆژنامەنووسەکە لە ریستوانتە ئیسپانیاییەکە وەژوور کەوت، هەموان بەرەو لای ئەو ئاوڕیان داوە. ئەو ژێرزەمینە نیوە تاریکە لە بن کۆڵانێك کە خۆر زەرد و وشکی هەڵگێڕابوو و شوێنی هاتوچۆی کەسانێکی لە گوێن سپانیۆل بوو، بەڵام رایۆل کە لەپشت یەکێك لە مێزەکانی ئەو سەری هۆڵەکەوە دانیشتبوو، ئاماژەیەکی بە رامبێر کرد و رامبێر چوو بۆ لای، ئیتر هەستی پرسیار دامرکایەوە و روخسارەکان گەڕانەوە سەر خواردەنەکان.

لەسەر مێزەکە کابرایەکی ریوەڵە بە ریشێکی تەنکی نەتاشراوەوە کە سەر و سەکتی لە ئەسپ دەچوو، لەگەڵ رایۆل دانیشتبوو. باسکە درێژ و باریکەکانی کە بە مووی رەش داپۆشرابوون، لە قۆڵە هەڵکراوەکانی کراسەکەیەوە وەدەر کەوتبوون. کاتێك بە رامبێر ناسێنرا، ئەو سێ جاران سەری راوەشاند. ناوی نەدرکابوو و کاتێك رایۆل باسی ئەوی دەکرد بە "هاورێکەی خۆمان" ناوی دێنا.

ـ هاورێمان پێی وایە دەتوانێ یارمەتیت بدا. ئەو ئەتۆ...

کە کچە کارەکەری ریستوارنتەکە هاتە پێشێ بۆوەی بزانێ رامبێر حەزی لە چییە، رایۆل قسەکەی خۆی بڕی.

ـ ئەم برادەرەمان تۆ بە دوو برادەری خۆمان دەناسێنێ و ئەوانیش ئەو ئێشکگرەت پێ دەناسێنن کە هاوکاریمان دەکا. دیارە کارەکە هەر ئەوەندە نیە. دەبێ ئێشکگرەکان خۆیان کاتەکە دەسنیشان بکەن. سادەترین رێگە ئەوەیە تۆ بۆ ماوەی چەند شەوێك لە ماڵی یەکێك لەوان کە لە نزیك دەروازەکانەوەیە، بمێنیتەوە، بەڵام دەبێ هاورێمان لە پێشدا پێوەندییە پێویستەکانت بۆ دابین بکا. کاتێك تەواوی کاروبارەکان جێبەجێ بوون تۆ دەبێ کرێیەکەیان پێ بدەی.

هاورێیەکە بۆ جارێکی دیش کەللەبارگینیەکەی خۆی لەقاند و، هەر لەو کاتەدا بەردەوام بۆوە لەسەر خواردنی زەلاتەی بیبار و تەماتە. دوایی بە زمانی فەرەنسی کە بن زاراوەی ئیسپانیایی پێوە دیار بوو، قسەی کرد. پێشنیاری بە رامبێر کرد بۆ دوو سبەی سەعاتی هەشتی بەیانی لەبەردەم کلێسە قەراری چاوپێکەوتن دابنێن. رامبێر گوتی:

ـ دیسانیش دوو رۆژی دیکە.

رایۆل گوتی:

ـ لەبەر ئەوەی زۆر ساکار نیە. دەبێ پیاوی خۆی بۆ بدۆزیتەوە.

کەللە بارگینیەکە جارێکی دیکەش سەروخواری کرد و رامبێر بە نابەدڵییەوە قەبووڵی کرد. باقی کاتی نانخواردن بە شوێن بیانوویەکەوە بوون بۆ قسەکردن، بەڵام هەر ئەوەندەی رامبێر هەڵیدا کە کابرای کەللەبارگینی، یاریزانی فوتباڵە ئیتر کارەکە ئاسان بۆوە. ئەویش خۆی زۆری یاریی کردبوو. باسی کێبڕکێکانی پاڵەوانێتیی فەرەنسا و بایەخی ئیکیپە پرۆفیشناڵەکانی بریتانی و تاکتیکی "w". لە کۆتایی نانخواردندا کابرای شێوە بارگین تەواو هەژابوو. رامبێری بە ناوی

خۆیەوە بانگ دەکرد و هەوڵی دەدا قایلی بکا بەوەی کە لە نێو تیپی تۆپێندا باشترین جێگە، جێگەی " سەنتەری هافبەك" ـە. دەیگوت:

ـ تێدەگەی "سەنتەری هافبەك" ئەو کەسەیە وا یارییەکە دابەش دەکا و فوتباڵ واتە دابەشینی یاری. رامبێر لەگەڵ ئەوەدا کە خۆی هەمیشە لە جێگەی سەنتەری هافبەك یاری دەکرد، لەسەر قسەی ئەو بوو. تەنیا دەنگی رادوێ بوو کە باسەکەی پساندنەوە و پاش چەند مێلۆدییەکی ورووژێنەری بەرز، رایگەیاند، دوێنێ تاعوون ۱۳۷ کەسی کوشتووە. هیچکام لەو پیاوانە هەر بە خەیاڵیشیاندا نەهات. کابرای روخسار بارگینی شانەکانی هەڵتەکاندن و هەستا. رایۆل و رامبێریش وەشوێنی کەوتن.

لە کاتی رۆیشتندا سەنتەر هافبەك دەستی رامبێری بە توندی گوشی و گوتی: ناوم گۆنزالیسە.

ئەو رۆژە بۆ رامبێر بە دوو سەدە بوو. چووە ماڵی ریڤۆ و هەوڵەکانی خۆی بە وردەکارییەوە بۆ گێڕایەوە. دوایی بۆ یەکێك لە چاوپێکەوتنەکان لەگەڵ دوکتۆر چوو. لەبەردەم ماڵێکدا کە نەخۆشێکی جێگەی گومان لەوێ چاوەڕێی ریڤۆ بوو لێی دابڕا. لە داڵانەکەوە دەنگی راکردن و قسەکردن دەبیسرا. هەواڵی هاتنی دوکتۆریان بە ئەندامانی بنەماڵەکە رادەگەیاند. ریڤۆ گوتی:

ـ هیوادارم تارۆ ماتڵ نەبێ.

روخساری شەکەتیی لێ دەباری. رامبێر پرسی:

ـ پەرەئەستاندنی تاعوونەکە خێرایە؟

ریڤۆ گوتی مەسەلە ئەوە نیە و تەنانەت هەڵکشانی خشتەکانیش زۆر خێرا نین. تەنیا کەرەسەی بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ تاعوون، زۆر نیە. گوتی:

ـ ئێمە کەلوپەلمان نیە. لە تەواوی سوپاکانی جیهاندا کەمایەسیی کەلوپەل بە بوونی نەفەر قەرەبوو دەکەنەوە، بەڵام ئێمە نەفەریشمان کەمە.

ـ پزیشك و نێردراوی تەندروستی لەدەرەوەڕا هاتوون؟

ریڤۆ گوتی:

ـ بەڵێ، دە دوکتۆر و نزیك سەت چاودێر. بە رواڵەت زۆرە، بەڵام ئەوەندەیە بە زەحمەت بەشی ئەو حاڵەتی نەخۆشییە دەکا. ئەگەر پەتاکە پەرە بستێنی بە هیچ شێوەیەك بەشەکە پێ راناگا.

ریڤۆ گوێی دایە دەنگە دەنگی نێو ماڵەکەوە و بزەیەکی بۆ رامبێر کرد و گوتی :

ـ بەڵێ، تۆ دەبێ پەلە بکەیت و زووتر سەرکەوی.

روخساری رامبێر برێك تێكچرژا و بە دەنگێکی نزم گوتی:

ـ بۆخۆت دەزانی. ئەمن کە لێرە دەرۆم، لەبەر ئەوەی نیە.

ریڤۆ گوتی، دەزانم، بەڵام رامبێر لەسەری رۆیشت:

ـ ئەمن ـ لانیکەم زۆربەی جاران ـ پێموایە ترسنۆك نیم. تەنانەت دەرفەتی ئەوەشم بۆ رەخساوە کە غیرەت و ئازایەتیم تاقی بکەمەوە، بەڵام هێندێ فکر و خەیاڵ هەن کە خۆیان لەبەر راناگرم و دەرەقەتیان نایەم.

دوکتۆر لە روخساری روانی و گوتی:

ـ تۆ پێی دەگەی.

ـ لەوانەیە، بەڵام تاقەتم نیە بیر لەوە بکەمەوە کە ئەو کارە زۆر بخایەنێ و ئەو لەو ماوەیەدا پیر بێ. پیری لە سی ساڵیەوە دەست پێدەکا و دەبێ کەڵك لە هەموو شتێك وەرگری. نازانم تۆ لێم تێدەگەی؟

ریڤۆ لە بن لێوانەوە گوتی، پێی وایە تێ دەگا. لەو کاتەدا تارۆ بە هەڵەداوان گەیشتێ:

ـ داوام لە پێرپانیلۆ کرد رەگەڵمان کەوێ.

دوکتۆر پرسی:

ـ دەی جا؟

ـ بیرێکی کردەوە و قایل بوو.

ـ خۆشحاڵم. خۆشحاڵم لەوەی دەبینم خۆی باشترە لە ئامۆژگارییەکانی.

تارۆ گوتی:

ـ هەموان ئاوان. بەس دەبێ دەرفەتیان پێ بدرێ.

پێکەنی و چاوێکی لە ریڤۆ داگرت.

ـ لە ژیاندا کاری من ئەوەیە ئەو هەل و دەرفەتانە برەخسێنم.

رامبێر گوتی:

- ببوورن. من دەبێ بڕۆم.

رامبێر لە پێنجشەممەی دیاریکراودا پێنج دەقیقە بەر لە سەعاتی هەشت چووە بەرهەیوانی کلێسە. هەوا هێشتا بە گوێرەی پێویست فێنك بوو. گەواڵە هەوری سپی بە ئاسماندا دەخوشین، کە دوای ماوەیەك تەوژمی گەرما هەڵی دەلووشین.

چیمەنەکان ئەگەرچی وشك ببوون، بەڵام بۆنێکی شێدارییان لێ هەڵدەستا کە هەستی پێنەدەکرا. هەتاو لەودیو ماڵە خۆرهەڵاتییەکانەوە، تەنیا کڵاوە تەواو زێڕینەکەی پەیکەرەی ژاندارکی - کە زینەتی گۆڕەپانەکە بوو- سوور دەکردەوە. زەنگی سەعاتی هەشت لێدرا و رامبێر چەند هەنگاوێکی لە هەیوانە چۆڵەکەدا بەرەو پێشەوە هەڵێنایەوە. لە نێو کلێسەوە دەنگی ئاوازی نزا و بۆنی لێڵی ژێرزەوی و بخور بەرز دەبۆوە. لەنەکاو دەنگەکە کپ بوو. دە قەڵافەتی رەشی زەبەلاح لە کلێسە هاتنە دەرەوە و، بە وردە هەنگاوان بەرەو شار وەڕێ کەوتن.

رامبێر خەریك بوو وەڕەز دەبوو. قەڵافەتگەلی رەش رەشی دیکە لە پلیکانە گەورەکەوە دەهاتنە سەرێ و بەرەو هەیوانەکە دەڕۆیشتن. جگەرەیەکی داگیرساند و دوایی بە بیریدا هات کە لەوانەیە ئێرە جێگەی ئەوە نەبێ.

سەعات هەشت و چارەگێك ئۆرگەکانی کلێسە بە دەنگێکی بەرز دەستیان کرد بە ژەنین. رامبێر لە بن گومبەزە تاریکەکەوە وەژوور کەوت. ساتێك دواتر توانیی ئەو قەڵافەتە رەشانەی بە بەردەمیدا تێپەڕیبوون لە کلێسەکەدا ببینێتەوە. هەموان لە گۆشەیەکەوە لە بەرامبەر شتێکی وەکوو مێحرابدا کە لەمێژ نەبوو پەیکەرێکی "سەن رۆش"ـیان لەسەر دانابوو کۆزیلکەیان بەستبوو. ئەم پەیکەرە لە یەکێك لە کارگەکانی شارەکەماندا بە پەلە ساز کرابوو. لە حاڵی کرنۆش و چۆکداداندا دەتگوت هێشتا خۆیان گرمۆڵە دەکەن و وەك چەند پەڵەیەکی تۆخ لە نێو مژدا دەسووڕێنەوە، لە تاریکیدا نوقم ببوون. لە ژوور سەریانەوە ئۆرگەکە بەردەوام بوو لەسەر ژەنینی ئاوازە بێسنوورەکانی خۆی.

کاتێك رامبێر هاتە دەرەوە گۆنزالیس لە پلیکانەکان دەچووە خوارێ و دەیویست بەرەو شاری بڕوا. بە رۆژنامەنووسی وت:

- پێموابوو رۆیشتووی، هەڵبەت رۆیشتباشی ئاسایی بوو.

بۆی باس کرد کە قەرار بوو دە خولەکد پێش سەعات هەشت هەر لەو نیزیکانە لە تەك هاوڕێکانی یەکتر ببینن، بەڵام ئەوە بیست دەقیقەیە چاوەڕێیانە و ئەوان هێشتا نەهاتوون.

ـ بێ و نەبێ شتێکیان بەسەر هاتووە. پیاو لەو کارەی ئێمەدا قەت ئاسوودە نیە.

ـ قەراری چاوپێکەوتنێکی دیکەی بۆ سبەینێ دانا، کە هەر ئەم کاتە و لەبەردەم مۆنۆمێنتەکەی کوژراوانی شەڕدا یەکتر ببیننەوە. رامبێر ئاخێکی هەڵکێشا و شەپقەکەی بەرە و پشتەسەری برد.

گۆنزالیس بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ ئەوە گرینگ نیە. وای دانێ بۆ گۆڵ لێدانێك دەبێ چیها پێچ و گەوە ببڕی و چیها رۆیشتن و گەڕانەوەت پێویستە.

رامبێر گوتی:

ـ وایە. یاریی تۆپێن هەر هەمووی سەعاتونێوێك دەخایەنێ.

مۆنۆمێنتی کوژراوانی شەڕی ئۆران لەسەر ئەو تاقە خاڵە دانراوە کە لەوێوە دەریا دەبینرێ. ئەوێ جۆرە سەیرانگەیەك بوو کە بە مەودایەکی کەمەوە بە درێژایی کۆمەڵە گابەردێك کە بەسەر بەندەرگەیاندا دەڕوانی، هەڵکەوتبوو. بۆ سبەینێ رامبێر بەر لە هەموان هاتبووە شوێنی مەبەست و بە وردی خەریکی خوێندنەوەی لیستەی کوژراوانی مەیدانی شەڕ بوو. پاش چەند خولەك دوو پیاو لێی نزیك بوونەوە و رواڵەتیانە چاوێکیان لێکرد و رۆیشتن و پاڵیان وە میلەی سەیرانگەکەوە دا و، وایان نواند کە نوقمی سەیرکردنی ئیسکلە بەتاڵەکان و بۆشایین. هەرکیان قەڵافەتیان وەك یەك و بەقەد یەك بوون و هەرکیان شەلواری شین و بلووزی چنراوی قۆڵ کورتی تایبەتی مەلەوانانیان پۆشیبوو. رۆژنامەنووسەکە هێندێك دوور کەوتەوە و لەسەر کورسییەك دانیشت و توانیی لە دەرفەتێکدا سەیریان بکا. ئەوکات تێگەیشت کە بە دڵنیاییەوە هیچیان تەمەنیان لە بیستساڵ تێنەدەپەڕی، لەو کاتەدا گۆنزالیسی بینی کە بەرەو ئەو دەهات. گۆنزالیس داوای لێبوردنی کرد و گوتی:

ـ ئەوانەن هاوڕێکانمان. و بردی بۆ لای دوو گەنجەکە و بە ناوەکانی مارسیل و لۆیی ناساندنی. ئەو جووتە لە بەرەوڕووەوە زۆر لێك دەچوون و رامبێر وای زانی بران. گۆنزالیس گوتی:

ـ دەی باشە. ئەوە یەکدیتان ناسی. با بچینە سەر مەسەلەکە.

ئەو کات مارسیل یا لۆیی گوتی نۆرە ئێشکگریی ئەوان دوو رۆژی دیکە دەست پێ دەکا و حەوتووەك دەخایەنێ و دەبێ لەبارترین رۆژ دیاری بکەن. ئەوان چوار کەس بوون کە لەبەر دەم دەروازەی رۆژاواییەوە ئێشکیان دەگرت و دووانەکەی تر سەرباز بوون. هیچ باش نەبوو ئەو دووەی دیکە تێوەردەن. ئەوان جێگەی متمانە نەبوون و جگە لەوەش ئەو کارە خەرجەکەی پتر دەکرد، بەڵام زۆربەی جاران وا دەهاتە پێشێ کە ئەو جووتە دەڕۆیشتن بۆوەی بەشێك لە شەو لە هۆڵی پشتەوەی "بارِ"ێکدا رابوێرن کە پێیان دەزانی.

مارسیل یا لۆیی پێشنیاری بە رامبێر دەکرد کە با ئەو لە ماڵی ئەوان کە لە نزیك ئیسکلەکانەوەیە بمێنێتەوە و چاوەڕێ بێ بێن بە دوایدا. پەڕینەوە بەو شێوەیە، تەواو ئاسان دەبۆوە، بەڵام دەبوو پەلەی بکەن چونکە ماوەیەك بوو باسی ئەوە هەبوو کە ئێشکگرەکانی دەرەوەی شار زیاتر بکەن.

رامبێر قەبووڵی کرد و چەند دانەیەك لە دوایین جگەرەکانی کە مابووی بۆ راداشتن. یەکێکیان کە هێشتا قسەی نەکردبوو، لە گۆنزالیسی پرسی ئاخۆ مەسەلەی خەرج و موخاریجەکەی براوەتەوە؟ و ئاخۆ دەتوانن پێشەکی شتێکی لێ وەرگرن؟

گۆنزالیس گوتی:

ـ نەخێر پێویست نیە خۆمانەیە. هەر رۆژی رۆیشتنەکە وەریدەگرین.

قەراری چاوپێکەوتنێکی دیکە دانرا. گۆنزالیس پێشنیاری کرد نانی دووسبەی شەو لە ریستورانتە ئیسپانیاییەکە بخۆن. لەوێوە دەکرا بچنە ماڵی پاسەوانەکان. بە رامبێریشی گوت:

ـ یەکەم شەو خۆیشم لەگەڵتا دێم.

بۆ سبەینێ کاتێك رامبێر دەچووە ژوورەکەی خۆی لە پلیکانی هۆتێلەکە تووشی تارۆ هات. تارۆ گوتی:

ـ ئەمن دەمەوێ بچمە شوێن ریڤۆ. گەرەکتە بێی؟

رامبێر دوای ساتێك دڕدۆنگی گوتی:ـ ئاخر دەڵێم نەکا زەحمەتی بدەم.

ـ پێم وا نیە. ئەو لای من زۆری باسی تۆ کردووە.

رۆژنامەنووس بیری کردەوە و گوتی:

ـ گویێ بدەیە، ئەگەر دوای شیوخواردن کاتتان هەبوو، تەنانەت ئەگەر درەنگیش بوو پێکەوە وەرنە بارِی هۆتێلەکە.

تارۆ گوتی:

ـ ئەوە پێوەندیی بەو و بە تاعوونەوە هەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا، ریۆ و تارۆ سەعات یازدەی شەوێ گەیشتنە نێو کۆڵانە تەسك و تاریکەکەوە. نزیك بە سی کەس پاڵیان وەیەکتر دابوو و، بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد. دوو کەسی تازە هاتوو کە لە شارە تاعوونلێدراوەکەوە دەهاتن، بۆ ساتێك کاس و ورِ بوون و راوەستان. دوایی کاتێك دیتیان هێشتا مەشرووبەکە دەدرێ، زانیان ئەو دەنگەدەنگە بۆ چییە. رامبێر لەوسەری هەیوانەکەوە بوو و لەسەر چرپاکەیەوە ئاماژەی پێ دەکردن. تارۆ بە مێشکێکی ئاسوودەوە، کرِیارێکی دەم بە هەرای لادا و هەر دووکیان گەیشتنە لای رامبێر.

ـ تۆ لە ئەلکۆل (کحول) ناترسی؟

تارۆ گوتی:

ـ نەخێر بە پێچەوانەوە.

ریۆ لە دەفرەکەی خۆی بەرامەی گیایەکی تاڵی هەڵمژی. قسەکردن لەو زەنازەنایەدا دژوار بوو، بەڵام وێدەچوو رامبێر نوقمی خواردنەوە بێ. دوکتۆر نەیدەزانی داوەری بکا لەسەر ئەوەی ئاخۆ مەست ئەو بووە یان نا؟

لەسەر یەکێك لەو مێزانەی کە باقی ئەو شوێنە بەرتەسکەی داگرتبوو ئەفسەرێکی هێزی دەریایی دانیشتبوو کە هەر کام لە قۆڵەکانی لە قۆڵی ژنێکدا بوون و بۆ یەکێکی قەڵەوە و پرِ خوێن باسی پەتایەکی گەروەخرِەی لە قاهیرە دەکرد. دەیگوت:

" ئۆردووگایەکیان بۆ خەڵکە خۆجێییەکە ساز کردبوو. خێوەتیان بۆ نەخۆشەکان هەڵدابوو و پاسەوان دەوری ئۆردووگاکەیان گرتبوو و ،هەر بنەماڵەیەك بە قاچاغ سەردانی کردبایەن تەقەیان لێ دەکرد. کارێکی توندوتیژانە بوو، بەڵام بەجێ بوو."

لەسەر مێزەکەی دیکە کە کۆمەڵێك گەنجی ڕێکپۆشی لێ دانیشتبوون دیار نەبوو باسی چی دەکرێ و لە نێو ڕیتمی ئاوازی Saint james Infirmary " کە لە قەوانەکەی سەرەوەڕا دەهات ون دەبوو.

ریڤۆ دەنگی وەسەرووی خست و پرسی:

ـ قایلن؟

رامبێر گوتی:

ـ بەم زووانە. لەوانەیە هەر لەم حەوتووەشدا بێ.

تارۆ هاواری کرد:

ـ بە داخم.

ـ بۆچی؟

تارۆ لە ریڤۆی ڕوانی و ریڤۆ گوتی:

ـ ئای ، تارۆ بۆیە ئەم قسەیە دەکا چونکە پێی وایە لەوانەیە تۆ لێرە بە کەڵکمان بێی، بەڵام ئەمن باش دەزانم کە تۆ بۆ ڕۆیشتن چەندە بەتاسە و لە کوڵی و، باش تێت دەگەم.

تارۆ داوای دەورێکی دیکەی مەشرووب کرد. رامبێر لە چرپاکەی خۆی هاتە خوارەوە و بۆ یەکەمین جار لە ڕوخساری ورد بۆوە.

ـ ئەمن چم لە دەست دێ بۆ ئێوە؟

تارۆ بە لەسەرەخۆییەوە دەستی بۆ دەفرەکەی خۆی برد و گوتی:

ـ دیارە، لە ڕێکخستنە تەندرووستییەکەماندا.

رامبێر چۆوە ئەو قاوغە تایبەتییەی خۆیەوە کە دەتگوت خەیاڵ هەڵیگرتووە و، دیسان لەسەر چرپاکەی دانیشتەوە. تارۆ کە مەشرووبەکەی خواردبۆوە و بە وردی لە رامبێری دەڕوانی گوتی:

ـ بەڕای تۆ ئەو ڕێکخستنە قازانجی نیە؟

ڕۆژنامەنووسەکە گوتی:

ـ زۆریش بە کەڵکە و مەشرووبەکەی بە سەرییەوە نا.

ریڤۆ زانی دەستەکانی دەلەرزن و، پێی وابوو تەواو سەرخۆشە.

بۆ ڕۆژی دوایی کە رامبێر بۆ دووهەمین جار لە ریستورانتە سپانییاییەکە وەژوور کەوت، بە نێو تاقمێکدا تێپەڕی کە کورسییەکانیان هێنابووە بەردەرگای دەرەوە و لەو ساتەدا کە گەرما بەرەو فێنکایی دەچوو چێژیان لە زەردەپەڕە کەسك و زێڕینەکە وەردەگرت.

نێو ریستورانتەکە کەسێکی وای تێدا نەمابوو، رامبێر چووە پشت مێزەکەی ئەوسەری هۆڵەکە، هەر ئەو مێزەی کە بۆ یەکەمین جار گۆنزالیسی لەسەر دیتبوو. بە کچە خزمەتکارەکەی گوت چاوەڕوان دەبێ. سەعات حەوت‌ونیوی دوانیوەڕۆ بوو. خەڵك وردەوردە هاتنە ژوورەوە و دانیشتن. شیوخواردن دەستی پێکرد و بن میچە نزمەکە بە دەنگی چەقۆ و چەتاڵ و زەنازەنای لێڵ ئاخنرابوو.

سەعات هەشتیش رامبێر هێشتا چاوەڕوان بوو. چراکانیان داگیرساندن. مشتەریی تازە مێزەکانیان پڕ کردەوە. رامبێر داوای خواردنی کرد. سەعات هەشت‌و بیست خولەك بەبێ ئەوەی گونزالیس و دوو گەنجەکە ببینێ، خواردنەکەی تەواو کردبوو. جگەرەی کێشا. هۆڵەکە وردەوردە چۆڵ دەبوو. لە دەرەوە شەو بە خێرایی تاریك دادەهات. شیبایەکی نیوە گەرم کە لە دەریاوە هەڵیکردبوو، بە هێمنی پەردەی پەنجەرەکانی هەڵدەدایەوە. کە بوو بە سەعات نۆ، رامبێر سەیری کرد هۆڵەکە چۆڵ بووە و ژنە خزمەتکارەکە بە سەرسووڕماوییەوە سەیری دەکات. پارەی شیوەکەی دا و وەدەرکەوت. بەرامبەری ریستورانتەکە کافتریایەك ئاوەڵا بوو، رامبێر لە بەرهەیوانەکە دانیشت و چاوی بڕیە دەرگای ریستورانتەکەوە. سەعات نۆونیو بەرەو هوتێلەکە کەوتەوە رێ. نەیدەزانی چۆن گۆنزالیس بدۆزێتەوە. چونکە ناونیشانێکی ئەوی بەدەستەوە نەبوو و بیرکردنەوە لەوەی کە دەبێ لە نووکەوە دەست پێ بکاتەوە، خەریك بوو مێشکی بتەقێنێ.

لەو ساتەدا لە شەوێکدا کە ئامبولانسەکان بە خێرایی تێدەپەڕین، هەروەکی دواتر بە دوکتۆر ریڤۆی گوت، تێگەیشت کە لە تەواوی ئەو ماوەیەدا ژنەکەی لە بیر چۆتەوە و لە بەرامبەردا تەواوی هێزی خۆی کۆ کردبۆوە بۆ دۆزینەوەی رێگەیەکی دەربازبوون لەو دیوارانەی وا ئەویان لە ژنەکەی دادەبڕی. دیسانیش لەو ساتەدا کە تەواوی رێگەکان بۆ جارێکی دیکەش لەسەری دادەخران سەرلەنوێ لە چەقی ئاواتەکانیدا ئەوی دۆزییەوە و ئەو سەرلەنوێ دۆزینەوەیە لەگەڵ تەقینەوەیەکی لەنەکاوی خەم و پەژارەی ئەوتۆ هاوڕێ بوو کە بە راکردن بەرەو هوتێلەکە تێی

قووچاند بۆ ئەوەی لەدەست ئەو ئازارە تاقەتپڕووکێنە دەرباز بێ کە شەویلکەکانی دەهاڕی. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوی {ئازارەکەی} لەگەڵ خۆیدا دەبرد.

سەرەڕای هەمووی ئەوانەش بۆ سبەینێکەی سەردانی دوکتۆر ریڤۆی کرد، بۆوەی لێی بپرسێ چۆن دەتوانێ کۆتار بدۆزێتەوە. گوتی:

ـ تاقە رێگەیەکی بۆم ماوەتەوە ئەوەیە کە سەر لە نوێ ئەو رێگەیەی بڕیومانە، بیگرینەوە بەر.

ریڤۆ گوتی:

ـ سبەی شەوێ وەرەوە. نازانم تارۆ بۆ داوای لێکردووم کۆتار بانگهێشت بکەم. قەرار وایە سەعاتی دە بێت. تۆش دەونیو وەرە.

بۆ سبەینێ کاتێك کۆتار گەیشتە ماڵی دوکتۆر، ریڤۆ و تارۆ سەبارەت بەو چاکبوونەوە چاوەڕواننەکراوە دەدوان کە لە بەشی تارۆدا رووی دابوو.

تارۆ گوتی:

ـ یەك لە دە. ئەو شانسی بووە.

کۆتار گوتی:

ـ ئمم، دیارە. ئەوەیان تاعوون نەبووە.

دڵنیایان کردەوە کە تاعوون بووە. گوتی:

ـ هیچ وێناچێ لەبەر ئەوەی چاك بۆتەوە. ئێوەش وەکی من دەزانن کە تاعوون لە هیچ کەس خۆش نابێ.

ریڤۆ گوتی:

ـ بە گشتی بەڵێ، بەڵام بە هێندێ پێداگرییەوە دەکرێ ئاکامی چاوەڕواننەکراوی لێوەرگری.

کۆتار پێکەنی و گوتی:

ـ روون نیە، ئاماری ئەم شەوت بیست؟

تارۆ کە خێرخوازانە لێی دەڕوانی گوتی، ئاگاداری ئامارەکانە و رەوشەکە دژوارە، بەڵام هەر ئەوە هۆی چییە؟ هۆی ئەوەیە کە دیسانیش دەبێ بڕیاری ناوازە و شێلگیرانەتر بدەن.

ـ دەی خۆ تۆ هەتا ئێستا ئەو بڕیارانەت داوە.

ـ بەڵێ، بەڵام هەرکەسەو دەبێ ئەو بڕیارانە بۆخۆی بدا.

کۆتار لە تارۆی دەڕوانی و هیچی لێ تێنەدەگەیشت. تارۆ گوتی، خەڵکێکی هەتا ئێستاش هیچیان نەکردووە کەچی پەتاکە کاری بەسەر هەموانەوە هەیە و هەرکەسەو دەبێ ئەرکی خۆی راپەڕێنێ. رێکخستنە تەندروستییەکان دەرگایان بۆ هەموان لەسەر پشتە.

کۆتار گوتی:

ـ ئەوەش بیرێکە، بەڵام هیچی لێ شین نابێتەوە. تاعوون زۆر بەهێزە.

تارۆ بە هێمنی گوتی:

ـ ئێمە کاتێك دڵنیا دەبین کە هەموو ئیشەکانمان کردبێ.

لەو جەنگەیەدا ریڤۆ لەسەر مێزەکەی خەریك بوو نەسکی لە پسوولەکان هەڵدەگرتەوە. تارۆ لە کۆتاری دەڕوانی کە لەسەر کورسییەکەی دەجوولا.

ـ جەنابی کۆتار بۆچی تۆش لەگەڵمان نایەی؟

کۆتار بە حاڵەتێکی دڵئێشاوییەوە هەستایە پێ، کڵاوەکەی بە دەستەوە گرت و گوتی:

ـ ئەوە کاری من نیە.

ئینجا بە زمانێکی وەك بەخۆیدا هەڵبڵێ، وتی:

ـ جگە لەوەش ئێستا هەتا تاعوونەکە هەیە، من باشم. ئیتر بۆ دەبێ خۆ لە دامرکاندنەوەی هەڵقوتێنم.

تارۆ وەك بڵێی لە حەقیقەتێك تێگەیشتبێ لە نێوچەوانی خۆی راکێشا و گوتی:

ـ ئاخ، وایە، لە بیرم نەمابوو. ئەگەر تاعوون نەبوایە تۆ دەگیرای.

کۆتار راچڵەکی و وەك بڵێی وەعەرز دەکەوێ، دەستی بە کورسییەکەوە گرت. ریڤۆ دەستی لە نووسین هەڵگرتبوو و بە قەڵافەتێکی جیددی و هۆگرانەوە لێی دەڕوانی. کۆتار پرسی:

ـ کێ ئەوەی پێ گوتووی؟

تارۆ بە قەڵافەتێکی سەرسووڕماوانەوە گوتی:

ـ بۆخۆت. یا لانیکەم ئەمن و دوکتۆر لە قسەکانترا وا تێگەیشتین.

و لەبەر ئەوەی کۆتار تەواو تووڕە ببوو و لە بن لێوانەوە ورتەورتی بوو، تارۆ لەسەری رۆیشت:

ـ تووڕە مەبە. نە دوکتۆر لەو کەسانەیە ئاشکرات بکا و نە منیش. ئەوەی لە تۆ قەوماوە پێوەندیی بە ئێمەوە نیە. جگە لەوەش ئێمە قەت خۆشیمان لە چارەی پۆلیسان نەهاتووە. فەرموو دانیشە.

کۆتار سەیری کورسییەکەی کرد و پاش تۆزە دڕدۆنگییەك دانیشت. دوای ساتێك ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ ئەوە فایلێکی کۆنە و دیسان هەڵتانداوەتەوە. ئەمن پێم وا بوو لەبیر چۆتەوە، بەڵام لەو نێوەدا یەکێك قسەی کردووە. بانگ کراوم و پێیان گوتوومە هەتا کۆتایی لێکۆڵینەوەکان دەبێ لەبەر دەستیاندا بم. دەزانم ئاخری دەسبەسەرم دەکەن.

تارۆ پرسی:

ـ مەسەلەکە گرینگە؟

ـ مەسەلە ئەوەیە ئێوە چۆن بیر دەکەنەوە. هەرچۆنێك بێ، مەسەلەی کوشتن لەگۆڕێ نیە.

ـ سزاکەی بەندیخانەیە یا کاری قورس؟

کۆتار زۆر پەشێو و شڵەژاو دیار بوو:

ـ ئەگەر شانسم هەبێ بەندیخانە...

بەڵام دوای ساتێك بە توندی لەسەری رۆیشت..

ـ هەڵەیەك بوو. هەموو کەس سەهوو دەچێ. و ئەمن بۆم قەبووڵ ناکرێ لەسەر ئەوە بەرۆکم بگرن و لە ماڵەکەم و لە خووخدەم و لە هەموو ئەوانەی دەیانناسم دابڕێم.

تارۆ پرسی:

ـ ئەها، هەر لەبەر ئەوە بوو بڕیارت دا خۆت هەڵواسی؟

ـ بەڵێ، بەڵام کەرێتی بوو.

ریۆ بۆ یەکەمین جار وەقسە هات و بە کۆتاری گوت، لە دڵەڕاوکێکەی تێدەگا، بەڵام لەوانەیە کارەکان جێبەجێ بن.

ـ ئمم، جارێ دەزانم هیچ هەڕەشەیەکم لەسەر نیە.

تارۆ گوتی:

ـ کەواتە دیار بوو تۆ نایەیتە نێو رێکخراوەکەی ئێمەوە.

کۆتار کە کڵاوەکەی لە دەستیدا هەڵدەسووڕاند بە دڕدۆنگییەکەوە سەیرێکی تارۆی کرد و گوتی: نابێ دڵتان لێم بێشێ.

ـ تارۆ بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ دیارە دڵمەند نین، بەڵام لانیکەم بیر لەوە مەکەوە کە بە ئانقەست میکرۆبی تاعوون لە نێو خەڵکدا بڵاو بکەیتەوە.

کۆتار نارەزایەتی دەربڕی و گوتی، خۆ ئەو تاعوونی نەهێناوە و تاعوون خۆی هاتووە و ئێستا کە هاتنی تاعوون کاروباری ئەوی وەڕێ خستوە ئەو چ تاوانێکی هەیە. کاتێك رامبێر گەیشتە بەر دەرگاکە، کۆتار بە لەبزێکی توند دەیگوت:

ـ تازە ئەمن پێم وایە ئێوە دەستتان لە هیچ گیر نابێ.

رامبێر تێگەیشت کە کۆتار بە ناونیشانی گۆنزالیس نازانێ، بەڵام هەمیشە دەکرێ سەردانی کافتریا بچووکەکە بکەن. قەرارێکی چاوپێکەوتنیان بۆ سبەینێ پێکەوە دانا و لەبەر ئەوەیکە ریڤۆ گوتی، دەیەوێ سەرەدەر لەو کارە دەربکات و رامبێر و تارۆی بۆ دوایین شەوی حەوتوو جا هەر سەعاتێك بێ بانگهێشت کرد بۆ ژوورەکەی خۆی.

بەیانی کۆتار و رامبێر گەیشتنە کافتریا بچووکەکە و پەیامێکیان بۆ گارسیا دانا کە هەر ئەو شەوە و دەنا ئەگەر کێشەیەك هەبوو، سبەینێکەی چاوی پێیان بکەوێ. شەوێ هەرچەندە چاوەڕێ بوون سۆراغی نەبوو، بۆ سبەی گارسیا لەوێ بوو. لە بێدەنگیدا گوێی لە بەسەرهاتی رامبێر گرت. ئەو ئاگادار نەبوو، بەڵام دەیزانی کە بیستوچوار سەعات لەوەپێش گەڕەکەکەیان گەمارۆ داوە، بۆوەی بتوانن ماڵان بپشکنن و لەوانەیە گۆنزالیس و دوو گەنجەکە نەیانتوانیبێ لەو کۆسپ و لەمپەرانە تێپەڕن، بەڵام تاقە کارێکی گارسیا دەیتوانی بیکا ئەوە بوو کە دیسان لەگەڵ رایۆل بەیەکیان بگەیەنێتەوە. دیارە هەتا دووسبەی ئەو کارەی پێ نەدەکرا.

رامبێر گوتی:

ـ دیارە دەبێ هەموو شتێ لەسەرڕاوە دەست پێ بکرێتەوە.

دوو سبەی لە گۆشەی کۆلانێکەوە رایۆل شیمانەکەی گارسیای سەلماند. گەڕەکەکانی خوارەوەی شار گەمارۆ درابوون. دەبوو دیسان پێوەندی بە گۆنزالیسەوە بگرنەوە. دوو رۆژ دواتر رامبێر لەگەڵ کاکی یاریزاندا، نانی دەخواردەوە. گۆنزالیس دەیگوت:

ـ مەسخەرەیە. دەبوایە وای رێك بخەین کە یەکتری بدۆزینەوە.

رامبێریش لەسەر ئەو بڕوایە بوو.

ـ بەیانی دەچینە لای کوڕەکان. سوور دەبێ لەسەر ئەوەی کارەکە جێبەجێ بکرێ.

بۆ سبەینێ کوڕەکان لە ماڵەوە نەبوون. پەیامێکیان بۆ دانان و رۆیشتن بۆوەی دوانیوەڕۆ لە مەیدانی لیسێ یەکتر ببینن. و رامبێر بە شێوەیەك گەڕایەوە هوتێل کە دوانیوەڕۆی ئەو رۆژە تارۆ بە دیتنی راچڵەکی و پرسی:

ـ باش نیت.

رامبێر گوتی:

ـ نەخێر لەبەر ئەوەی دەبێ لە سەرڕاوە دەست پێ بکەمەوە.

و بانگهێشتنەکەی دووپاتە کردەوە:

ـ ئەمشەو وەرن.

شەوێ کە ئەو جووتە لە ژوورەکەی رامبێر وەژوور کەوتن، ئەو راکشابوو. هەستایە پێ. ئەو پەرداخانەی ئامادەی کردبوون پڕی کردن. ریڤۆ کاتێك پەرداخەکەی خۆی هەڵدەگرت پرسیاری ئەوەی کرد داخوا کاروبارەکە بە باشی دەچنە پێشێ، رۆژنامەنووس گوتی سەرلەنوێ هەوڵی داوەتەوە و دیسان گەیشتۆتەوە جێگەی پێشوو و بەم زووانە دوایین چاوپێکەوتنی دەبێ. مەشرووبەکەی خواردەوە و دیسان گوتی:

ـ دیارە دیسانیش نایەن.

تارۆ گوتی:

ـ ناکرێ ئەوە بکەیتە رێسایەکی هەمیشەیی.

رامبێر شانەکانی هەڵتەکان و گوتی:

ـ ئەتۆ هێشتا تێی نەگەیوی.

ـ لە چ شتێك؟

ـ لە تاعوون.

ریڤۆ گوتی:

ـ ئەها!

ـ نەخێر، هێشتا تێی نەگەیوی کە بنەمای تاعوون لەسەر ئەوەیە هەمیشە هەموو شتێك لە بنەوەڕا دەست پێ بکاتەوە.

رامبێر چووە گۆشەیەکی ژوورەکەی و گرامافۆنێکی گچکەی پێ کرد. تارۆ پرسی:

ـ ئەوە چ شریتێکە؟ ئەمن دەیناسم.

رامبێر وەڵامی دایەوە کە شریتی Saint James Infirmary ـیە.

لە نیوەی شریتەکەدا دەنگی دوو فیشەك لە دوورەوە هات. تارۆ گوتی:

ـ یا سەگ بوو یا راکردوو.

هێندەی پێنەچوو شریتەکە تەواو بوو و لوورەی ئامبولانسێك بەرز بۆوە و بەرزتر بۆوە بە بەر پەنجەرەی ژوورەکەی هوتێلەکەدا تێپەڕی و بەرەو کزی چوو و هەتا بێدەنگ بوو. رامبیر گوتی:

ـ ئەم شریتە خۆش نیە. لەگەڵ ئەوە دا هەر ئەمڕۆ ئەوە دەهەمین جارە گوێی لێ رادەگرم.

ـ یانی ئەوەندەت حەز لێیەتی؟

ـ نەخێر، بەڵام جگە لەوە شریتی دیکەم نیە.

بڕێکی پێچوو گوتی:

ـ گوتم بڕیارە هەموو شتێ سەر لە نوێ دەست پێ بکرێتەوە.

لە ریڤۆی پرسی کاروباری رێکخستنی تەندرووستی چۆن دەڕواتە پێشێ؟ پێنج گرووپ خەریکی کار بوون و هیوادار بوون بەوەی گرووپی دیکەش پێك بێنن. رۆژنامەنووسەکە لەسەر قەرەوێڵەکەی دانیشتبوو و دەتگوت بە نینۆکەکانیەوە خافڵاوە. ریڤۆ لە جەستەی کورت و تۆکمەی ئەوی روانی کە لە گۆشەیەکی قەروێڵەکەدا گرمۆڵە ببوو. لە پڕ تێگەیی کە رامبێر لێی دەڕوانێ.

رۆژنامەنووسەکە گوتی:

ـ دەزانی دوکتۆر ئەمن زۆرم بیر لە ڕێکخراوەکەی ئێوە کردۆتەوە؟ ئەگەر ئەمن لەگەڵتان نیم هێندێ هۆی هەیە هەر خۆم دەیانزانم. جگە لەوەش پێموایە ئەمن بەشی خۆم کردووە. ئەمن لە شەڕی ئیئیسپانیادا بەشدار بووم.

تارۆ پرسی:

ـ لە کامە ریزدا بووی.

ـ لە ریزی بەزیوەکاندا، بەڵام دوای ئەوە هێندێك بیرم کردۆتەوە.

تارۆ گوتی: بیر لە چی؟

ـ لە ئازایەتی. ئێستا دەزانم کە مرۆڤ شیاوی ئیشی گەورە و مەزنە، بەڵام ئەگەر شیاوی هەستێکی گەورە نەبێ، بەلای منەوە تووزێك ناهێنێ.

تارۆ گوتی:

ـ دەکرێ بڵێین مرۆڤ شیاوی هەموو شتێکە.

ـ نەخێر ناتوانێ بۆ ماوەیەکی زۆر ئازار بچێژێ یان بەختەوەر بێ. کەوابوو هیچ کارێکی پڕ بایەخی لەدەست نایە.

لە یەکتریان روانی. دوایی گوتی:

ـ ئەرێ تارۆ بزانم تۆ دەتوانی بۆ عیشق بمری؟

ـ نازانم، بەڵام پێموایە ئێستا نا!

ـ دەی هەر ئەوە، بەڵام روونە کە تۆ دەتوانی لە پێناوی بیر و باوەڕێکدا بمری.

ئەمن لەو مرۆڤانە وەڕەز بوومە کە لە ڕێگەی بیروباوەڕدا دەمرن. ئەمن باوەڕم بە پاڵەوانێتی نیە و بەو ئاکامە گەیوم کە جەرگبڕە. ئەوەی بە لای منەوە جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە مرۆڤ بژیێ و بۆ ئەو شتە بمرێ کە حەزی لێیەتی و خۆشی دەوێ.

ریڤۆ بە وردی گوێی بۆ قسەکانی رۆژنامەنووس راگرتبوو. لە حاڵێکدا چاوی لەسەر هەڵنەدەگرت بە نەرمی گوتی:

ـ رامبێر، مرۆڤ هزر و بیر نیە.

ـ هزر و بیره. لەو کاتەوە کە روو لە عیشق وەردەگێڕێ، هزرێکی کورتە. ئێمەش شیاوی عیشق نین. با خۆ بە دەستەوە بدەین دوکتۆر، سەبر بگرین هەتا دەبینە شیاوی ئەوە.  جا ئەگەر بەڕاستی نەتوانین وا بین، بەبێ ئەوەی رۆڵی پاڵەوان بگێڕین، با چاوەڕوانی رزگاریی گشتی بین. ئەمن لەوە دوورتر ناڕۆم.

ریڤۆ بە شەکەتییەکەوە کە بە روخسارییەوە دیار بوو، هەستا و گوتی:

ـ تۆ راست دەکەی، زۆریش. بە هیچ شێوەیەك دڵم نایە پاشگەزت بکەمەوە لەو کارەی دەتەوێ بیکەیت و بە رای من راست و باشە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا با پێت بڵێم، لێرە مەسەلە پاڵەوانێتی نیە، بەڵکو مەسەلەی حەیا و شەرەف لەگۆڕێیە. ئەوە باوەڕێکە کە لەوانەیە گاڵتەجاڕانە بنوێنێ، بەڵام تاقانە رێگەی بەربەرەکانێ لەگەڵ تاعووندا شەرافەتە.

رامبێر بە لەبزێك کە لەنەکاو توند ببوو، گوتی:

ـ شەرافەت چییە؟

ـ ئەمن نازانم بە گشتی شەرافەت چ مانایەکی هەیە، بەڵام ئێستا من پێم وایە شەرافەت واتە ئەوەی من ئەرکەکەم راپەڕێنم.

رامبێر بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ ئەها! ئەمن نازانم کارەکەی من چییە. بەڕاستی من هەڵەم کە عیشقم هەڵبژاردووە..

ریڤۆ لە بەرامبەری راوەستا و گوتی:

ـ نا، تۆ بە سەهوو نەچووی.

رامبێر بە تێڕامانەوە سەیرێکی کردن. گوتی:

ئەمن پێموایە ئێوە لەم رووداوەدا هیچ شتێ نادۆڕێنن. لایەنداریکردن لە چاکە، ئاسانترە.

ریڤۆ پەرداخەکەی بە سەریەوە نا و گوتی:

ـ با بڕۆین کارمان هەیە.

وەدەرکەوت.

تارۆش وەدووی کەوت، بەڵام لە کاتی وەدەرکەوتنیدا وەك بڵێی بڕیارێکی دابێ و بەرەو رۆژنامەنووسەکە گەڕایەوە و گوتی:

ـ دەزانی خێزانی ریڤۆ لە چەند کیلۆمەتریی ئێرە لە نەخۆشخانەیەکدا کەوتووە؟

رامبێر بە سەرسوورمانەوە راچڵەکی، بەڵام تارۆ رۆیشتبوو.

بۆ سبەینێ بەیانی زوو رامبێر تەلەفۆنی بۆ دوکتۆر کرد:

ـ لێم قەبووڵ دەکەن کە هەتا ئەو دەمەی رێگەی دەربازبوون دەدۆزمەوە، هاوکاریتان بکەم؟

لەو دیوی تەلەکەوە بێدەنگییەك هەبوو. دوایی:

ـ بەڵێ، سوپاس رامبێر.

بەو شێوەیە بە درێژایی ڕۆژەکانی حەوتوو بەندییەکانی تاعوون چەندەی پێیان کرا هەوڵیان دا و تەنانەت چەند کەسێکیشیان وەکوو رامبێر هێشتا پێیان وابوو وەك ئینسانێکی سەربەست دەجوولێنەوە و، هێشتا دەرفەتیان هەیە هەڵبژێرن، بەڵام بە کردەوە لەو ساتەدا واتە لە نیوەڕاستەکانی مانگی ئۆگۆستدا دەکرا بڵێین تاعوون باڵی بەسەر هەموو شتێدا کێشاوە. ئیتر چارەنووسی تاکەکەسی لە گۆڕێ نەبوو، بەڵکوو ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی بوو کە بریتی بوو لە تاعوون و ئەو هەستەی وا هەموان تێیدا بەشدار بوون. گەورەترین هەستەکان، لێکدابڕان و دوورخرانەوە بوو لەگەڵ ئەو ترس و یاخیبوونەی لەگەڵی بوو. هەر بۆیە گێڕەرەوە پێی وایە لەم خولەی گەرما و نەخۆشیندا باشتر وایە بە گشتی و وەك نموونە، خێرایی هاووڵاتییە زیندووەکانی ئێمە، ناشتنی مردووەکان و ئازاری ئەڤیندارە لێکدابڕاوەکان لێك بداتەوە.

نیوەڕاستەکانی ئەو ساڵە بوو کە بایەك هەڵی کرد و، چەندین ڕۆژ لەسەر یەك بە شاری تاعوونلێدراودا گڤەی هات. خەڵکی ئۆران بەتایبەتی زراویان لە "با" چووە، لەبەر ئەوەی لەسەر ئەو بانوەی وا شارەکەی لەسەر دروست کراوە، هیچ کۆسپ و لەمپەرێکی سرووشتیی لەبەر نیە و، بایەکە بە هەموو تینی خۆیەوە، خۆ بە کۆڵانەکاندا دەکا. دوای ئەو مانگە دوورودرێژانەی دڵۆپە بارانێك شارەکەی فێنك نەکردبۆوە، توێژاڵێکی خۆڵەمێشین دیوارەکانی داپۆشیبوو کە بە دەست بایەکەوە توێتوێ ببوو. بەو شێوەیە "با" شەپۆلێکی لە تەپوتۆز و پەڕ هەڵدەستاند کە، لە لاق و لەتەری ئەو تاقمە کەمە ڕێبوارەی دەدا. ئەو ڕێبوارانەت دەبینی کە بە تاڵووکە بە کۆڵانێدا رادەبرن و، بەرەو پێشەوە نووشتاونەتەوە و دەسرۆکەیەك یان دەستیان بە دەمیانەوە گرتووە. شەوان لەبری ئەوەی لە کۆبوونەواندا هەوڵ بدەن ئەو ڕۆژانەیان درێژتر بکەنەوە کە لەوانەبوو دوا ڕۆژیان بێ، تاقمی بچووك بچووکت دەبینی کە بەپەلەن بۆوەی هەتا زووە بگەنەوە ماڵەکانیان یان خۆ بگەیەننە کافتریاکان. بە جۆرێك کە لە چەند ڕۆژ لەوە پێشەوە لە کاتی ڕۆژئاوابووندا کە ئەو ڕۆژانە خێرا بەسەردا دەهاتن، کۆڵانەکان چۆڵ دەبوون و تەنیا با بەردەوام تێیاندا دەیلووراند. لە دەریاوە کە هەڵچووبوو و، نەشدەبینرا، بۆنی قەوزە و

خویّ هەڵدەستا. لەو کاتەدا ئەو شارە چۆڵە کە لە تەپوتۆزدا سپی هەڵگەڕابوو و لێوڕێژ ببوو لە بۆنەکانی دەریا و لوورەلوورەکانی با، وەك دوورگەیەکی چارەڕەش دەیناڵاند.

هەتا ئەو کاتە تاعوون زیاتر لە گەڕەکانی دەرەوەی شارەکەدا کە قەرەباڵغتر و ناهێمنتر بوو قوربانیی وەرگرتبوو نەك لە نێوەندی شار، بەڵام دەتگوت لە نەکاو لە گەڕەکە بازرگانیەکانیش نزیك بۆوە و لەوێش قۆناغی گرت. دانیشتوانی ئەو گەڕەکانە "با"یەکەیان بەوە تاوانبار دەکرد کە گەرای نەخۆشی هەڵدەگرێ و بڵاوی دەکاتەوە. بەڕێوەبەری هوتێلەکە دەیگوت:"با، پەڕەکان ئاوەژوو دەکاتەوە."، بەڵام بەهەر حاڵ گەڕەکەکانی نێوەندی شار کاتێك نیوەشەوان لە بن گوێچکەیانەوە جار لە جار پتر گوێیان لە دەنگی لوورەی ئامبولانس دەبوو، کە بە تەنیشت پەنجەرەکانیاندا تێدەپەڕی و ئاوازی شووم و بێبەزەیی تاعوونی دەچڕی، دەیانزانی ئیتر نۆبەی ئەوانە.

لە نێو شاریش کەوتنە بیری ئەوەی بەشێك لەو گەڕەکانەی زۆر پیس ببوون جویّ بکەنەوە و جگە لەوانەی کە خزمەتەکەیان زۆر پێویست بوو ئیزن بە هیچ کەس نەدەن وەدەر کەویّ.

ئەوانەی کە هەتا ئەو کاتە لەو گەڕەکانەدا دەژیان، ئەو هەوڵەیان بە ناهەقیەك لە قەڵەم دەدا کە بە تایبەتی دژی ئەوان رێکخراوە و بە هەموو شێوەیەك خەڵکی گەڕەکەکانی دیکەیان بە پێچەوانەی خۆیان، بە خەڵکێکی ئازاد دەزانی. لەو لایشەوە، ئەوانی دیکە لە دژوارترین ساتەکانی ژیاندا کە پێیان وابوو ئازادیی ئەوانیتر لە ئازادیی ئەوان کەمترە، ئۆخژنێکیان دەهاتیّ:"هەمیشە کەسانێك هەن لەمن بەندیترن." ئەوە تاقانە رستەیەك بوو کە لەو رۆژانەدا تاقە هیوای لە خۆیدا کورت دەکردەوە.

دەکریّ بڵێین لەو کاتەدا سووتمانیش یە تایبەتی لە گەڕەکەکانی رابواردن، لە دەروازەی خۆراوای شاردا روو لەزیادبوون بوو. بە پێی زانیارییەکان ئەو سووتمانانە فیتی ئەوانە بوون کە لە دابڕگە(قەرەنتینە) دەگەڕانەوە و لە حاڵێکدا کە بیّهیوایی و ناهومێدی شێتی کردبوون، ماڵەکانی خۆیانیان دەسووتاند، بە هیوای ئەوەی تاعوون لەو ماڵەدا بکووژن. بۆ تێکشکاندنی ئەو کردەوانە کە زیادبوونیان لەگەڵ ئەو با بەتەوژمەی هەڵیکردبوو و لەوانەبوو هەموو گەڕەکەکان بەیەکەوە بسووتێنیّ، تووشی کێشە و زەحمەت بوون. هەوڵیان دا خەڵك تێبگەیەنن

کە پاکژکردنەوەی خانووەکان لە لایەن حکوومەتەوە مەترسیی هەر چەشنە ئالوودەبوونێك لە نێو دەبات، بەڵام کەڵکی نەبوو. ئیتر ناچار بوون سزای قورس بۆ ئەم سووتێنەرە بێتاوانانە ببڕنەوە و پێیان رابگەیەنن. بێ گومان ئەوەی پاشەکشێی بەو چارەڕەشانە کرد، ترسی گرتن نەبوو بەڵکو بڕیارێکی گشتی بوو لەسەر ئەوەی ـ دوای ئەو مەرگە بە کۆمەڵەی لە بەندیخانە بینرابوو ـ سزای زیندان وەك مەرگ وا بوو. بە دڵنیاییەوە ئەو باوەڕە بێ بنەما نەبوو. بە پێی زۆر هۆکاری روون، تاعوون بە تایبەتی پەلاماری ئەوانەی دەدا کە عادەتیان بوو بەکۆمەڵ بژیین، وەکوو سەربازەکان، نیشتەجێیانی کەنیسەکان و، بەندییەکان. چونکە سەرەڕای ئەوەی ژمارەیەکیان لە بەندییەکان جوێ بوون، بە گشتی زیندان شوێنێکی ژیانی بە کۆمەڵە و باشترین هۆ ئەوەیە کە لە بەندیخانەی شارەکەی ئێمەدا بەندییەوانەکانیش وەکوو بەندییەکان، پیتاکی (باج) ی خۆیان بە تاعوون دەدا و بە پێی تیۆریی پێوەندیدار بە تاعوونەوە، هەموو کەسێك هەر لە بەڕێوەبەری بەندیخانەوە بگرە هەتا دەگاتە بەندییەکانی خواری خوارەوەش مەحکووم بوون و لەوانەیە بۆ یەکەمین جار لە بەندیخانەدا بووبێت کە دادپەروەرییەکی تەواو هەبوو.

بەرپرسانی حکوومەتی لە خۆڕا هەوڵیان دا بە دانی میدالیا و نیشان بۆ ئەو بەندییەوانانەی کە لە کاتی بەڕێوەبەریی ئەرکەکانیاندا مردبوون، پلەی جیاواز بۆ ئەم یەکسانی و بەرامبەرییە لەبەرچاو بگرن. لەبەر ئەوەی حاڵەتی نائاسایی سەربازییان راگەیاندبوو و لە لایەکیشەوە دەکرا بڵێی بەندییەوانەکانیش هاوهەڵوێست بوون، دوای مەرگیان نیشانی سەربازییان پێ دان. بەڵام ئەگەرچی بەندییەوانەکان هیچ نارەزایەتییەکیان دەرنەبڕی، بەڵام کۆڕ و کۆبوونەوە سەربازییەکان ئەو کارەیان بە شتێکی شیاو نەزانی و وەبیریان هێنانەوە کە لەوانەیە ئەو کارە شوێنی خراپ لەسەر بیر و ڕای گشتی دابنێ. داواکەی ئەوان لەبەر چاو گیردرا و دیتیان کە سادەترین رێگە ئەوەیە کە مەدالیای پەتا، بدەنە بەندییەوانی گیان لەدەستچوو، بەڵام سەبارەت بەوەی پێشوو تازە کار لە کار ترازابوو و نەدەکرا نیشانەکانیان لێ وەرگرنەوە. کۆڕە سەربازییەکان لەسەر باوەڕەکەی خۆیان سوور بوون، بەڵام نیشانی پەتا ئەو کێشەیەشی هەبوو کە ئەو ئاکامە مەعنەوییەی لە بەخشینی نیشانی سەربازیدا هەبوو، لەویاندا نەبوو. لەبەر ئەوەی لە سەردەمی تاعووندا نیشانی لەو چەشنە زۆر سواو و بێ نرخ بوو. ئەوان ناقایل بوون.

جگە لەوەش بەرپرسانی دادوەری، نەیانتوانی وەکوو بەرپرسە ئایینیەکان و هەتا رادەیەکیش وەك بەرپرسە سەربازییەکانیش بجوولێنەوە. راهیبەکان لە کەنیسەی شاردا بە شێوەی کاتی بەسەر بنەماڵە ئیمانداراەکاندا دابەش ببوون و لە ماڵەکانی ئەواندا گیرسابوونەوە. هەروەها هەر کاتێك دەرفەتێك رەخسابوو، تاقمگەلێکی بچووکیان لە سەربازگەکان جوێ کردبوونەوە و لە قوتابخانە یا بینا حکوومییەکاندا کۆمەڵێك سەربازگەی بچووکیان بۆ ساز کردبوون. بەو شێوەیە پەتاکە، کە بە رواڵەت لە نێو خەڵکی شاریدا و لەوێش بەتایبەتی لە نێو گەمارۆدراوەکاندا هاوخەمییەکی بێوێنەی دروست کردبوو، لە هەمانکاتیشدا دەبووە هۆی تێکشکاندنی کۆمەڵگە کۆنەکان و ئەوانەی هەبوون و، تاکەکانی دەخستەوە ئامێزی تەنیاییانەوە. ئەم حاڵەتەش پشێوی و بێسەروبەرەیی لێ دەکەوتەوە.

دەکرا بڵێی تەواوی ئەو رەوش و دۆخانە لەگەڵ ئەو بایەدا کە هەڵی کردبوو، دەستیان دایە دەستی یەکتر و ئاگریان لە ناخی کۆمەڵە کەسێك بەردا. دیسان لە جەنگەی نیوەشەوێدا پەلاماری دەرگاکانی شارەکە درا و ئەو پەلامارە دووپاتە بۆوە، بەڵام ئەمجارەیان پەلاماردەران تاقمگەلێکی بچووکی چەکدار بوون. هێندێ فیشەکیان بە یەکترییەوە نا. ژمارەیەك بریندار بوون و چەند کەسێکیش بۆی دەرچوون. شوێنەکانی پاسەوانی، بەهێزتر کران و ئەو هەوڵەش خێرا تەواو بوون.

لەگەڵ ئەوەشدا ئاکامی ئەو رووداوانە پێکهێنانی گیانی پشێوی لە شاردا بوو کە دەستدرێژی و پەلامار و تێکهەڵچوونی لێ دەکەوتەوە. ئەو ماڵانەی ئاگریان تێبەردرابوو، یا بەهۆی تەندرووستییەوە داخرابوون، تاڵان کران. لە راستدا ئەستەم بوو وابزانی ئەو کارانە بە پلانی لەوەپێش دارێژراوەوە بەرێوەچووبن. زۆربەی جاران لە دەرفەتێکی کتوپڕدا کەسانێکی کە هەتا ئەو رۆژە خەڵکێکی نەجیم و شەرافەتمەند بوون، دەستیان کرد بە کار و کردەوەی وەها قۆڕ و نەشیاو، کە کتومت لاسایی هەڵسوکەوتی ئەوانی تر بوون. بەو شێوەیە کۆمەڵێك شێت و شوور پەیدابوون کە بە بەرچاوی خاوەن ماڵی ماڵ سووتێنراوەوە، کە پەژارە و ئازار گێژ و وڕی کردبوو، خۆیان بە ماڵەکەیدا کە هێشتا لە سووتماندابوو، دەکرد. کە خەڵکەکە دەیانبینی خاوەن ماڵ هیچ بۆی گرنگ نیە، ئیتر ژمارەیەکی زۆر لە بینەرانیش لاسایی ئەوانیان دەکردەوە و لەو کۆڵانە تاریکەدا و لە ژێر نووری بڵێسەی ئاگرەکاندا کۆمەڵێك تارمایی دەبینران کە

بەملاوئەولادا رایان دەکرد و لە رووناکایی کزی دوایین بڵێسەکاندا بەو کەلوپەلەوە کە لەسەر شانیان بوون، خواروخێچ دەچوونەوە. هەر ئەم رووداوانە وایان لە بەرپرسانی حکوومەتی کرد کە حاڵەتی تاعوون بگێڕنەوە سەر حاڵەتی نائاسایی سەربازی(میلیتاریزە) و ئەو یاساگەلە بەڕێوەبەرن کە لەکاتی میلیتاریزەکردندا دێنە ئاراوە. دوو دزیان گوللەباران کرد، بەڵام ناکرێ بڵێی ئەم کارە شوێنی لەسەر خەڵکی تر دانا لەبەر ئەوەی لە نێو ئەو هەمووە مەرگەدا ئەم دوو ئیعدامە سەرنجی کەسی رانەکێشا: دڵۆپێك لە دەریایەك بوو. لە راستیشدا دیمەنگەلی لەو چەشنە دیسانیش دووپاتە بوونەوە و بەرپرسانی حکوومەتی ئیتر بەرووی خۆیان نەهێنا. تاقانە یاسایەك کە دیار بوو کاریگەریی لەسەر خەڵکی هەبووە، رێساکانی تاریکی بوو. لە سەعات یازدەی شەوێ بەو لاوە شار کە لە تاریکیدا نوقم دەبوو، دەتگوت گاشەبەردێکە.

لە شەوانی مانگەشەودا دیوارە سپیەکان لە راستەکۆڵانەکانی شاردا دەبینران. قەڵافەتی دارێك بە لاپەڕەیەوە دیار نەبوو. هەرگیز دەنگی هیچ رێبوارێك  یا قڕووچکە و نووزەی چوارپێیەك بێدەنگیەکەی نەدەشڵەژاند. لەو کاتانەدا، شاری گەورەی کپ و بێدەنگ، تەنیا بریتی بوو لە کۆمەڵێك شەش پاڵوو(مکعب)ی زەبەلاح و بێ گیان کە لە نێویاندا پەیکەرەی خامۆش و بێ دەنگی چاکەکارە فەرامۆشکراوەکان یا کەڵەپیاوانی پێشوو کە بۆ هەتاهەتایە لە قاوغی خۆیاندا وشك هەڵاتبوون، هەوڵیان دەدا بە روخساری بەردین یا ئاسنینیانەوە روخسارێکی نەگونجاو لەو شتە بخەنە روو، کە پێی دەگوترا مرۆڤ. ئەم "بت"ـە نە گەورە و نە بچووکانە، لە بن ئاسمانی قورسدا و لە چوارڕێیانە دوورەژیانەکاندا ناز و عیشوەیان بە دێوەزمەگەلێك دەبەخشی کە ئەو جیهانە کڕ و کپەی ئێمە چووبووینە ناویەوە، بە جوانی وێنا دەکرد، یا لانیکەم سیستەمی لەو باشتریش و هەر وەها ئەو گۆڕستانەی تێیدا تاعوون و بەرد و شەو، دواجار هەر چەشنە دەنگێکی کپ کردبوو.

بەڵام شەو لە هەموو دڵەکانیشدا هەبوو و، راستەقینە و ئەو ئەفسانانەی کە لە ناشتنی مردووەکان دەیانگێڕانەوە، خەڵکی شارەکەی ئێمەیان دڵنیا نەدەکردەوە، لەبەر ئەوەی  دەبێ باسی ناشتنی مردوانیش بکرێ و، گێڕەرەوە لەبەر ئەوە، داوای لێبوردن دەکا. دەی هەست دەکا لەوانەیە لە سۆنگەی ئەوەدا لۆمە بکرێ، بەڵام تاقە پاکانەیەکی کە دەتوانێ بۆ کارەکەی خۆی بیکا

ئەوەیە کە لە تەواوی ئەو قۆناغەدا کاری ناشتنی مردووان هەروا هەبووە و بە واتایەك، ئەویشیان وەکوو تەواوی خەڵکی دیکەی شارەکەمان ناچار کردبوو کە خۆ لە کاروباری ناشتنی مردووەکان هەڵقوتێنێ. ئەو خۆ تێهەڵقوتاندنەش بەو مانایە نیە کە ئەو حەزی لەو ڕێوڕەسمە بێ، بە پێچەوانەوە ئەو کۆبوونەوەی زیندووەکان و بۆ وێنە مەلەکردنی لە دەریادا پێ خۆشترە، بەڵام بە گشتی مەلەکردن لە دەریادا بەسەرچووبوو و، کۆڕی زیندووان بەردەوام ترسی ئەوەی لەسەر بوو کە جێگەی خۆی بدا بە کۆڕی مردووان. کەوتبووینە دۆخی "بێ پێچوپەنایی"یەوە*. دیارە هەموو کەسێك دەیتوانی خۆی ناچار بکا کە نەیبینێ، چاوی بنوقێنێ و رووی لێ وەرگێڕێ، بەڵام شەفافییەت "بێ پێچوپەنایی" هێزێکی گەورەی هەیە کە دواجار هەموو شتێ رادەماڵێ. بۆ وێنە ئەگەر رۆژێك ئەوانەی خۆشت دەوێن و پێویستییان بە ناشتن هەبێ ئاخۆ دەکرێ خۆی لێ ببوێری؟

دەی باشە! یەکەمین سیفەتێك کە لەسەرەتاوە ئەو ڕێوڕەسمەی دیاری دەکرد پەلەپەل و هەڵپە بوو. هەموو ڕێوڕەسمەکان سادە کرابوونەوە و بە گشتی وازیان لە مردووبەڕێکردن هێنابوو. نەخۆش دوور لە بنەماڵەیان دەمردن و ئیزن نەدەدرا کەس شەوێ لە ژوورسەریان بمێنێتەوە، یانی ئەگەر نەخۆشێك لە شەوێدا مردبایە، شەوێ بێکەس و بێدەر دەمایەوە و ئەوەی کە بە رۆژ مردبایە، دەمودەست دەشاردراوە. دیارە هیچ بنەماڵەیەك لەئارادا نەبوو، بەڵام زۆربەی جاران ئەندامانی بنەماڵە نەیاندەتوانی لە جێگەی خۆیان ببزوون، چونکە لەبەر ئەوەی کە لەگەڵ نەخۆشەکە هاوماڵ بوون لە دابڕگەدا دەژیان. ئەگەر کەس‌وکار لەگەڵ نەخۆشەکە هاوماڵ نەبوونایە لە کاتێکی دیاردا کە ئەویش کاتی رۆیشتن بۆ قەبرستان بوو، خۆیان دەناساند. هەتا ئەو کاتە تەرم شۆردراو و لە تابووت نرابوو.

وای دانێین ئەو ڕێوڕەسمانە لەو نەخۆشخانەیەدا بەڕێوە بچن کە دوکتۆر ریڤۆ بەڕێوەی دەبرد. قوتابخانەکە دەرگایەکی چوونەدەرەوەی هەبوو کە لە پشتەوەی بینا سەرەکییەکەوە کرابۆوە. تابووتەکەیان لە سندووقخانەیەکی گەورەدا دانابوو، کە بەسەر داڵانەکەدا دەکرایەوە. لە خودی داڵانەکەشدا ئەندامەکانی بنەماڵە بەسەر تابووتێکدا دەکەوتن کە لەوەپێش بەسترابوو. لەڕێوە دەچوونە سەر گرینگترین مەسەلەکان واتە، ئیمزاکردنی پسوولەی پێویست لە لایەن گەورەی

* مەبەست ئەوەیە ئیدی نەدەبوو هیچ بشارینەوە و دەبوو رووڕاست بین.

بنەماڵەوە. ئینجا بە ترۆمبیلێك كە تەرمهەڵگرێكی راستەقینە بوو و یا ئامبولانسێكی گەورە بوو كە كردبوویانە تەرمهەڵگر، تەرمەكەیان هەڵدەگرت. ئەندامەكانی بنەماڵە لە یەكێك لەو تەكسیانەدا كە لەوە پێش مۆڵەتی وەرگرتبوو سوار دەبوون و بەو پەڕی خێرایی بە گەڕەكەكانی دەرەوەی شاردا بەرەو گۆڕستانێ دەچوون. لە بەردەم گۆڕستانەكە، سەربازەكان ترۆمبیلەكانیان رادەگرت و مۆرێكیان لەسەر پسوولەی هاتوچۆی فەرمی دەدا، كە بە بێ ئەو مۆرە كەس دەستی بەو شتە رانەدەگەیشت وا خەڵكی شارەكەی ئێمە پێیان دەگوت دونیای ئەودیو. دوایی لادەچوون و ترۆمبیلەكان دەچوونە پێشێ و لە تەنیشت گۆڕەپانێكی چوارگۆشەوە رایاندەگرت كە تێیدا كۆمەڵێك چاڵ و قووڵكە چاوەڕێی پڕبوونەوە بوون. قەشەیەك بە پیر تەرمەكەوە دەهات، لەبەر ئەوەی نوێژی سەر مردووان لە كلێسە وەلا نرابوو. بە نزاو پاڕانەوە تابووتەكەیان دەهێنایەوە دەرێ. پەتێكیان تێ دەخست و رایاندەیانكێشا، تابووت دەخلیسكا و دەگەیشتە ئەوپەڕی چاڵەكەوە. قەشە دەفری ئاوە متفەڕكەكەی خۆی رادەژاند و هەر لەو كاتەشدا، یەكەمین پێمەڕە گڵەكان بەسەر تابووتەكەدا دەكران. ئامبولانسەكە ساتێك دەبوو گەڕابۆوە بۆوەی بە دەرمانی پاكژ كردنەوە بشۆردرێتەوە و لەو جەنگەیەدا كە پێمەڕە گڵەكان بە دەنگێكی كپ دەڕژانە نێو گۆڕەكەوە ئەندامانی بنەماڵەكە خۆیان لە تەكسی دەپەستاوت. چارەگێك دواتر دەگەیشتنەوە ماڵەكانیان.

بەو شێوەیە هەموو شتێك بە راستی بەوپەڕی خێرایی و بە كەمترین ئیمكانی مەترسییەوە بەڕێوە دەچوو. دیارە لانیكەم لە یەكەمین رۆژەكاندا بنەماڵەكان دڵیان بریندار دەبوو، بەڵام لە سەردەمی تاعووندا هێندێ تێبینی هەن كە ناكرێ حیسابیان بۆ بكەی: هەموو شتێكیان بە قوربانی كار و كردەوەیەك كردبوو كە كاریگەر و شوێندانەر بێت. جگە لەوەش سەرەتا ئەو كردەوانە لە دڵی خەڵك گران هاتبوون، چونكە ئەوان زۆرزۆر بەهیوای ئەوە بوون كە مردووەكان بە دامودەستوور و رێوشوێن بنێژرێن. هەر باش بوو زۆری پێنەچوو كە مەسەلەی بژیو زۆر هەستیار بۆوە. خەڵك خەم و فكریان چۆوە سەر كێشە كاتی و پێویستترەكان. خەڵك ناچار بوون ئەگەر بیانەوێ نان بخۆن، دەبێ كاتەكانیان بۆ راوەستان لە ریزەكاندا و بۆ راكەڕاك و رەچاوكردنی یاسا جۆراوجۆرەكان تەرخان بكەن وـ ئیتر كاتی ئەوەیان نەبوو بیر لەوە بكەنەوە كە

خەڵکەکە لە دەورووبەریان چۆناوچۆن دەمرن و، خۆیشیان رۆژێك چۆن سەکەکت دەبن و سلار دەبنەوە. بەو شێوەیە، ئەو کێشە مادییانە کە دەبوو وەك گرفتێك سەیریان بکرێ، ئاکامێکی باشیشی لێکەوتەوە و، ئەگەر پەتاکە وەك دەبینرا پەرەی نەگرتبایە، کاروبارەکان چ عەیبیان نەبوو.

لەبەر ئەوەی تابووت وەدەست نەدەکەوت. کفن و شوێن لە گۆڕستان وەدەست نەدەکەوتن. بە پێویستیان زانی رێگەچارەیەك بدۆزنەوە. دیسان بۆوەی کاروبارەکان بە شێوەیەکی کاریگەر راپەڕێنرێن، سادەترین رێگە ئەوە بوو رێورەسم و دامودەستوورەکان بە شێوەی گشتی جێبەجێ بکەن و بەگوێرەی پێویست هاتوچۆکانی نێوان نەخۆشخانە و گۆڕستان زیاتر بکەن. بۆ وێنە ئەو نەخۆشخانەیەی لە ژێر چاوەدێریی ریڤۆدا بوو، پێنج تابووتی هەبوو. ئەو تابووتانە لەگەڵ پڕ دەبوون، دەخرانە ئامبولانسەکانەوە. لە گۆڕستان تابووتەکان بەتاڵ دەکران و تەرمەکان کە وەکوو ئاسنییان لێهاتبوو دەخرانە سەر قەرەوێڵەی تایەدار و لە شوێنێکی سەرداپۆشراو کە هەر بۆ ئەوە دروست کرابوو، دەپارێزران. تابووتەکان بە ئاوێکی پاکژکەرەوە دەشۆران و دەنێردرانەوە نەخۆشخانە و چەندی پێویست بوایە ئەو کارە دووپاتە دەبۆوە. رێکخراوەکە زۆر رێکوپێك بوو و پارێزگار زۆریان لێ رازی بوو. تەنانەت بە ریڤۆی گوتبوو ئەو شێوازە زۆر لەو عارەبانانەی مردووان کە قولەرەشەکان دەیانکێشان و لە سەربردەی تاعوونەکانی رابردوودا باسیان کرابوو، باشترە.

ریڤۆ گوتی:

ـ بەڵێ، ئەوەش هەر ئەو شێوازە ناشتنەیە، بەو جیاوازییەوە کە ئێمە پسوولە دەنووسین. گومان نیە لەوەدا کە پێشکەوتنێك دەستەبەر بووە.

سەرەڕای سەرکەوتنی بەرپرسانی ئیداری، ئەو حاڵەتە ناخۆشەی ئەمجارەی رێوشوێنەکان پارێزگاری ناچار کرد، نەهێڵێ کەس‌وکاری مردووەکان لە رێورەسمی ناشتنیاندا بەشدار بن. تەنیا رێگە دەدان هەتا بەردەم گۆڕستانەکە بێن، بەڵام ئەوەش بە فەرمی رێگەپێدراو نەبوو. لەبەر ئەوەی لە دوایین رێورەسمی مردووناشتنەکەدا، رەوشەکە بڕێك گۆڕابوو. لەوسەری گۆڕستانەکە، لە شوێنێك کە دارستانێکی چڕی "وەن"ی لێبوو، دوو قوولکەی پان و بەرین

هەڵکەنرابوون. یەکێکیان قووڵکەی پیاوان بوو و ئەویتر بۆ ژنان. لەم رووەوە بەرپرسەکان بنەما ئەخلاقییەکانیان رەچاو دەکردن و دواتر بوو کە لە سۆنگەی تۆبزیی رووداوەکانەوە، ئەو دوایین نیشانەیەی شەرموحەیایەش کۆتایی هات و بە بێ ئەوەی کەس ترسی شەرم و حەیاچوونی هەبێ ژن و پیاویان پێکەوە و بەسەر یەکتردا لە گۆڕ دەنان. باش بوو، ئەوە دوایین پشێویی دوا رۆژەکانی تاعوون بوو. لەو قۆناغەدا وا ئێمە باسی دەکەین قووڵکەی جیاجیا هەبوون و پارێزگار گرینگیی زۆری بەو مەسەلەیە دەدا. لە تەرکی هەرکامیاندا توێژێك قسلّی زیندوو** دەکوڵی و هەڵمی لێ هەڵدەستا و لە تەنیشت قووڵکەکانیش تەپۆڵکەیەك هەر لەو قسڵە لە کەشی سەرئاوەڵادا لەبەر یەك بڵاو دەبوو. کاتێك هاتوچۆی ئامبولانسەکان تەواو دەبوو، تەختە تایەدارەکانیان بە ریز دێنان. تەرمە رووت و برێك گرمۆڵەبووەکانیان لە تەنیشت یەکەوە دەخستنە نێو قووڵکەکەوە. ئەو جارە قسڵ و گڵیان وەسەر دەکردن، بەڵام هەتا ئاستێکی دیاریکراویان گڵ تێدەکردن بۆوەی جێ بۆ ئەو میوانانە بمێنێتەوە کە دواتر دەهاتن. جیاوازییەك کە بۆ وێنە لە نێوان مرۆڤ و سەگەکاندا هەبوو ئەوە بوو کە رۆژی دوایی خزموکەسی ئەوانیان بانگ دەکردن بۆ واژۆکردنی دەفتەرێك. کۆنترۆڵی مردووان هەروا لە ئارادا بوو.

تەواوی ئەو چالاکییانە پێویستییان بە کارمەند و کرێکار هەبوو و، بەردەوام کەسیشیان کەم هەبوو. زۆربەی ئەو پەرستار و گۆڕهەڵکەنانەی کە سەرەتا فەرمی و دواتر تازەکار بوون، بە تاعوون دەمردن. چەندەی خۆشیان دەپاراست، کەچی پەتاکە رۆژێك بەرۆکی ئەوانیشی دەگرت، بەڵام سەیرتر ئەوەیە ،بە درێژایی هەبوونی پەتاکە هەمیشە کەسانێك هەبوون قۆڵی لێ هەڵماڵن و ئەوکارانە راپەڕێنن. کێشەی کارەکە پێوەندیی بەو قۆناغەوە هەبوو کە هێشتا تاعوون نەگەیشتبۆ تەشقی خۆی و نیگەرانیەکانی دوکتۆر ریۆش هەر لەو قۆناغەدا دەستی پێکرد. چونکە نە بۆ ئەو کارە پسپۆڕییانە و نە بۆ ئەو شتەی کە پێیدەگوترا کاری بەپەلە، کەسی پێویستیان لەبەردەست نەبوون، بەڵام لەو کاتەوە تاعوون وردەوردە بەراستی هەموو

---

** قسڵی زیندوو: قسڵ پێش ئەوەی ئاوی پێدا بکرێ و بتەقێ، وەك گیانی لەبەردابێ، هەر کە ئاوی پێدا دەکرێ دەیکاتە تەقەتەق و جووڵە.

شاری تەنیەوە، بەرزبوونەوە و هەڵکشانەکەی پەتاکە، ئەو هەلومەرجە لەبارەشی بەدی هێنا، چونکە تاعوون تەواوی ژیانی ئابووریی ئیفلیج کرد و خەڵکێکی زۆری بێکار خستەوە. زۆربەی کات پسپۆڕ بە گوێرەی پێویست دەست نەدەکەوتن، بەڵام بۆ راپەڕاندنی کاروبارە ئاساییەکان کەسی خۆبەخش بە ئاسانی وەدەست دەکەوتن. ئیدی لەوە بەدواوە دەرکەوت کە هەژاری لە ترس بەهێزترە. چونکە ئەوەندەی مەترسییەکە زیاتر دەبوو، بەو رادەیەش مز و هەقدەستی زیاتریان دەدا. رێکخراوە تەندرووستییەکان توانیان لیستەیەکی ناوی خۆبەشانیان بە دەستەوە بێ، کە هەر جێگەیەك بەتاڵ دەبوو ئەو کەسانەیان ئاگادار دەکردنەوە وا ناوەکەیان لە سەرەوەی لیستەکەوە بوو و، ئەگەر لەونێوەشدا کەسانێك رۆیشتبا،ن دیسانیش کەس هەبوو بانگ بکرێن و جێیەکە پڕ بکەنەوە. بەو شێوەیە پارێزگار کە بۆ ماوەیەك بەگومان بوو لەوەی کەڵك لەو کەسانە وەرگرێ یان نا، ئیتر بەجۆرێك کەوتە زیندانییەکی دوورودرێژ و تاهەتاییان کە ناچار لەو دوایین هەوڵەی پاشگەز بۆوە و باوەڕی وا بوو هەتا ئەو کاتەی کەسانی بێکار هەن دەکرێ پەلە نەکەن.

هەرچۆنێك بوو هەتا کۆتایی مانگی ئۆگۆست هاووڵاتییەکانی ئێمە توانییان ــ ئەگەرچی بە پێی دامودەستوور و رێوشوێن نەبوو ــ لانیکەم بە رێکوپێکی کۆچ بکەن بۆ ماڵەکەی ئەو دنیایان. چونکە بەرپرسان پێیان وابوو ئەرکی خۆیان رادەپەڕێنن، بەڵام بۆ تێگەیشتن لەو دوایین بڕیارانەی دران، دەبێ بڕێك بیر لە رووداوە یەك لە دوای یەکەکان بکەینەوە. لە مانگی ئۆگۆستەوە کە تاعوون لە لاشیپانەی دەرگاکاندا چاوەڕێ بوو، قوربانیی ئەوەندە زۆر ببوون کە گۆڕستانەکەی ئێمە ئیتر جێی نەمابۆوە. دیوارەکانیان تێك دان، بۆوەی لە زەوییەکانی دەوروبەردا جێگەیەك بۆ مردووان بدۆزنەوە، بەڵام دیسان بەشی نەکردن و بە پێویستیان زانی هەتا زووە رێگەیەکی دیکە بدۆزنەوە. سەرەتا بڕیاریان دا مردووەکان بە شەو بنێژن و ئەو کارە لە سەرەتاکاندا هێندێ قازانجی هەبوو: توانییان تەرمێکی زۆر، بخەنە ئامبولانسەکانەوە و چەند رێبوارێکی ناوەختیش کە بە پێچەوانەی یاسا پاش کاتی قەدەغەکراو لە گەڕەکەکانی دەرەوەی شار دەبینران (یا ئەو کەسانەی ئیش و کارەکەیان وای هەڵدەگرت.) جاروبارە ئامبولانسی درێژووکەی سپی سپییان دەبینی کە وەك با دەڕۆیشتن و کۆڵانە چۆڵەکانی شەوانەیان پڕ دەکرد لە لوورەلوور. بە پەلە تەرمەکان دەخرانە نێو قووڵکەکانەوە و لەگەڵ بەربوونەوەیان چەند دمە

پێمەڕەیان قسڵ لەسەر سەر و دەموچاویان ورد دەکردن و لەو قووڵکانەدا کە ڕۆژ بە ڕۆژ قووڵتر دەبوونەوە، خاك هەمووانی وەك نەناسراوێك دادەپۆشی.

لەگەڵ ئەوەشدا برێك دواتر ناچار بوون لە شوێنێکی دیکە بگەڕێن و دیسانیش زەویی دیکە وەرگرن. فەرمانێکی پارێزگاری یەکجاری دەسەڵاتی خاوەنەکانیانی بەسەرەوە نەهێشتن. ئەوەی لە پاش مردووان بەجێدەما دەنێردرانە کوورەی تایبەتیی تەرم سووتاندن. پاش کەمێکی دی پێویست دەبوو قوربانیەکانی تاعوونیش بنێرنە کوورە، بەڵام ناچار بوون سوود لە کۆنە کوورەیەك وەرگرن، کە لە دەرەوەی دەروازەکانی لای خۆرهەڵاتەوە بوو. ریزی ئێشکگرەکانیان دوورتر خستنەوە و کارمەندێکی شارەوانی پێشنیاری کرد، کەڵك لەو شەمەندەفەرە وەرگرن کە تایبەت بۆ لێژاییەکەی کەناری دەریا ساز کرابوو و ئێستێ لەکار کەوتبوو. کورسییەکانیان لابرد و شەمەندەفەرەکانیان بۆ ئەو کارە ئامادە کرد و، هێڵی شەمەندەفەریان گەڕاندەوە سەر کوورەکە، کە لەو سەری هێڵەکەوە بوو. بە درێژایی هاوینیش و لە نێو بارانەکانی بەهارێشدا، خەڵك ریزی سەیر و سەمەرەی شەمەندەفەرە بێ موسافیرەکانیان دەبینی کە لە سەرەولێژییەکەوە دەڕۆنە خوار و ئیتر دەیانزانی ئەم شەمەندەفەرانە چیان پێیە. سەرەڕای ئەوەی کە چەکدارەکان پێشیان بە خەڵك دەگرت بۆوەی نەهێڵن بێنە لێژاییەکە، چەند دەستە و گرووپێك لەو خەڵکە دەخزینە سەر ئەو گاشەبەردانەی بەسەر شەپۆلەکانیاندا دەڕوانی و لە کاتی تێپەڕبوونی شەمەندەفەرەکاندا چەپکە گوڵیان هەڵدەدانە نێویانەوە. ئەوجار دەنگی شەمەندەفەرەکان دەبیسران کە لە ناخی تاریکەشەودا بە تەکانی توند و بە بارێکی گوڵ و مردووەوە تێ دەپەڕین.

لە یەکەمین ڕۆژەکاندا، بەرەبەری بەیانیان دووکەڵێکی خەستو هێڵنجهێنەر ئاسمانی گەڕەکەکانی خۆرهەڵاتی شاری دادەپۆشی. بە رای تەواوی پزیشکەکان ئەو دووکەڵە هەرچەندە ناخۆشیش بوو، بەڵام زیانی بە کەس نەدەگەیاند، بەڵام دانیشتوانی ئەو گەڕەکانە، دەیانگوت تاعوون لەگەڵ ئەو دووکەڵەدا لە ئاسمانەوە بەسەریاندا دەبارێ و هەڕەشەی ئەوەیان کرد کە ئەو شوێنە بەجێ دەهێڵن. ئاخری بەرپرسانی پێوەندیدار ناچار بوون بە کێشانی لوولە(بۆڕی) بە شێوەیەکی پێچەڵاوپێچ دووکەڵەکەیان لە کۆڵ بکەنەوە و ئیتر خەڵك هێور بوونەوە. تەنیا ئەو

رۆژانەی رەشەبا هەڵیدەکرد بۆنێکی لیێڵ لە خۆرهەڵاتەوە بۆیان دەهات و وەبیری دێنانەوە کە کەوتوونەتە دۆخێکی نوێوە و هەموو شەوێ بڵێسەی تاعوون هۆز و عەشیرەتیان رادەماڵێ.

ئەوانە تەشقی کاریگەرییەکانی پەتاکە بوون، بەڵام بەختەوەرانە لەوەی زیاتر نەخایاند لەبەر ئەوەی دەکرێ بڵێی ئەگەر وا نەبایە لەوانەبوو ئیدارەکانی ئێمە و هەوڵەکانی پارێزگاری و تەنانەت کوورەکەش باشاریان نەدەکرد. ریڤۆ دەیزانی بۆ کارێکی لەو چەشنەش پێشبینی هیوابڕاوانە کراوە، وەکوو بە دەریادادانی تەرمەکان و (ئەوەیان) کەفی سامناکی تەرمەکانی ئەو مردووانەی بەسەر ئاوە شینەکانەوە دێنایە پێش چاوەکانی. هەروەها دەیزانی ئەگەر ئامارەکان بەرەوژوور بچن هیچ رێکخراوێك، هەرچەندەش بەرز بێ ناتوانێ خۆی لەبەر راگرێ و خەڵك پۆل پۆل و بە کۆمەڵ لەبەرچاوی یەکتری دەمرن و سەرەرای بوونی پارێزگاریش لە کۆڵانەکاندا بۆگەن دەکەن و شار تووشی رۆژێك دەبێ کە لە گۆڕەپانە گشتییەکاندا نیوەزیندووان بە هەستێکی تێکەڵاو لەگەڵ ڤینێکی رەوا و هیوایەکی لەخۆڕایی بەرۆکی زیندووەکان دەگرن.

ئەوە راستەڤینە بەڵگەنەویستەکان یان کۆمەڵێك بۆچوون و گومان بوون کە نەیاندەهێشت هەستی غوربەت و لێکدابڕان، لە دڵی خەڵکی شارەکەی ئێمەدا بڕەوێتەوە. گێڕەرەوە باش دەزانێ چەندە جێگەی داخ و کەسەرە کە لەم سۆنگەیەوە ناتوانێ باسی هیچ شتێك بکا کە بە راستی شکۆمەند و مەزن بێ، وەکوو چەند پاڵەوانێکی ناودار یا چەند رووداوی درەوشاوە و لە گوێن ئەوانەی لە چیرۆکە کۆنەکاندا بەدی دەکرێن، چون هیچ شتێك وەکوو بەڵایەك بێ ڕەنگ و بێ شێوە نیە و چارەڕەشییە گەورەکان تەنانەت لە رووی ماوە و کاتیشەوە یەك ریتم و یەك ئاوازن. رۆژە سامناکەکانی تاعوون، لەبەر چاوی ئەوانەدا کە دیتوویانە، بە هیچ شێوەیەك وەکوو بڵێسەی بێ سنوور و گیانسوتێن خۆیان نەدەنواند، بەڵکو زیاتر لە هەڵپەڕکێیەکی بەردەوام دەچوون کە لەسەر رێگەی خۆیانەوە هەموو شتێکیان دەهاڕی. نا! تاعوون هیچ پێوەندییەکی بەو وێنا هەژێنەرانەوە نەبوو کە دوکتۆر ریڤۆ لەسەرەتادا هێنابوونیە بەرچاوی خۆی. لە پلەی یەکەمدا شێوازێکی ئیداریی بە پارێز و بێ کەموکووڕیی بوو کە زۆر بە باشی کاری دەکرد. لەم رووەوە بۆ روونکردنەوە دەبێ بڵێین، گێڕەرەوە بۆوەی خەیانەتی بە هیچ شتێ و بە تایبەتیش بە خۆی نەکردبێ، بێلایەنانە ئاوڕی لە لایەنی دەرەکی و داستانیی ئەو شتانە داوەتەوە کە بەچاو دیتوونی. هەرگیز نەیویست لە ژێر

کاریگەریی هونەردا شتێك بگۆڕێ. جیا لەو شتانەی پێویستییە بنەڕەتییەکانی بابەتەکان بوون. هەر ئەم "روانینە بۆ دەرەوەیە" بۆتە هۆی ئەوەی گێڕەرەوە بڕیار بدا کە بڵێ: ئەگەر ئازاری گەورەی ئەو قۆناغە، گشتیترین و قووڵترین ئازاری ئەو لێکدابڕانە بێ و، ئەگەر بەراستی پێویستە لەو سەروبەندەی تاعووندا، بە شێوەیەکی نوێ لێکی بدەینەوە، حەقیقەتێکە کە ئەو ئازارەش لەو سەردەمدا لایەنە دڵتەزێنەکەی خۆی لە دەست دەدا.

ئاخۆ خەڵکی شارەکەی ئێمە یا لانیکەم ئەوانەی زیاتر ژانی ئەو دابڕانەیان چێشتبوو لەگەڵ دۆخەکە راهاتن؟ پشتڕاستکردنەوەی ئەو وتەیە درووست نیە و، راستترە ئەگەر بڵێین باری دەروونی و مەعنەوییشیان وەك جەستەیان لاواز ببوو. لە سەرەتای تاعووندا، بە باشی ئەو بوونەوەرەیان دەهاتەوە بیر کە لە دەستیان دابوو و بۆی بەداخ بوون، بەڵام ئەگەر روخساری ئەو خۆشەویستە یا پێکەنینەکەی یا فلانە رۆژێ کە لەگەڵی بەختەوەر بوون بە روونی هاتباوە بیریان بە زەحمەت دەیانتوانی بیهێننەوە بەرچاوی خۆیان کە ئەو لەو ساتەدا وا ئەوان بیری لێ دەکەنەوە و لەو شوێنانەی ئێستا گەلێکیان لێ دوور بوو، بڵێی خەریکی چ کارێك بێ.

بە گشتی لەو ساتەدا ئەوان یادەوەرییان هەبوو، بەڵام هێزی خەیاڵکردنەوەیان ناتەواو بوو. لە دووهەمین قۆناغی تاعووندا یادەوەرییشیان نەمابوو. نەك بڵێی روخساری ئەویان لەبیر کردبێ بەڵکوو جەستەی ئەویان ون کردبوو و تەنیا لە ناخی خۆیاندا ئەویان دەبینی و ئەگەر لە حەوتووەکانی سەرتادا ویستبایان سکاڵایەك بکەن لەوەی کە تەنیا تارماییەك لە خۆشەویست و ئەڤینەکەیان لا ماوەتەوە، دواتر تێگەیشتن کە لەوانەیە ئەو تارماییانەش لاوازتر ببنەوە و تەنانەت وردە رەنگە هەرە بچووکەشیان لە زەیندا پاك بێتەوە، کە یادگەیان بۆی پاراستبوون. لە کۆتایی ئەو قۆناغە دووروودرێژەی دابڕاندا، ئیتر بیریان لە بێبەشییەکەی خۆیان نەدەکردەوە و نەیاندەزانی چۆن لە تەنیشتیانەوە بوونەوەرێك ژیاوە کە هەردەم دەیانتوانی هەستی پێ بکەن.

لەو رووەوە ئەوان کەوتبوونە چەقی سیستەمی تاعوونەوە و ئەو سیستەمە هەتا پیستر بوایە کاریگەریی لەسەریان پتر بوو. ئیتر لە نێو ئێمەدا هیچ کەس هەستی جوامێرانە و بەرزی نەبوو، بەڵام هەمووان هەست و ئیحساسیان وەك یەکی لێ هات. خەڵکی شارەکەی ئێمە

دەیانگوت:" کاتی ئەوە گەیوە ئەو دۆخە ببڕێتەوە." چونکە لە سەردەمی بەڵا و نەهامەتی‌دا، ئاساییە خەڵك سەرجەم خواخوایان بێ ئازارەکە تەواو بێ و ببڕێتەوە. جگە لەوە بە کردەوەش ئارەزوویان بوو ئەو وەزعە ببڕێتەوە، بەڵام هەر ئەو قسانەش بەبێ کەفوکوڵ و هەستی تاڵی رۆژانی یەکەم و تەنیا بە مەنتقێك کە هێشتا لای ئێمە روون بەڵام زۆر کورت بوو، دەردەبڕدرا. جۆرە داماوییەك جێگەی کەفوکوڵ و هەست و هەژانەکانی رۆژانی یەکەمی گرتبۆوە کە ئەگەر یەکێك بە ملکەچکردن و خۆبەدەستەوەدانی زانیبایە، ئەو کەسە لەهەڵەدا بوو. لەبەر ئەوەی ئەم داماوییە زیاتر جۆرێك رەزامەندیی کاتی بوو.

هاووڵاتییەکانی ئێمە لەگەڵ تاعوونەکە راهاتبوون و دەکرێ بڵێی رەنگی دەورووبەر و ژینگەکەیان گرتبوو، چونکە هیچیان لەدەست نەدەهات. ئاساییە دیسانیش حاڵەتی چارەڕەشی و ئازاریان هەبوو، بەڵام ئیتر هەستیان بە چزووەکەی نەدەکرد. جگە لەوەش بۆ وێنە دوکتۆر ریڤۆ دەیزانی چارەڕەشی هەر ئەوەیە. لەبەر ئەوەی راهاتن لەگەڵ بێ‌هیوایی لە هیوابڕاوییەکە خراپترە. لەمەوبەر دابڕاوەکان بەڕاستی چارەڕەش نەبوون. ترووسکەیەك لە ئازارەکەیاندا هەبوو کە تازە کوژابۆوە. ئێستا لە گۆشەی کۆڵانان لە کافتریاکان و یا لە ماڵی برادەرەکانیان کە وڕو کاس و بە چاوی خەفەتبارەوە دەتبینین، لە سایەی ئەوان شارەکە یەکسەر لە ژوورێکی چاوەڕوانکردن دەچوو. ئەوانەی کارێکیشیان هەبوو، بە پێی رەوتی تاعوون بە ترس و دڵەڕاوکێ و بەبێ خۆنواندن دەیانکرد. هەموان خاکەڕا ببوون. بۆ یەکەمین جار دابڕاوەکان بە لایانەوە شەرم نەبوو باسی نادیارەکەیان بکەن، بە زمانی هەموانەوە قسە بکەن و دابڕانەکەشیان هەر لەو گۆشەنیگایەوە هەڵسەنگێنن کە لەوێوە لە ئامارەکانی تاعوون دەڕوانن. لەگەڵ ئەوەدا کە هەتا ئەوکات بێ بەزەیی‌یانە ئازاری خۆیان لە چارەڕەشیی گشتی جوێ دەکردەوە، ئێستا ملیان بۆ تێکەڵبوونی ئەوان رادەکێشا. بێ یادەوەری و بێ‌هیوا، تەنیا لە ئێستادا دەژیان. لە راستیدا هەموو شتێك بۆ ئەوان رەنگی ئێستای بەخۆوە دەگرت. با ئەوە بڵێین کە تاعوون تەواوی هێزی عیشق و تەنانەت خۆشەویستیشی لێ زەوت کردبوون. لەبەر ئەوەی عیشق برێك پێویستیی بە داهاتوویە و ئیتر ئێمە تەنیا ساتەکانمان بۆ مابۆوە.

دیاره هیچکام لەو شتانە تەواو ئاوا نەبوون. چونکە ئەگەرچی تەواوی دابڕاوەکان گەیشتنە ئەو حاڵەتە با ئەوەشی لێ زیاد بکەین کە هەمووان لە یەك کاتدا  نەگەیشتن، هەر وەها دوای مانەوە لەو رەوشە نوێیەدا، قەڵەمبازەکان و گەڕانەوە و گەشبینیە لەنەکاوەکان، ئەوانی بەرەو هەستیارییەکی تازە و بەژانتر دەبرد. ئەوان پێویستییان بە دەموساتی رابواردن و خۆخافڵاندن هەبوو کە لەو کات و ساتانەدا پلانێکی وا بۆ داهاتوو دارێژن کە جێبەجێکردنەکەی بەسترابۆوە بە نەمانی تاعوونەکەوە. پێویست بوو لەپڕ لە سۆنگەی نیعمەتێکی ئاسمانیەوە هەست بە چزووی ئێرەیی‌یەکی بێ‌هۆ بکەن. ژمارەیەکی دیکەش لەپڕ بەرەو ژیان بایاندەداوە، هێندێ لە رۆژەکانی حەوتوو و زیاتریش یەکشەمموان و دوانیوەڕۆی شەممە، لەو داهێزراوییەی خۆیان دەهاتنە درەوە، چونکە ئەو رۆژانە تایبەت بوون بە ژمارەیەك رێوڕەسمی ئایینیەوە کە بیرهێنەرەوەی رۆژگاری لەدەستچوو بوون. یا باشتر بڵێین ئەو پەژارەیەی لە کۆتایی رۆژدا بەرۆکی دەگرتن وەبیری دێنانەوە کە یادەوەرییەکەیان دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەو هۆشیارییە هەمیشەیی نەبوو:" ئەم کاتی زەردەپەڕە کە بۆ ئیمانداران کاتی تاقیکردنەوەی تێگەیشتوویی و مەعریفەیە، بۆ ئەو بەندی  و دوورخراوانەی جگە لە بۆشایی هیچ شتێکیان بۆ تاقیکردنەوە نیە، تاقەتبڕە. ئەم سەعاتە، تاوێك ئەوانی لە سەرلێشێواویدا رادەگرت و ئەوجار دیسان دەگەڕانەوە حاڵەتی بێ‌حاڵی و بێ‌وازیی خۆیان و دەچوونەوە بەندی تاعوونەوە.

هەتا ئێستێ دەرکەوتووە ئەم حاڵەتە وازهێنان بوو لە دیارترین بابەتەکان. لە سەرەتاکانی تاعووندا خەڵك لە ژێر کاریگەریی شتی زۆر بچووك بچووکدا بوون کە بە لایانەوە زۆر گرینگ بوون و بە هیچ شێوەیەك بەلای خەڵکی دیکەوە بایەخ و بوونیان نەبوو و، بەو شێوەیە بە ئەزموونکردنی ژیانی خۆیانەوە خافڵابوون. ئێستا بە پێچەوانەوە ئەوان گرینگییان بە شتێك دەدا کە بۆ خەڵکیش گرینگ بوو، تاقە باوەڕێکی هەیانبوو، باوەڕی گشتی و هەموانی بوو و عیشقەکەشیان بۆ ئەوان روخسارێکی لێڵی گرتبوو...

وەها بە تاعوونەوە خافڵابوون کە جاری وابوو ئیتر هیوایان بە هیچ شتێك نەدەمایەوە، لە خەودا نەبێ، کە خۆیان لەو بیر و فکرەدا نوقم دەکرد:"خۆزگە کوانەکان تەواو بوونایە."، بەڵام هەر لەو حاڵەتی خەوەدا بوون. لە راستیدا  تەواوی ئەو قۆناغە بریتی بوو لە خەوێکی دوورودرێژ. شار پڕ بوو لە نووستووی بێدار، کە تەنیا جاروبارە لە کاتی ناوازەدا لەدەست

چارەنووسی خۆیان رایاندەکرد و لە ناخی شەودا، زامی دەروونیان کە بە روالەت قەتماغەی کردبۆوە لە پڕ دەهاتەوە سوێ. ئەو کاتە لەخەو رادەپەڕین و بە سەرسامییەوە تاقییان دەکردەوە، بە لێوەلەرزەوە لە یەك ساتدا، ئازارەکانی خۆیان کە لەنەکاو نوێ ببوونەوە و لەگەڵ ئەویشدا روخساری تێکشکاویان دەدۆزییەوە. سەرلەبەیانی بە تاعوونەوە یا باشترە بڵێین بە خووخدەی رۆژانەیانەوە دەگەڕانەوە. لێماندەپرسن قەڵافەتیان چۆن بوو؟ وەڵامەکەی سادەیە: هیچ قەڵافەت و روالەتێکی تایبەتییان نەبوو. یا دەکرێ بڵێین کە قەڵافەتیان وەك ئی خەڵکەکەی دیکە وا بوو.

بەشداری هێمنی یان ترس و شڵەژانی مندالانەی شارەکە بوون. روخسارەکان هیچ مەترسییەکیان پێوە دیار نەمابوو و روالەتێکی لەسەرەخۆیان بەخۆوە گرتبوو. بۆ وێنە دەکرا لە نێویاندا زیرەکترینەکەیان ببینی کە بە روالەتێکی وەك ئەوانیترەوە لە نێو لاپەڕە و ستوونەکانی رۆژنامەکاندا و یا لە بەرنامە رادوێی‌یەکاندا بە شوێن هۆکارگەلێکدا دەگەڕێن، بەشکم باوەڕ بکەن کە کۆتایی تاعوون نزیك بۆتەوە و بە روالەت هیوا و ئاواتی خەیالی بۆخۆیان ساز بکەن، یا بە خوێندنەوەی کۆمەڵە تێبینیەك کە رۆژنامەنووسێك لەوانەیە لەکاتی باوێشکداندا لەبەر ماندوویەتی نووسیوێتی، تووشی ترس و دڵەڕاوکێیەکی بێ بنەما بن، بەڵام ئەوانیتر بیرەی خۆیان دەخواردەوە و ئاگایان لە نەخۆشەکەیان دەبوو، خۆیان دەگنخاند یا ماندوو و شەکەت دەبوون، پسوولەکانیان ریز دەکردن، یا شریتی موزیکیان دەخستە سەر گرامافۆنەکە بەبێ ئەوەی جیاوازییەکەیان ببینن. بە واتایەکی دیکە، هیچ شتێکیان هەڵنەدەبژارد. تاعوون داوەریکردن لەسەر بەهاکانی لەنێو بردبوو. باشترین نموونەی ئەم حالەتە ئەوە بوو کە ئیتر هیچ کەس گرینگیی بە جۆری جلوبەرگ یا ئەو خواردنە نەدەدا کە دەیکڕی. هەموو شتێکیان یەك جێ وەردەگرت.

لە کۆتایی‌دا دەکرێ بڵێین دابڕاوان ئیتر ئەو پوانە تایبەتییەیان نەمابوو کە لەسەرتادا دەیپاراستن. خۆپەرەستیی عیشق و ئەو قازانجەیان لەدەست دابوو کە لەو وەدەستیان دەکەوت. لانیکەم ئێستا رەوشەکە روون ببۆوە و دەمودەست هەمووانی گرتبۆوە. هەموومان ئێمە، لە نێو دەنگی ئەو فیشەکانەی کە لە بەردەم دەروازەکاندا داوێژران و، زرمەی مۆرکردن، کە ژیانی ئێمە و

مردووەکانمانی لێك جویٚ دەکردەوە، لە نێو سووتمان و پسوولەکاندا، لە ترس و دڵەڕاوکیٚ و ڕێوڕەسمە ئیدارییەکاندا لەبەردەم مەرگێکی پڕ شوورەیی بەڵام یادداشتکراودا، لە نێو دووکەڵە سامناکەکان و لوورەی ئامبولانسەکاندا لە غوربەتێکی وەك یەکدا بووین بە بیٚ ئەوەی بۆخۆمان بزانین لە کۆڕی چاوەڕوانیەکی وەك یەك و هێمنیەکی وەك یەکدا بووین. بیٚ گومان ئەڤینی ئێمە هەر لەسەر جێی خۆی بوو، بەڵام بەکار نەدەهات، هەڵگرتنی دژوار بوو و لە ناخماندا بێجووڵە مابۆوە و وەکوو جەنایەت یا مەحکوومبوون، نەزۆك و ئەستێور بوو، ئیتر دانبەخۆداگرتنێکی بیٚ دوارِۆژ و چاوەڕوانیەکی چەقبەستوو بوو. لەم رووەوە رواڵەت و حاڵەتی هێندیٚ لە هاووڵاتیانی ئێمە بنیادەمی دەخستەوە بیر ئەو ریزە دوورودرێژانەی کە لە هەموو شارەکە لەبەردەم دووکان و کۆگاکانی کەلوپەلدا پێكدەهاتن. هەر ئەو خۆبەدەستەوەدان و دانبەخۆداگرتنە بێبڕانەوە و بیٚهیوایە بوو. تەنیا سەبارەت بە دابڕان دەبووایە ئەو هەستە هەزار هێندە گەورەتر بکەینەوە، چونکە ئەوە برسێتییەکی دیکە بوو کە دەکرا هەموو شتیٚ هەڵلووشیٚ.

لە هەمان کاتدا ئەگەر بمانەویٚ، باری دەروونیی دابڕاوانی شارەکەمان بەجوانی بێنینە بەرچاومان، دەبوو دیسان ئەو زەردەپەڕە زێڕین و خۆڵاوییانەی کە بەسەر شارە بیٚ داروبارەکەدا دەکەوتن و ئەو خەڵکەی کە لەو کاتەدا دەڕژانە کۆڵانان، بێنینە پێش چاومان. چونکە لە نەبوونی کەرەسەی هاتوچۆ و ترۆمبیلدا کە بە جۆرێك زمانی شارن، تاقانە دەنگەکانی شار دەنگی بەرزی هەنگاوەکان و غەڵبەغەڵب و خشەخشی بە ئازاری هەزاران پیٚ، لەگەڵ لوورەی بەڵا لە ئاسمانە قورسەکەدا بوون، کە لە نێو هەیوانەکاندا کە هێشتا رووناك بوون، هەڵدەستان و دەبیسران. هەڵپەڕکێیەکی بیٚ کۆتایی و خنکێنەر بوو کە وردەوردە هەموو شاری دەتەنیەوە و شەو بە شەو وردترین و کزترین دەنگەکانی خۆی دەدایە شێلگیرییەکی کوێرانە، کە لە دڵەکانی ئێمەدا جێی عیشقی دەگرتەوە.

بە درێژایی مانگەکانی سێپتەمبەر و ئۆکتۆبر تاعوون کە شاری گرمۆڵە کردبۆوە، لە بن چۆکی خۆیدا رایگرت. ئێستا کە بێجووڵەیی و چەقینێك لە ئارادا بوو، بە سەدان هەزار مرۆڤ بە درێژایی ئەو حەوتووانەی کە نەدەبڕانەوە، دیسانیش هەر وەك خۆیان مانەوە و نەبزووتن. مژ و گەرما و باران لە ئاسمانەوە یەکسەرە دایانکردبوو. پۆل پۆلی ریشۆڵە و پەڕەسێلکە کە لە باشوورەوە دەهاتن، زۆر بەرز فڕین و سووڕانەوە و بەبەری شاردا تێپەڕین، دەتگوت خەرمانکوتەکەی پامیلۆ ــ هەر ئەو لەتە چێوەی کە بە لوورەلوور بەسەر ماڵەکاندا دەسووڕایەوە ــ ئەوانی لاداوە. لە سەرەتای ئۆکتۆبەردا رێژنەی توندی بارانی وەشت کۆڵانەکانی رامالێن. لەو ماوەیەشدا، هیچ رووداوێکی ئەوتۆ کە لەو هەڵپەڕکێیە گەورەتر بێ، نەقەوما.

ئەوکات بوو ریڤۆ و برادەرەکانی تێگەیشتن چەندە هیلاك و ماندوون. ئەندامانی رێکخراوە تەندرووستییەکان ئیتر تین و تاقەتی ئەو شەکەتییەیان نەمابوو. دوکتۆر ریڤۆ بە سەرنجدان بەو خەمساردییە سەیرەی کە لە خۆی و برادەرەکانیدا دەیدی گەشە دەکا، لەو مەسەلەیە تێگەیشت، بۆ وێنە ئەو خەڵکە کە هەتا ئێستا ئاوا بە تۆخی هۆگری هەواڵەکانی تاعوون بوون، ئیتر بە هیچ شێوەیەك بە لایانەوە گرینگ نەمابوو. رامبێر کە بە شێوەی کاتی رایانسپاردبوو بەسەر یەکێك لە لقەکانی ئەو دابڕگەیە رابگا، کە لە هوتێلەکەی ئەودا کرابۆوە، بە تەواوەتی دەیزانی چەند کەسی لە ژێر چاوەدێری دایە. بۆ راگواستنی ئەوانەی لەنەکاو نیشانەی نەخۆشینیان لێ وەدەردەکەوتن شێوازێکی نوێی داهێنابوو و بەردەوام ئاگاداری وردەکارییەکان بوو. ئاماری کاریگەریی سیرۆم لەسەر دابڕگەکان لە زەینی ئەودا مابۆوە، بەڵام نەیدەتوانی بڵێ تاعوون حەفتانە چەند کەس دەکوژێ و بەراستیش نەیدەزانی ئاخۆ ئەو رێژەیە روو لەزیادبوونە یا لەکەمبوونەوەیە و، ئەو سەرەڕای هەموو شەو شتانە هیوادار بوو خێرا بتوانێ دەرباز بێ.

بەڵام ئەوانیتر کە نوقمی کاروباری رۆژ و شەوانەیان بوون، نە رۆژنامەیان دەخوێندەوە و نە گوێیان لە رادوێش رادەگرت. کە لە دەرەنجامێکی تازەشیان ئاگادار دەکردنەوە، وایان دەنواند زۆریان حەز لەو شتەیە، کەچی ئەو هەواڵەیان سەرسەریانە وەردەگرت، هەر وەك سەربازانی

جەنگە گەورەکان، کە وا راهاتوون تەنیا لە راپەڕاندنی ئەرکی رۆژانەیاندا خەمسارد نەبن و ئیتر نە هیوایەکیان بە دوایین عەمەلیات هەیە و نە هیوایەکیش بە رۆژی کۆتاییهاتنی جەنگ.

گرانت کە سەری بە ئەو حیسابانەوە خافڵابوو کە تاعوون خستبوویە ئەستۆی، بە دڵنیایییەوە نەیدەتوانی ئەنجامەگشتییەکانی حیسابەکان بخاتە روو. باری دەروونیی ئەو بە پێچەوانەی تارۆ، رامبێر و ریڤۆ کە بە رواڵەت لە بەرامبەر شەکەتی و ماندوویەتیدا خۆڕاگر بوون، قەت باش نەبوو.

بە کورتی ئەو شانی دابووە بەر کار و بارە زیادییەکانی شارەوانی و، سکرتێریی لە لای ریڤۆ و کاروباری شەوانەی خۆی، بەو جۆرە بنیادەم هەمیشە ئەوی وا دەبینی کە دەڵێی داماوە و تەنیا لە سایەی دوو سێ بیروباوەڕی نەگۆڕەوە دەژی. بۆ وێنە هەتا تاعوون تەواو بوو لانیکەم بۆ ماوەی حەوتووەك دەچێتە پشوودان و ئەو کات بە شێوەیەکی کاریگەرـ کلاوەکانتان هەڵگرن ـ خەریکی ئەو نووسینە دەبێ، کە لەبەر دەستیەتی. هەروەها لەپڕ دڵی ناسك دەبوو و لەو دەرفەتانەدا بەدڵی خۆی باسی ژینێ Jeanne ی بۆ ریڤۆ دەکرد. لە خۆی دەپرسی تۆ بڵێی ئێستا لە کوێ بێ و ئاخۆ کاتێك رۆژنامە دەخوێنێتەوە گرانتی بیر دەکەوێتەوە؟ رۆژێکیان ریڤۆ خەریك بوو قسەی لەگەڵ ئەو دەکرد، کە لەپڕ دیتی خەریکە بە شێوەیەکی هێندە ناحەز باسی ژنەکەی خۆی دەکا، کە هەتا ئەو رۆژە شتی وا هەر نەبووە. لەبەر ئەوەی نەیدەزانی چۆن دەبێ گرنگی بدات بەو تەلەگرامە دڵنیاییکەرەوانەی بەردەوام لە ژنەکەیەوە پێی دەگەیشتن، بڕیاری دابوو تەلەگرامێك بۆ بەرپرسی ئەو نەخۆشخانەیە بکا کە ژنەکەی لەوێ کەوتبوو. لە وەڵامدا پێیان راگەیاندبوو، رەوشی نەخۆشەکە خراتر بووە و دڵنیایان کردبۆوە لەوەی هەرچی لەدەستیان بێ بۆ پێشگیری لە پەرەئەستاندنی نەخۆشینەکەی دەیکەن. ئەو ئەم هەواڵەی لە دڵدا راگرتبوو و ئێستێ نەیدەزانی چۆن توانیوێتی لای گرانت بیگێڕێتەوە. لەوانەیە شەکەتی و ماندوویەتی ئەو کارەی پێکردبێ. کارمەندەکەی شارەوانی دوای باسی ژینێ Jeanne پرسیاری ژنەکەی لێکردبوو و ریڤۆش وەڵامی دابۆوە. گرانت گوتبووی:" بۆخۆت دەزانی ئێستێ ئەو نەخۆشییە زۆر باش چارەسەر دەکرێ." و ریڤۆ بۆی سەلماندبوو و تەنیا ئەوەندەی پێوەنابوو کە دابڕانەکە خەریکە وردەوردە زۆر دەخایەنێ و لەوانەبوو ئەو خۆی توانیبای یارمەتیی ژنەکەی بدا بۆوەی

بەسەر نەخۆشییەکەیدا زاڵ بێ، بەڵام ئێستا ژنەکەی تەواو خۆی بە بێکەس دەزانێ. ئیتر بێدەنگ ببوو و وەڵامی لاوەکیی بە پرسیارەکانی گرانت دابۆوە.

ئەوانی دیکەش هەر لەو حاڵەدا بوون. تارۆ خۆی باشتر رادەگرت، بەڵام یاداشتەکانی وا دەردەخەن کە کونجکۆڵییەکەی ئەو هەرچەندە هیچ لە قووڵاییەکەی کەم نەببۆوە، بەڵام هەمەلایەنیەکەی خۆی لە دەست دابوو. لە راستیدا هەتا ئەو قۆناغە تەواو بوو، ئەو هۆشی هەر بەسەر کۆتارەوە بوو. کە پاش ئەوەی هوتێلەکەیان کردبووە دابڕگە، شەوانە لە ماڵی ریڤۆ دەمایەوە و بە زەحمەت گوێی لە قسەکانی گرانت یا دوکتۆر رادەگرت کە باسی دوایین ئاکامی هەوڵەکانیان دەکرد. دسبەجێ سەری هەودای باسەکەی دەهێنایەوە سەر خاڵە بچووکەکانی ژیانی خەڵکی ئۆران، کە بە گشتی بیر و مێشکی ئەویان بەخۆوە خەریك دەکرد.

بەڵام کاستێل ئەو رۆژەی هاتە لای دوکتۆر ریڤۆ بۆوەی پێی بڵێ سێرۆم ئامادەیە، پێکەوە بڕیاریان دا بۆ یەکەمین جار لەسەر کوڕە گچکەکەی ئاغای ئۆسۆن کە تازە هێنابوویانە نەخۆشخانە و بە رای دوکتۆر لەچاکبوونەوەی بێهیوا ببوون، تاقیی بکەنەوە. دوایی ریڤۆ دەستی کرد بە گێڕانەوەی دوایین ئاماری وەدەستهاتوو بۆ برادەرە بەساڵاچووەکەی، بەڵام هەر لەو کاتەدا زانیی ئەو لە قەنەفەکەدا لە خەوێکی قووڵ راچووە و، ریڤۆ لە بەرامبەر ئەو روخسارەدا کە هەمیشە حاڵەتە نەرم و جەفەنگییەکەی نیشانەی گەنجێتییەکی بەردەوام و خۆڕاگری بوو و، ئێستا لە پڕ ئەو حاڵەتەی تێدا نەمابوو و، لیکاوی لالغاوەی، سواوی و پیرێتییەکەی ئەوی دەردەخست و هەستی کرد قوڕگی دەگوشن.

ریڤۆ بەو لاوازی و بێهێزییانەوە بوو کە دەیتوانی بڵێ چەندە ماندوو و شەکەتە و هەستیارییەکەی نەدەما. ئەو هەستیارییە کە زۆرجاران ببووە گرێکوێرە و وشك هەڵاتبوو، وردەوردە تەواو دەبوو و ئەوی لە چنگی ئەو هەژان و کەفوکوڵەدا دەهێشتەوە کە نەیدەتوانی بەسەریاندا زاڵ بێ. تاقە رێگەی بەرگریکردنەکەی ئەوە بوو کە پەنا بەرێتە بەر ئەم لایەنە باشەی و ئەو گرییەی کە لە ناخیدا دروست ببوو توندتری بکا. دەیزانی کە ئەوە رێگەیەکی باشە بۆ درێژەدان. لە سەرووی ئەوەوە ئارەزوویەکی ئەوتۆی نەبوو و ئەو خەیاڵ و ئاواتانەش کە هەتا ئێستێ پاراستبوونی ماندوویەتیی ئەویان دەحەساندەوە. چونکە دەیزانی بۆ ئەو قۆناغەی نەیدەزانی کەی تەواو دەبێ

ئەرکی ئەو ئیتر چاککردنەوە نیە. ئەرکی ئەو دەسنیشانکردن بوو. دۆزینەوە، تێبینی، شیکردنەوە، یادداشت و دواجار مەحکوومکردن! ئەمە بوو ئەرکی ئەو. هاوسەرەکان مەچەکیان دەگرت و دەنووزانەوە:" دوکتۆر، رزگاری بکە."، بەڵام ئەو بۆ رزگارکردن نەهاتبوو، هاتبوو بڕیاری جوێکردنەوەی بدا. ئەو رقەی کە لەو ساتەدا لە روخسارەکان دەیخوێندەوە، بە کاری کێ دەهات؟ رۆژێك پێیان گوتبوو:" ئێوە دڵتان نیە." بۆچی! ئەو دڵێکی هەبوو. و بەو دڵە بوو کە دەیتوانی بیست سەعات لە رۆژدا بینەری مەرگی ئەو مرۆڤانە بێ وا بۆ ژیان خولقێنرابوون. هەر بەو دڵەشەوە هەموو رۆژێ دەچۆوە سەیری ئەو دیمەنانە. جگە لەوەش دڵ هەر بەشی ئەوەندەی دەکرد. ئەو دڵە چۆن دەیتوانی ژیانیش ببەخشێ؟

نەخێر، ئەوەی ئەو بە درێژایی سەعاتەکانی رۆژ دەیبەخشییەوە، یارمەتی نەبوو، بەڵکوو زانیاری بوو. دیارە بۆوە نەدەبوو ناوی پیشەیەکی مرۆیی لەسەر دابنێی، بەڵام دوای تەواوی ئەو قسانە لە نێو ئەو جەماوەرە تۆقیوو و قەڵتوبڕکراوەدا، ئاخۆ دەرفەت بەکەس درابوو خەریکی کاری مرۆیی خۆی بێ؟ دیسانیش بەختەوەرانە ماندوویی لەئارادا بوو.

ئەگەر ریڤۆ بە کەیف بوایە، ئەم بۆنی مەرگەی کە بە هەموو شوێنێدا بڵاو دەبۆوە لەوانە بوو هەستی ئەو بهەژێنێ، بەڵام کاتێك مرۆڤ پتر لە چوار سەعات نەخەوتبێ ئیتر هەستێکی نامێنێ و هەموو شتێك بەو شێوەیە دەبینێ کە هەیە، واتە لە رووی دادپەروەرییەوە، دادپەروەری تاڵ و ناشیرن دەبینێ. ئەوانیتریش واتە مەحکوومکراوانیش بە باشی هەستیان بەوە دەکرد. بەر لە تاعوون وەك رزگاریدەرێك پێشوازییان لێدەکرد.

ئەو بە حەبێك و سێ دەرزی هەموو کاروبارەکانی رێكدەخست. قۆڵیان رێكدەگوشی و هەتا ئەوسەری دالانەکە لەگەڵی دەڕۆیشتن. ئەو رەوشە وای لێ دەکرد بە خۆی بنازێ، بەڵام مەترسیدار بوو. ئێستا بە پێچەوانەوە، ئەو لەگەڵ سەربازەکاندا دەچووە نێو مالانەوە و جاری وا بوو بۆوەی بنەماڵەکان دەرگا بکەنەوە پێویستیان بە قۆنداغە تفەنگ بوو. خەڵك دەیانویست ئەو و تەواوی مرۆڤایەتی لەگەڵ خۆیان بەرە و مەرگ پەلکێش بکەن. ئاخ! وا بوو، مرۆڤەکان نەیاندەتوانی لە مرۆڤەکان خۆش بن و ئەویش هێندەی ئەم چارەڕەشانە دەستکورت و بێبەش بوو و ئەویش شیاوی هەر ئەم لەرزینە بەزەیی‌هێنەرە بوو کە لەکاتی بەجێهێشتنیاندا لە ناخیدا کلپەی دەسەند.

له جه‌نگه‌ی حه‌وتووه دوورووودرێژه‌کاندا، لانیکه‌م ئه‌وانه ئه‌و بیر و فکرانه بوون که ریشۆ ئاوێته‌ی کۆمه‌ڵێك فکر و خه‌یاڵی ده‌کردن که له‌گه‌ڵ دابڕانه‌که‌ی خۆیدا یه‌کیان ده‌گرته‌وه. هه‌روه‌ها، هێندێ فکر و خه‌یاڵ بوون، که له روخساری براده‌ره‌کانی‌دا ره‌نگدانه‌وه‌یانی به‌دی ده‌کرد، به‌ڵام مه‌ترسیدارترین شوێنه‌واری شه‌که‌تی و ماندوویی که ورده‌ورده به‌سه‌ر ته‌واوی ئه‌وانه‌دا زاڵ ده‌بوو که ئه‌م ململانیه‌یان دژی نه‌هامه‌تی درێژه پێده‌دا ، ئه‌و خه‌مساردییه نه‌بوو وا له‌به‌رامبه‌ر رووداوه‌کان و که‌فوکوڵی ئه‌وانیتردا هه‌یانبوو به‌ڵکو ئه‌و که‌مته‌رخه‌مییه بوو که هه‌مووان ملکه‌چی ده‌بوون. چونکه له‌و رۆژانه‌دا خه‌ڵك حه‌زیان لێ بوو، خۆ له هه‌ر کرده‌وه‌یه‌کی که به‌راستی پێویست نه‌بوو، ببوێرن و به‌رده‌وام پێیان وابوو ئه‌و کرده‌وانه به‌لایانه‌وه له‌خۆیان به‌هێزترن.

به‌و شێوه‌یه کاری ئه‌و خه‌ڵکه گه‌یشته جێگه‌یه‌ك که زۆربه‌ی جاران ئه‌و رێسا و یاسا ته‌ندرووستییانه‌یان ره‌چاو نه‌ده‌کرد که خۆیان بۆخۆیانیان دانابوون. ژماره‌یه‌ك له‌و پاکژکه‌ره‌وانه‌یان له‌بیر ده‌کردن که ده‌بوایه بیکه‌ن و جاری وابوو به بێ ئه‌وه‌ی خۆیان له‌به‌رامبه‌ر لێگرتنه‌وه‌دا ته‌یار بکه‌ن، ده‌چوونه سه‌ردانی نه‌خۆشی ئه‌و نه‌خۆشخانه‌یه‌ی تاعوونی سیپه‌لکیان هه‌بوو. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له دواین ساته‌کاندا ئاگادار ده‌کرانه‌وه که ده‌بێ بچنه ئه‌و ماڵانه‌ی تووش ببوون. سه‌ردانی چه‌ندین شوێنی جۆراوجۆر بۆوه‌ی قه‌تره له لووتیان بکه‌ن، بۆ ئه‌وان دژوار و کوشنده دیار بوو. مه‌ترسیی راسته‌قینه لێره‌دا بوو. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خودی به‌ربه‌ره‌کانێ له‌گه‌ڵ تاعووندا بوو که ئه‌وانی بۆ تووشبوونی تاعوون ئاماده‌تر ده‌کرد. به‌گشتی له‌سه‌ر رێکه‌وت مه‌رج و گرێویان ده‌کرد و رێکه‌وت بۆ هیچ که‌س نیه.

له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ش‌دا یه‌کێك هه‌بوو له شاردا که نه شوێنه‌وارێك له شه‌که‌تی و نه نیشانه‌یه‌کی له بێهیوایی پێوه دیار بوو و هێمای به‌رچاوی شادی و ره‌زامه‌ندی بوو. ئه‌م که‌سه کۆتار بوو. ئه‌و هه‌ر به‌و جۆره‌ی خۆی له هه‌موو چالاکییه‌کان دوور راده‌گرت و له‌هه‌مان کاتدا پێوه‌ندیی خۆی له‌گه‌ڵ خه‌ڵکدا ده‌پاراست، به‌ڵام له‌و نێوه‌دا ببووه براده‌ری تارۆ. زۆربه‌ی جاران ئه‌وه‌نده‌ی کاروباری تارۆ ئیزن و ده‌رفه‌تیان بدابایه، سه‌ردانی ده‌کرد، چونکه له لایه‌که‌وه تارۆ زانیاریی پێویستی له‌سه‌ری هه‌بوو و له لایه‌کی دیکه‌شه‌وه بێخه‌وش و راستگۆیانه ئه‌و کابرایه‌ی قبووڵ ده‌کرد. ئه‌وه په‌رجۆیه‌کی به‌رده‌وام بوو، به‌ڵام تارۆ وێڕای ئه‌و کاره قورسه‌ی که به‌ڕێوه‌ی ده‌برد به‌رده‌وام

چاکەخواز و مووئەنگێو مابۆوە. تەنانەت ئەو کاتەی هێندێ شەوان شەکەتی و ماندوویی دەیهاڕی. بۆ سبەینێکەی هێزێکی نوێی وەردەگرتەوە. کۆتار بە رامبێری گوتبوو:" ئەوەیان بۆوە دەبێ بیدوێنی. چونکە پیاوە و شایی بەخۆیە*. هەمیشە قسە دەبیستێ."

هەر بۆیەشە یادداشتەکانی تارۆ لەو سەروبەندەدا وردەوردە لەسەر کەسایەتیی کۆتار چڕ دەبنەوە. تارۆ هەوڵی داوە تابلۆیەك لە دژکردەوە و بیر و هزرەکانی کۆتار راست بەو جۆرەی کۆتار لای خۆی درکاندوویەتی یا ئەو خۆی وای لێ هەڵێنجاوە وێنا بکا. یەکێك لە تابلۆکان بەناوی " پێوەندییەکانی کۆتار و تاعوون" چەند لاپەڕەیەك لە دەفتەری یادداشتەکەی گرتووە و گێڕەرەوە پێی باشە لێرەدا کورتەیەکی لێ بێنێتەوە.

باوەڕی گشتیی تارۆ لەسەر کۆتار بەو داوەرییە کورت دەبێتەوە:" کەسایەتییەکە، کە گەورە دەبێ." دیار بووە کۆتار لە نێو گەشی و شادی و رووخۆشیدا گەورە دەبوو. ئەو بە رەوتی رووداوەکان تێك دەچوو. جاری وا بوو قووڵایی هزر و بیرەکانی خۆی بەو قسانە لە لای تارۆ دەدرکاند:" دیارە رەوشەکە باش نیە، بەڵام لانیکەم خەڵك هەمووی تێوەگلاون."

تارۆ ئەوەشی گوت:"دیارە ئەویش وەکوو ئەوانیتر لە مەترسی دایە، بەڵام لەگەڵ ئەوانیتر. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمن دڵنیام ئەو پێی وا نیە تووشی تاعوون دەبێ. ئەو بە رواڵەت بەو بۆچوونەوە ــ کە زۆریش گەوجانە نیە ــ دەژی کە، کاتێك یەکێك تووشی نەخۆشییەکی گەورە یا دڵەڕاوکێیەکی قووڵ بێ، ئیتر دڵەڕاوکێ و نەخۆشییەکانی دیکە لەکۆڵی دەبنەوە. پێی گوتم:" زانیوتە ناکرێ نەخۆشییەکانی دیکە لە خۆتدا کۆ بکەیتەوە؟ وای دانێ دەردێکی قورس و بێدەرمانی وەك شێرپەنجە یا ئازارەباریکەت هەبێ، ئیتر هەرگیز تووشی تاعوون یا گەروەخڕە نابیت. مەحاڵە. تەنانەت شتەکە لەوەش دەترازێ لەبەر ئەوەی تۆ قەت نەتدیوە نەخۆشێکی شێرپەنجە لە رووداوێکی هاتوچۆدا بمرێ. " ئەو بۆچوونە راست بێ یا درۆ، هەمیشە کۆتاری خۆشحاڵ دەکرد. تاقە شتێکی کە نایەوێ، دابڕانە لە خەڵکی. پێی باشە لەگەڵ خەڵك گەمارۆ بدرێ، بەڵام بە تەنیایی زیندانی نەکرێ. کاتێك تاعوون هەبێ، ئیتر باسی لێکۆڵینەوەی نهێنی، فایل و پسوولە و لێپێچینەوە و دەسبەسەرکردنی دەمودەست لەئارادا نیە. یا باشتر بڵێین، ئیتر باسی پۆلیس و جەنایەتی کۆن یا تازە و باسی

---

* شایی بەخۆ: کەسێك کە بەخۆی دەنازێ و خۆی بەکەم ناگرێ. جیاوازە لە لووتبەرزی و لەخۆباییبوون.

تاوانباران لەگۆڕێ نیە. هەر ئەو مەحکوومانە هەن کە چاوەڕێی بێلایەنانەترین لێبوردنەکانن، پۆلیسەکانیش لەوانەن." دیسانیش هەر لەسەر قسەی تارۆ، کۆتار ئەو شوێنەواری دڵەڕاوکێ و نیگەرانیەی هاووڵاتییەکانی ئێمە لەخۆیان دەنواند بە ڕەزامەندییەکی لێبوردەییانە و هەڵسەنگێنراوی دەزانی کە دەکرا واتایەکی بەو جۆرەی هەبێ:" قسە بکەن. قسە بکەن... ئەمن بەر لە ئێوە تووشی ئەوە بوومە."

" ئەمن لە خۆڕا هەوڵم دا پێی بڵێم سەرەڕای ئەو قسانە، تاقە ڕێگەی دانەبڕان لە خەڵك ئەوەیە ویژدانت هەبێ. ئەو بە تەوسێکەوە سەیری کردم و گوتی:"کەواتە بەو پێیە کەس لەگەڵ کەس نیە." گوتیشی:"کەیفی خۆتە باوەڕ دەکەی یان نا، بەڵام ئەوەت پێ دەڵێم: تاقانە ڕێگەی یەککگرتووکردنی خەڵك ئەوەیە تاعوونیان بۆ نازڵ بکەی. سەیری دەوروبەرت بکە بۆ ئەوەی لێم تێبگەی". لە ڕاستیدا ئەمن دەزانم ئەو دەیەوێ بڵێ چی و ئێستێ ژیان بۆ ئەو چەندە سادەیە. ئەو چۆن ناتوانێ لەسەر ڕێگەی خۆی ئەو دژکردەوانەی سەردەمانێك تایبەتی خۆی بوون، بناسێتەوە: ئەو هەوڵەی هەموو کەسێك دەیدا بۆوەی هەموو خەڵك بێنێتە سەر ڕای خۆی، ئەو ڕێز و حورمەتەی خەڵك جاری وایە بۆ ڕێنوێنیی ڕێبوارێکی سەرلێشێواو دەینوێنن و ئەو زەبروزەنگەی کە لە مەسەلەیەکی دیکەدا دەرهەقی دەیکەن. هرووژمی خەڵك بەرەو لای ڕستورانتە لۆکسەکان و ئارەزووی ئەوان بۆ ئەوەی لەوێ بن و ماوەیەك لە سەر مێزەکە ماتڵ بن، ئەو خەڵکە شێواوەی کە هەموو ڕۆژێ لەبەر دەم سینەماکاندا ریز دەبەستن و هەمو هۆڵەکانی شانۆ و "دانس" پڕ دەکەن و وەکوو هەڵکشانێکی هەوسارپچڕاوی دەریا بە هەموو شوێنە گشتییەکاندا بڵاو دەبێتەوە. ڕاکردن لە هەرچەشنە پێوەندییەك و لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو تامەزرۆییە بەتینە مرۆییەی کە مرۆڤەکان بەرەو مرۆڤەکان و، قۆڵەکان بەرەو باسکەکان و، هەر ڕەگەزێك بەرەو ڕەگەزەکەی بەرامبەری پەلکێش دەکا. بێگومان کۆتار هەموو ئەوانەی لەوەپێش دیتووە. جگە لە ژنان، چونکی بەو ئەخلاقەی هەیەتی... و پێم وایە هەر کات هەستی کردووە وا خەریکە بەرەو ژنان دەکشێ، خۆی بواردووە نەکا وا بجوولێتەوە لە داهاتوودا بەسەریدا بشکێتەوە.

" بە کورتی تاعوون بەسەر ئەودا زاڵ بووە. هاوبەشێکی لەو پیاوە تەنیایە دروست کردووە کە نەیدەویست تەنیا بێ. چونکی بە ئاشکرا ئەو هاوبەشێکە و بەشدارێکیشە کە دڵی بەو

بەشداربوونەی خۆی خۆشە. بەشداری هەموو ئەو شتانەیە کە دەیانبینێ: هاوبەشی باوەڕە پووچەکان، ترسە ناڕەواکان، هەستیاریی ئەو ڕۆحە تۆقیوانە، سووربوونیان لەسەر ئەوەی چەندی بۆیان دەلوێ کەمتر باسی تاعوون بکەن و، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم خۆنەبواردنەیان لە قسەکردن، زراوچوون و ڕەنگبزرکاوییەکەیان لەگەڵ کەمترین ژانەسەردا، لەو دەمەی وا دەزانن نەخۆشی بە ژانەسەرەوە دەست پێدەکا. هاوبەشی حەساسییەتێکی خرۆشاو و خێرا شوێنوەرگر و خۆڕانەگرەکەیان، کە بیرچوونەوەکان دەکاتە سووکایەتی و تەنانەت بە ونبوونی قۆپچەیەکی "بن دەرپێ"ـش، خەمبار دەبێ."

زۆرجاران وا ڕێکدەکەوت شەوانە تارۆ لەگەڵ کۆتار دەچووە دەرێ. دوایی لە یادداشتەکانی خۆیدا دەگێڕێتەوە کە چۆن شان بە شانی یەکتری لە نێو جەماوەری دەمەوئێواران و شەواندا نوقم دەبوون و لە تارماییەکی ڕەش و سپیدا دەتلانەوە کە لە دوورەوە چرایەك تیشکێکی کزی بەسەردا دەپژاند و مێگەلە مرۆڤی بەرەو ئەو شادی و بەزمە گەرمە دەبرد کە لە بەرامبەر سەرمای تاعووندا بەرگریی لێ دەکرد و دەیپاراست.

ئەوەی کۆتار لە چەند مانگ لەوەپێشەوە لە شوێن و کۆڕە گشتییەکاندا لێی دەگەڕا، واتە تێروتەسەلی و ژیانێکی بەرز، ئەوەی کۆتار بە ئاواتییەوە بوو و دەستی پێی ڕانەدەگەیشت واتە چێژ و خۆشییەکی بێجڵەو، ئێستا هەر هەمووی بەرەو خۆی ڕادەکێشا. لە حاڵێکدا کە نرخی هەموو شتێ بە شێوەیەکی بەردەوام لە هەڵچووندا بوو، خەڵك قەت ئەوەندە دەستبڵاو نەببوون و لە حاڵێکدا خەڵك زۆربەیان لە هەرەپێداویستەکانی ژیان بێبەش بوون، هەرگیز ئەوەندە خەرجی خۆڕایی و بێجێ نەکرابوو. هەموو جۆرەکانی قومارکردن بە بەربەرەڵاییەکی تایبەتەوە کە سەرچاوەکەی لە بێکارییەوە بوو، دوو هێندەی جاران زیادی کردبوو. تارۆ و کۆتار جاری وابوو بۆ ماوەیەکی زۆر ئەو جووتەیان هەڵدەنا* کە جاری جاران هەوڵیان دەدا پێوەندییەکەیان بە شاراوە و نهێنی ڕاگرن، بەڵام ئێستا دەست لەناو دەستی یەکتریدا بە لاسارییەوە بە چەقی شاریدا دەڕۆیشتن و گێژ و مەستی تایبەت بە عیشقە مەزنەکان ئەو جەماوەرەیان نەدەبینی کە لە دەورووبەریان بوون. کۆتار دڵی دەبزووت و

---

*هەڵنان: واتە خستنە ژێر چاوەدێری

دەیگوت:" ئاخ، لەخۆوە سەرخۆشەکان!" جا بە دەنگی بەرز قسەی دەکرد و لەنێو تین و تای گشتی و ئەو بەخششە شایانەیەی بە دەوریاندا بڵاو دەبۆوە و ئەو پێوەندییانەی کە لەبەر چاویان دەبەستران، لە خۆشیان شاگەشکە دەبوو.

سەرەڕای ئەوە، تارۆ پێی وابوو، کە ئەو حاڵەتەی کۆتار هیچ زەڕ و خراپەیەکی پێوە نیە. ئیدعای ئەو لەسەر ئەوەی کە، بەر لەوان تاعوونی ناسیوە، نیشانەی چارەڕەشی بوو هەتا سەرکەوتویی، تارۆ دەیگوت:

" پێم وایە ئەو، خەریکە وردە وردە ئەو خەڵکەی خۆش دەوێ کە لە نێوان ئاسمان و دیوارەکانی شاردا قەتیس ماون. بۆ وێنە ئەگەر بتوانێ لە ناخی دڵەوە بۆیان شی دەکاتەوە کە تاعوون هێندەش سامناك نیە نا. پێی گوتم:

" گوێتان لێیە دەڵێن چی: دوای تاعوون ئەم کارە دەکەم، پاش تاعوون فلانە کار دەکەم... ئەوانە لە بری ئەوەیکە بحەسێنەوە، ژیانی خۆیان تاڵ دەکەن. تەنانەت بیر لە بەرژەوەندیی خۆیشیان ناکەنەوە. ئاخۆ من دەتوانم بڵێم دوای دەستبەسەرکرانەکەم، فلانە کار دەکەم؟ دەستبەسەری، خۆی دەسپێکی قۆناغێکە نەك کۆتاییەکەی، بەڵام تاعون... رای منتان دەوێ؟ " ئەوانە چارەڕەشن، چونکە لە خۆیان ناگەڕێن. و ئەمن " دەزانم دەڵێم چی."

تارۆ دەشڵێ:" ئەو بە راستی دەزانێ دەڵێ چی. ئەو بە جوانی ناتەباییەکانی ژیانی خەڵك هەڵدەسەنگێنێ، لە حاڵێکدا پێویستییەکی قووڵی بە گەرموگوڕییەکە کە لێکیان نزیك بکاتەوە، بە هۆی ئەو دڕدۆنگییەی کە لێکیان دوور دەخاتەوە یەکتری بەجێ دەهێڵن. باش دەزانن کە مرۆڤ ناتوانێ متمانە بە دراوسێکەی بکا. چونکە لەوانەیە بەبێ ئەوەی ئاگات لێ بێ تووشی تاعوونت بکا و بۆ تووشکردنەکەت کەڵك لە خەمساردیت وەرگرێ. ئەگەر ئەتۆش وەکوو کۆتار بەشێك لە تەمەنی خۆت بە ئاوات و ئارەزووی دۆستایەتی و برادەرایەتیی لەگەڵ ئەوانە ژیابای، کە هەردەم ترسی ئەوەت لە دڵدا بوایە ئاشکرات بکەن، جا دەتزانی ئەو بە دەست چییەوە دەناڵێنێ. پیاو زگی ئەو کەسانە دەسووتێ کە پێیان وایە تاعوون لەوانەیە ئەمڕۆ یا سبەی دەست لەسەر شانیان دابنێ و لەوانەیە هەر ئێستاش کە تەواو ساخ و تەندروستن خۆیان بۆ ئەو کارە ئامادە دەکەن. هەر چەندە ئەو دڵسۆزییە دەکرێ هەبێ، دیسانیش ئەو لە نێو ترسدا، خەیاڵی ئاسوودەترە، بەڵام چونکە بەر

لەوان هەستی بەو شتانە کردووە پێمواییە ناتوانێ لەگەڵ ئەواندا تەوژمی بێ بەزەیی ئەو گومان و دڕدۆنگییە هەست بکا. بە کورتی لەگەڵ هەمووی ئێمە کە هێشتا تاعوون نەیکوشتووین ئەویش هەست دەکا کە ئازادی و ژیانی ئەویش هەموو ڕۆژێ هەڕەشەی وێرانی و لە نێوچوونی لەسەرە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو خۆی لە نێو ترس و خۆفدا دەژی بەلایەوە ئاساییە کە ئەوانیتریش بە نۆرەی خۆیان ئەو ترس و خۆفە بناسن. یا ڕاستتر بڵێین، خۆڕاگرتن لە بەرامبەر ترسدا بۆ وی لەو قۆناغە ئاسانترە کە ئەو تووشی تەنیایی ببوو. هەڵەی ئەو ئەلێرە دایە و هەر بۆیەش تێگەیشتن لەو دژوارترە لە چاو ئەوانیتر، بەڵام بەهەرحاڵ هەر بەو هۆیەش ئەو لەوانیتر گرینگترە کە بۆ تێگەیشتن لە هەستەکانی ناخ و دەروونی هەوڵ بدەین."

بە گشتی لاپەڕەکانی تارۆ بە گێڕانەوەی ڕووداوێك کۆتایی دێ و ئەو ڕووداوە نیشاندەری ئەو هەستە سەیر و سەمەرەیەیە کە لە یەك کاتدا بەسەر کۆتار و تاعوونلێدراواندا هاتبوو. ئەو ڕووداوە تا ڕادەیەك ڕەوشی ئەستەم و دژواری ئەو سەردەمە دەردەخات، هەر بۆیەش گێڕەرەوە بە لایەوە گرینگە:

ئەوان بەیەکەوە چووبوونە ئۆپێرای شار، کە لەوێ ئۆرفە بەرهەمی "گلوك" ئاوازدانەری ئەڵمانی پێشان ئەدرا. بەڕێوەبەرەکان کۆمەڵێك ئەکتەر بوون کە لە بەهاری دەسپێکی تاعوونەوە هاتبوونە شارەکەی ئێمە. ئەو گرووپە کاتێك کەوتبوونە نێو گەمارۆی تاعوونەوە، ناچار ببوون پاش ڕێککەوتن لەگەڵ ئۆپێراکە حەوتووی جارێك، شانۆکەی خۆیان بنوێنن. بەو شێوەیە لە یەکەم مانگەکاندا، هەموو ڕۆژانی هەینی زایەڵەی خۆشی ئۆرفە و دەنگی کزی Eurydice هۆڵی شانۆی شارەکەمانی پڕ دەکرد. بەو حاڵەوە ئەو شانۆیە بەردەوام پێشوازیی لێ دەکرا و، بەردەوام کڕیاری زۆر بوو. کۆتار و تارۆ کە لە گرانترین شوێن دانیشتبوون هەموو هۆڵەکەیان لە بن پێی خۆیاندا دەبینی کە سیخناخ ببوو لە تەڕپۆشترین خەڵکی شارەکەمان و دەرزیت هەڵاویشتبایە وەعەرزی نەدەکەوت. ئەوانەی تازە دەگەیشتنێ دیار بوو دەیانویست هاتنیان سەرنجڕاکێش بێ. لە ژێر تیشکی سەرنجڕاکێشی بەر سەکۆکەوە، لە حاڵێکدا ژەنیارەکان لە بنەوە خەریکی کۆك (نصب)ـکردنی ئامێرەکانیان بوون قەڵافەتی بینەران بە ڕوونی دیار بوو، کە لە ڕیزێکەوە دەچوونە ڕیزێکی دیکەوە و بە شێوەیەکی تایبەتی دەچەمینەوە و سڵاویان دەکرد. لە نێو ورتەورتی کزی قسەوباسەکاندا،

خەڵك ئەو متمانەیەیان دەدۆزییەوە کە چەند سەعاتێك لەمەوبەر لە کۆڵانەکانی شاردا هەر نەیانبوو. رواڵەتی رازاوە و جوان، تاعوونی لە خۆی دوور دەخستەوە.

لە پەردەی یەکەمدا، ئۆرفە بە ئاسانی سکاڵاکانی خۆی دەردەبڕی. چەند ژنێك کە جلوبەرگی خۆماڵییان لەبەردا بوو، بە شێوازێکی تایبەتی باسی چارەڕەشیی ئەویان دەکرد و چیرۆکی عیشق بە شێوەی گۆرانی دەگوترایەوە. هۆڵەکە هەژان و تین و گەرمایەکی نهێنیی بەسەردا هات. لەو نێوەدا، برێك هەست بەوە کرا کە ئۆرفە لە ئاوازی پەردەی دووهەمدا لەرزەیەك دەخاتە نێو دەنگی خۆیەوە کە پێشتر نەیبووە و بە کەفوکوڵێکەوە کە برێك زێدەڕۆیی پێوە دیارە، داوا لە خاوەنی دۆزەخ دەکا بەزەیی بە گریان و لالانەوەکانیدا بێتەوە. ئەو چەند جووڵە نارێکەی کردی، بە لای ئەوانەوە کە شارەزای بوون، وەك شێوازی تایبەتیی گۆرانیبێژ وەرگیران کە خستوویەتە سەر دەربڕینەکەی.

نۆرە گەیشتبووە گۆرانیی دووکەسیی ئۆرفە و ئێوریدیس لە پەردەی سێهەمدا( ئەو ساتە بوو وا ئیوریدیس لەبەر خۆشەویستەکەی ڕا دەکا) کە سەرسووڕمانی لە روخساری بینەراندا دەرکەوت. هەروەکی بڵێی گۆرانیبێژ چاوەڕوانی ئەو حاڵەتەی لە خەڵکەکە هەبووبێ، یا باشترە بڵێین ئەو ورتەورتەی لە هۆڵەکەوە بەرز دەبۆوە ئەو حاڵەتەی پشتڕاست دەکردەوە کە ئەو لە خۆیدا هەستی پێ دەکرد، ئیتر ئەو ساتەی بە گونجاو زانی و، بە شێوەیەکی نائاسایی لە حاڵێکدا کە دەست و لاقەکانی لێك ئاوەڵا کردبوون هاتە بەر سەکۆکە و بەسەر دیکۆرەکانی پێشەوەدا ئاوەژوو بۆوە. ئەو دیکۆرانە هەمیشە لەگەڵ رێکەوتی رووداوەکە یەکتر ناگرنەوە، بەڵام ئەو رۆژە ئەو ناتەباییە بە شێوەیەکی سامناك خۆی نواند. چونکە لەو کاتەدا ئۆرکێستراکە بێدەنگ بوو. سەیرکەرانی نێو هۆڵەکە هەستانە سەر پێ و، لەسەرەخۆ لە هۆڵەکە چوونە دەرەوە. سەرەتا وەکوو ئەوانەی کە لە رێوڕەسمی کڵێسە دێنە دەرەوە، یان ژووری مردوویەك جێ دێڵن، بێدەنگ بوون. ژنان تەشكوداوێنەکانیان کۆ کردنەوە و بە لارەملی، وەدەردەکەوتن. پیاوان قۆڵی هاوڕێکانیان دەگرت و رێنوێنییان دەکردن کە لە کورسییەکان نەئاڵقێن، بەڵام وردە وردە رۆیشتنەکە خێراتر بوو، ورتەورتەکە بو بە قریوەقریو و جەماوەر بەرەوە دەرگاکانی دەرەوە خوشین، بۆوەی هەتا زووە بچنە دەرەوە. وای لێهات کە بە هاوار هاوار پاڵیان بە یەکترەوە دەنا و بە کێشمەکێش وەدەر دەکەوتن. کۆتار و تارۆ کە تەنیا لە جێگەی خۆیان هەستابوون

له بەردەم یەکێك لە دیمەنەکانی ئەو سەردەمەیاندا تاق کەوتبوونەوە، تاعوون لەسەر سەکۆی شانۆ وەك ئەکتەرێك وەعەرز کەوتبوو و لە هۆڵە رازاوەکەدا، لە خۆڕا بە شێوەی پەنکەی فەرامۆشکراو و ئەو تۆڕانەی کە بەسەر مەخمەری سووری کورسییەکاندا دەکێشرا.

## (٢)

رامبێر لە یەکەمین رۆژەکانی مانگی سیپتەمبەردا بە دڵەوە لە لای تارۆ کاری کردبوو. تەنیا ئەو رۆژەی دەبوایە لەبەر دەم قوتابخانەی کوڕان چاوی بە گۆنزالیس و دوو گەنجەکە بکەوێ ئیجازەی رۆژێکی وەرگرتبوو.

نیوەڕۆی ئەو رۆژە گۆنزالیس و رۆژنامەنووس چاویان بە دوو کوڕەکە کەوت کە لێو بە پێکەنین نزیك دەبوونەوە. گەنجەکان وتیان جاری پێشوو شانسیان نەبووە و دەبێ چاوەڕێی دەرفەتی دوایی بن. بەهەر حاڵ ئەم حەوتووە ئەوان نۆرەی ئێشکگرتنیان بوو. پێویست بوو هەتا حەوتووی داهاتوو دان بە جەرگیاندا بگرن. ئەو کات دەیانتوانی دەست پێ بکەنەوە. رامبێر گوتی وایە. کەوابوو گونزالیس پێشنیاری کرد دووشەممەی داهاتوو یەکتر ببیننەوە، بەڵام ئەمجارەیان وایان دانا کە رامبێر لە ماڵی لۆیی و مارسێل بمێنێتەوە. گونزالیس گوتی:" ئەمن و تۆ ساخ دەبینەوە. ئەگەر ئەمن نەهاتم ئەتۆ یەکسەر دەچیتە ماڵی ئەوان. ئێستا پێت دەڵێم ماڵەکەیان لە کوێیە، بەڵام مارسێل یا لۆیی، گوتی رێگەی سادەتر ئەوەیە کە هەر ئێستا ئەو برادەرە بەرنەوە ماڵێ. ئەگەر لە هەڵبژاردندا زۆر بە گیرە و کێشە نەبێ، خواردن بۆ هەر چواریان دەست دەکەوێ. بەو جۆرە ئەو خۆی ماڵەکە پێ دەزانێ. گونزالیس گوتی فکرێکی باشە و بەرەو بەندەرگە خلۆر بوونەوە.

ماڵی ماسێل و لۆیی لەوسەری گەڕەکی مارین لە تەنیشت ئەو دەروازانەوە بوو کە بە لای لێژایی کەنارەکەدا دەکرانەوە.

ماڵێکی بچووکی ئیئیسپانیایی بوو دیوارەکانی پان و پەنجەرەکانی لە دار ساز کرابوون و ژوورەکانیشی چۆڵ و پڕ لە سێبەر بوون. ماڵێ برینجی لێ بوو و دایکی گەنجەکان کە پیرەژنێکی ئیسپانیایی دەموچاو چرچ بوو، بۆی هێنان. گۆنزالیس پێی سەیر بوو لەبەر ئەوەی کە برینج لە شاردا دەست نەدەکەوت. ماسیل گوتی:" لەبەر دەم دەروازە جێبەجێی دەکەین." رامبێر دەیخواردو دەیخواردەوە و، لەو دەمەدا کە هەر بیری لەو حەفتەیە دەکردەوە وا دەبوایە تێیپەڕاندبایە، گونزالیس گوتی ئەو دۆستێکی راستەقینەیە.

هەر بەڕاستی چاوەڕوانیەکە دوو حەوتووی خایاند، چونکە بۆ ئەوە لە تاقم و گرووپەکان کەم ببنەوە، ماوەی کێشکی ئێشکگرەکان پازدە رۆژی زیاد کرد. لە ماوەی ئەو پازدە رۆژەدا، رامبێر بەبێ داهێزران بەردەوام و تاڕادەیەك بێ ئەوەی بۆی گرینگ بێ، هەر لە کەڕەی بەیانیەوە هەتا شەو کاری دەکرد. شەو درەنگان دەخەوت و لە خەوێکی قووڵ رۆدەچوو. راگوێزرانی لەنەکاو لە بێکاری و بەرەڵڵاییەوە بۆ ئەم کارە قورس و تاقەتبڕە ئیتر تا رادەیەك نە خولیایەکی بۆ هێشتبۆوە و نە هێز و تاقەتێك. دەگمەن باسی ئەوەی دەکرد کە بەم زوانە تێی دەقوولێنێ*. تەنیا رووداوێك شیاوی باسکردن بوو ئەویش ئەوەی کە پاش حەوتووەك لای دوکتۆر دانی بەوەدا نا، کە دوێ شەوێ، بۆ یەکەمین جار مەست و سەرخۆش ببوو. کاتی چوونەدەرەوەی لە نادییەکە، لە نەکاو هەستی کرد رانەکانی دەماسێن (ئەستوور دەبن) و باسکەکانی بە زەحمەت بەملاولایدا شۆڕ بوونەتەوە و دەجووڵێنەوە. پێی وا بوو تاعوونە. تاقە دژکردەوەیەکی توانیبووی بینوێنێ ــ و لەگەڵ ریڤۆدا بەو ئاکامە گەیشتن کە ماقووڵ نەبووە ـــ ئەوە بوو کە بەرەو سەرووی شار هەڵێ و لەوێ لە گۆڕەپانێکی بچووکەوە کە لەوێشەوە دەریا نابینرێ، بەڵام ئاسمانێکی پتر دیارە، بە دەنگێکی بەرز لە سەرووی دیوارەکانی شارەوە بانگی ژنەکەی بکا. کاتێك چۆوە ماڵەکەی و هیچ جۆرەهەوکردن و ئەستووربوونێکی لە لەشی خۆیدا بەدی نەکرد، کەیفی بەو قەیرانە لەنەکاوە نەهات.

ریڤۆ گوتی تەواو تێدەگا لەوەی کە بنیادەم لەوانەیە ئاوا هەڵسوکەوت بکا و گوتی:

ـ بەهەرحاڵ لەوانەیە بنیادەم تووشی دەموساتی وا بێ، کە بە ئاواتی وەها کارێکەوە بێ.

---

* تێ قوولاندن: لە موکریان بۆ حاڵەتی راکردنو دەرپەڕین بۆ خۆ دزینەوەو خۆ دەربازکردن بەکاری دێنن

رامبێر کە دەیویست بڕوات لە پڕ ئەوەشی لێ زیاد کرد:

ـ ئەمڕۆ بەیانی ئاغای ئۆسۆن باسی تۆی بۆ کردم. لە منی پرسی ئاخۆ دەتناسم و گوتی:" کەوابوو ئامۆژگاریی بکەن با هاموشۆی شوێنی قاچاغ نەکا. دەیبینن."

ـ یانی چی؟...

ـ یانی، دەبێ پەلە بکەی.

رامبێر لە حاڵێکدا کە دەستی دوکتۆری دەگوشی گوتی:

ـ سوپاس.

لەبەر دەرگاوە لە پڕ گەڕایەوە. ریۆ تێگەیی کە بۆ یەکەمین جار لە سەردەمی دەسپێکی تاعوونەوە هەتا ئێستا ئەو هەر بزەی دێتێ:

ـ بۆ پێش بە ڕۆیشتنەکەم ناگری؟ خۆ تۆ لە دەستت دێ.

ریۆ بە جووڵەیەکی کە تایبەتیی خۆی بوو سەری راوەشاند و گوتی: ئەو مەسەلەیە پێوەندیی بە رامبێرەوە هەیە و رامبێر بەختەوەریی هەڵبژاردوە و ئەو واتە ریۆ، هیچ هۆکار و بیانوویەکی بۆ دژایەتیکردنی نیە. لەبەر ئەوەی لەخۆی رانابینێ لەسەر ئەوە بڕیار بدات و بڵێ چ شتێ باشەو چ شتێ خراپە.

ـ بۆ لەو هەلومەرجەدا پێم دەڵێی پەلە بکەم؟

ریۆش بە نۆرەی خۆی بزەیەکی هاتێ و گوتی:

ـ لەوانەیە لەبەر ئەوە بێ کە ئەمنیش حەزم لێیە بۆ گەیشتن بە بەختەوەری، کارێکم کردبێ.

بۆ سبەینێکەی ئیتر باسی هیچیان نەکرد و پێکەوە کاریان کرد. حەوتووی دواتر ئیتر رامبێر لە ماڵە بچووکە ئیسپانیاییەکەدا نیشتەجێ ببوو. لە دیوە هاوبەشەکەیاندا قەرەوێڵەیەکیشیان بۆ ئەو دانابوو. لەبەر ئەوەی کە گەنجەکان بۆ نانخواردن نەدەهاتنەوە ماڵەوە و چونکە تکایان لێکردبوو تا بۆی دەکرێ کەمتر لە ماڵێ وەدەر کەوێ، ئەو لەوێ بە تەنیا دەژیا و زۆربەی کات لەگەڵ داپیرە سپانیەکە قسەی دەکرد. ئەو ژنە رەقەڵە و چالاك بوو. شمەکی سپی دەپۆشی و روخسارێکی ئەسمەر و چرچ و لۆچ لە بن قژە سپی و زۆر خاوێنەکانیەوە بوو. کە بێدەنگ دەبوو و لە رامبێری دەڕوانی، چاوەکانی پێدەکەنین.

جاری واش بوو لێی دەپرسی ئاخۆ ناترسێ لەوەی تاعوون لەگەڵ خۆی بۆ ژنەکەی بەرێ؟

رامبێر پێی وابوو، ریی تێدەچێ، بەڵام لە ئەگەر و نەگەر دایە و ئەگەر لە شارەکەشدا بمێنێتەوە مەترسیی ئەوە هەیە بۆ تاهەتایە دیدار ئاخرەت بن.

پیرەژنە بە بزەیەکەوە لێی دەپرسێ:

ـ ژنەکەت میهرەبانە؟

ـ زۆریش.

ـ ئەدی جوانە؟

ـ پێموایە.

و پیرەژنە گوتی:

ـ ئمم، کەوابوو بۆیە.

رامبێر بیری دەکردەوە. دیارە لەبەر ئەوە بووە، بەڵام مەحاڵە تەنیا لەبەر ئەوە بێ.

پیرەژن هەموو بەیانیان دەچووە کلیسا و پێی دەگوت:

ـ تۆ باوەڕت بە خودا نیە؟

رامبێر بۆی دەسەلماند و پیرەژنەکەش دەیگوت لەبەر ئەوەیە. و گوتی:

ـ حەقتە. دەبێ بگەیتەوە لای. چونکە ئەگەر نەگەیتەوە لای ئیتر هیچت بۆ نامێنێتەوە...

رامبێر لە کاتەکانی دیکەدا بە دەوری دیوارە رووتەن و گەچکراوەکاندا دەسووڕایەوە. ئەو دەستی بەو پانکە و بادەوایانەدا دێنا کە بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوون یا ئەو گلۆڵە بەن و هەوریشمانەی دەژماردن وا لە قەراغی مافوورەکەوە شۆڕ کرابوونەوە. شەوانە گەنجەکان دەهاتنەوە. ئەوان زۆریان قسە نەدەکرد. تەنیا دەیانگوت هێشتا کاتی نەهاتووە. دوای شیوخواردن مارسێل گیتاری لێ دەدا و پێکەوە لیکۆرێکی رازیانە تێکراویان دەخواردەوە. رامبێر روخسارێکی خەفەتباری هەبوو.

چوارشەممە مارسێل کاتێك گەیشتەوە ماڵێ گوتی:" سبەی شەو لە نیوەشەودا ، ئامادە بە." ئەو دووانەی کە لەگەڵ ئەودا کێشکیان دەدا یەکێکیان تاعوون لێی دابوو و ئەویتر کە لەگەڵی لە ژوورێکدا بوو خرابووە ژێر چاوەدێری. بەو شێوەیە مارسێل و لۆیی دوو سێ رۆژان تەنیا دەمانەوە.

وا دانرا نیوەشەو هەموو وردەکارییەکان ڕێکخەن. دەکرا سبەینێش ئەو کارانە بکەن. رامبێر سوپاسی کردن. پیرەژنە پرسی:" قایلی؟ رامبێر گوتی بەڵێ، بەڵام بیری لە شتێکی دیکە دەکردەوە.

بۆ سبەینێ لە ژێر ئاسمانە قورسەکەدا گەرماکە شێدار و خنکێنەر بوو. ئەو هەواڵانەی سەبارەت بە تاعون دەگەیشتن ناخۆش بوون. لەگەڵ ئەوەشدا پیرەژنە سپانیەکە هەر لەسەرەخۆ بوو و دەیگوت:"دنیا سیخناخە لە تاوان و هەر ئەوەشی لێ دەکەوێتەوە." رامبێریش وەکوو مارسێل و لۆیی لە نێوقەد بۆ سەرەوەی رووت بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سینگ و نێوشانەکانی شەڵاڵی ئارەقە بوون و لە نیوەی تاریکیی ماڵەکەدا کە پەنجەرە چێوییەکانی داخرابوون جەستەیان بریقەدار و قاوەیی دەچۆوە.

رامبێر بەبێ ئەوەی متەقی لێوە بێ دەسووڕایەوە. لە نەکاو سەعات چواری دوانیوەڕۆ شمەکەکانی لەبەر کردن و گوتی دەچێتە دەرێ. مارسێل گوتی:

ـ ئاگادار بە. ئەمشەو نیوەشەو دەبێ. هەموو کارەکان ڕێکخراون.

رامبێر چووە ماڵی دوکتۆر. دایکی ریۆ گوتی دەتوانێ لە نەخۆشخانەی سەرووی شار چاوی بە دوکتۆر بکەوێ. لەبەر دەم پرسگەکەوە هەر ئەو جەماوەرەی جاران بەدەوری خۆیدا هەڵدەخولایەوە. ملازمێك بە چاوی دەرپەڕیوەوە دەیگوت:"رامەوەستن." خەڵك وەڕێ دەکەوتن، بەڵام بەدەوری خۆیاندا دەخولانەوە. ملازم، کە جلەکانی لە ئارەقەدا خووسابوون دەیگوت:" چاوەڕێ مەبن هیچ لەگۆڕێ نیە." هەمووان ئەوەیان دەزانی، بەڵام سەرەڕای ئەو گەرما کوشندەیەش هێشتا رادەوەستانەوە. رامبێر پسوولەی هاتوچۆکەی نیشانی ملازمدا و ملازم هەتا نووسینگەکەی تارۆ وەپێشی کەوت. دەرگای حەوشە دەکرایەوە. رامبێر تووشی پێرپانیلۆ بوو کە لە نووسینگەکە دەهاتە دەرەوە.

لە ژوورێکی سپیی گەچکراو و پیسدا کە بۆنی دەرمانگە و سەرچەفەی خووساوی لێ دەهات، تارۆ کە لە پشت مێزێکی چێوینی رەش دانیشتبوو و قۆڵی کراسەکەی هەڵماڵیبوو بە دەسرەیەك ئەو ئارەقەیەی وشك دەکردەوە کە بە شانیدا لووزەوی بەستبووە خوارەوە. گوتی:

ـ ئەوە هەر لێرەی؟...

ـ بەڵێ دەمویست قسە لەگەڵ ریۆ بکەم.

- له هۆڵەکەیە، بەڵام ئەگەر کرابا ئەو کارەی هەتە بەبێ ئەو راپەڕینی زۆر باشتر بوو.

- بۆچی؟

- زۆر شەکەتە. ئەمن هەوڵ دەدەم کەمتر سەرودڵی بگرم.

رامبێر سەیری تارۆی کرد. تارۆ کز ببوو. شەکەتی چاوەکانی بە قووڵدا بردبوو و روخساری تێکسمڕاندبوو. شان وب اهۆ تۆکمەکانی کۆ ببوونەوەو داتەپیبوون. له دەرگا درا و پەرستارێك بە دەمامکی سپییەوە وەژوور کەوت. بەستەیەك پسوولەی لەسەر مێزەکەی تارۆ دانا و بە دەنگێکی کە دەمامکەکە کزی دەکرد هەر ئەوەندەی گوت:"شەش." و چووە دەرەوە. تارۆ سەیری رۆژنامەنووس (رامبێر)ی کرد، ئەوجار وەکوو بادەوەیەك پسوولەکانی لێك کردەوە و نیشانی دا و گوتی:

- پسوولەیەکی جوانن نا؟ نەخێر، ئاماری مردووەکانن. مردووەکانی ئەمشەو.

تەوێڵی قووڵ ببوو. دیسان بەستە پسوولەکەی کۆ کردەوە و گوتی:

- تاقە شتێکی بۆمان ماوەتەوە، سەرژمێرییەکەیە.

تارۆ دەستی لەسەر مێزەکە دادا و هەستایە پێ و وتی:

- بەم زووانە دەڕۆی؟

- ئەمشەو، نیوەشەوێ.

تارۆ گوتی: خۆشحاڵە لەوەی سەرکەوتووە و رامبێر دەبێ ئاگای لە خۆی بێ.

- ئەوە قسەی دڵتە؟...

تارۆ شانەکانی هەڵتەکاندن و گوتی:

- له تەمەنی مندا پیاو بە خۆی نیە قسەی دڵی دەکا. درۆکردن پیاو شەکەت دەکا.

رۆژنامەنووس گوتی:

- تارۆ داوای لێبوردن دەکەم. دەمەوێ چاوم بە دوکتۆر بکەوێ.

- دەزانم. ئەو لە من ئینسانترە. با بچین.

رامبێر لێی تێکەڵ بوو و گوتی:

- مەبەستم ئەوە نەبوو.

راوەستا.

تارۆ سەیری کرد و لە پڕ بزەیەکی هاتێ.

بە دالآنێکی تەسكدا تێپەڕین کە دیوارەکانی کەسکێکی کاڵ بوون و تیشکێکی وەکوو ئاکواریۆم تێیدا دەبریسکایەوە. بەر لەوەی بگەنە دەرگایەکی دوو دەرووی شووشەیی کە لە پشتییەوە جووڵەی سەیری سێبەرەکان دیار بوون، تارۆ رامبێری بردە ژوورێکی بچووك کە دیوارەکانی لەبەر سندووق دیار نەبوون. یەکێك لەسندووقەکانی کردەوە و لە نێو دەزگایەکی پاکژکەرەوەدا دوو دەمامکی کە لە پارچەی ناسکی هیدرۆفیل ساز کرابوون دەرهێنان. یەکێکیانی دایە رامبێر و گوتی لە دەموچاوی بدا. رۆژنامەنووس پرسیی ئەوە قازانجێکی هەیە؟ تارۆ وەڵامی دایەوە نەخێر، بەڵام ورە بەوانیتر دەبەخشێ.

پاڵیان بە دەرگا شووشەییەکەوە نا. هۆڵێکی زۆر بەرین بوو کە سەرەڕای گەرمای وەرز، پەنجەرەکانی کیپ پێوەدرابوون. لەسەر دیوارەکانەوە کۆمەڵە دەزگایەك بە خڕەخڕ لەکار دابوون کە هەوایان ئاڵوگۆڕ دەکرد پەڕە کەوانیەکانیان هەوای خەست و داغی سەر دوو ریز قەرەوێڵەی بۆریان تێك وەردەدا. لە هەموو لایەکەوە ناڵەناڵی لێڵ هەڵدەستان کە هەموان پێکەوە دەبوونە نووزەیەکی یەك ریتم. کۆمەڵە کەسێکی سپی پۆش کە لە ژێر ئەو تیشکە توندەی لە پەنجەرە بەرزە میلەدارەکانەوە دەهاتە ژوورەوە، بە هێوری دەهاتن و دەچوون. رامبێر هەستی کرد خەریکە بە گەرمای سامناکی ئەو هۆڵە تێکدەچێ. و بە زەحمەت توانیی ریڤۆ بناسێتەوە کە بەسەر جەستەیەکدا نووشتابۆوە کە دەیناڵاند. دوکتۆر زرگی لە رانەکانی نەخۆشەکە دەدا کە لەملاولای قەرەوێڵەکەوە دوو پەرستار دەست و لاقیان گرتبوو. کاتێك سەری هەڵێنا، کەلوپەلەکانی خستە نێو جامێکەوە کە هاوکارێك بۆی هێنابوو و خولەکێك بێ جووڵە مایەوە و سەیری نەخۆشەکەی کرد کە خەریك بوون برینەکەیان بۆ دەپێچا.

تارۆ کە دەچووە پێشێ گوتی:

ـ هەواڵی تازە چییە؟

ـ پانیلۆ قەبووڵی کردووە کە لە بینای دابڕگە (قەرەنتینە)دا لە جێگەی رامبێر کار بکا. هەتا ئێستاش کاری زۆر کردووە. تەنیا بە نەبوونی رامبێر مەسەلەی پێکهێنانەوەی سێهەمین گرووپی پشکنین دەمێنێتەوە.

ریڤۆ بەسەر بۆی سەلماند.

ـ کاستێل یەکەمین وەجبەی سیرۆمەکانی ئامادە کردووە و پێشنیار دەکا تاقییان بکاتەوە.

ریڤۆ گوتی:

ـ دەی زۆر باشە.

ـ رامبێریش لێرەیە.

ریڤۆ ئاوڕی دایەوە. کە چاوی بە رامبێر کەوت لەسەر دەمامکەکانەوە چاوەکانی قیچ کردن. گوتی:

ـ ئەتۆ لێرە چ دەکەی؟ تۆ دەبوایە لە جێگەیەکی دیکە بیت.

ـ وا بڕیار دراوە.

هەر جارەی یەکێکیان قسەی دەکرد دەمامکەکەی لەسەر زاری لا بەرز دەبۆوە و تەڕ دەبوو و هەر بۆیەش قسەکردنیان شێوەیەکی نائاسایی بەخۆوە دەگرت و لە قسەکردنی پەیکەرەکان دەچوو.

رامبێر گوتی:

ـ دەمویست قسەت لەگەڵ بکەم.

ـ ئەگەر حەزت لێیە پێکەوە دەچینە دەرێ. لە نووسینگەی تارۆ چاوەڕێم بە.

ساتێك دواتر ریڤۆ و رامبێر لە ریزی دواوەی ترۆمبیلەکەی تارۆدا دانیشتبوون. تارۆ لێی دەخوڕی. ئەو لە حاڵێکدا ترۆمبیلەکەی وەڕێ دەخست گوتی:

ـ ئیتر بەنزینیش نەما. سبەی بە پێیان دەڕۆین.

رامبێر گوتی:

ـ دوکتۆر، ئەمن ناڕۆم و گەرەکمە لەگەڵ ئێوەدا بمێنمەوە.

تارۆ متەقی نەکرد و لەسەر لێخوڕینەکەی بەردەوام بوو. ریڤۆ لە رواڵەت نەیدەتوانی لەو حاڵەتی شەکەتییەی بێتە دەرێ. بە دەنگێکی لێڵ گوتی:

ـ ئەدی ژنەکەت؟

رامبێر گوتی دیسان بیری لێکردۆتەوە و هەر لەسەر باوەڕەکەی خۆیەتی، بەڵام ئەگەر بڕوات شەرمەزار دەبێت و ئەو شەرمەزارییە خۆشەویستیی و عیشقی ئەوی لێ تاڵ دەکا، بەڵام ریڤۆ خۆی راست کردەوە و بە دەنگێکی گڕ، گوتی: ئەوە هیچ مانایەکی نیە و بە باشتر زانینی بەختەوەری، شەرمەزاریی ناوێ.

رامبێر گوتی:

ـ بەڵێ، شەرمەزارییە کە مرۆڤ هەر خۆی بەختەوەر بێ.

تارۆ کە هەتا ئەو کاتە متەقی لێوە نەهاتبوو و ئاوڕیشی لێ نەدابوونەوە ئاماژەی بەوە کرد کە ئەگەر رامبێر بەشداری چارەڕەشییەکانی مرۆڤەکان بێ، ئیتر هەرگیز کاتێکی بۆ بەختەوەربوون بۆ نامێنێتەوە. دەبێ هەڵبژێرێ.

رامبێر گوتی:

ـ مەسەلە ئەوە نیە. ئەمن هەمیشە بیرم لەوە کردبۆوە کە لەم شارەدا نامۆم و هیچ ئیشم بەسەر کاری ئێوەوە نیە، بەڵام ئێستێ ئەوەی دەبێ ببیبینم دیتوومە و بمەوێ و نەمەوێ خەڵکی ئەم شارەم. ئەم رووداوە پێوەندیی بە هەمووی ئێوەوە هەیە.

هیچ کەس وەڵامی نەدایەوە و رامبێر بە تاڵووکە گوتی:

ـ تازە، ئێوە باش لەو مەسەلەیە تێدەگەن. ئەگینا لە نەخۆشخانەیەدا خەریکی چین؟ کەواتە ئێوەش هەڵتانبژاردووە و وازتان لە بەختەوەری هێناوە؟

دیسانیش نە تارۆ وەڵامی دایەوەو نە ریڤۆ. بێدەنگییەکە خایاندی هەتا گەیشتنە لای ماڵی دوکتۆر و رامبێر ئەمجارەیان بە هێزێکی زیاترەوە دوایین پرسیاری خۆی دووپاتە کردەوە و تەنیا ریڤۆ ئاوڕێکی لێ دایەوە. بە تەکانێك خۆی قیت کردەوە و گوتی:

ـ داوای لێبوردن رامبێر، بەڵام نازانم. مادام حەزت لێیە، لەگەڵمان بمێنەوە.

تەکانێکی ترۆمبیلەکە بێ دەنگی کرد. دوایی لە حاڵێکدا چاوی لە پێشەوە بڕیبوو لەسەری ڕۆیی:

ـ هیچ شتێك لەم دنیایە بایی ئەوە نیە مرۆڤ دەست لە خۆشەویستەکەی بەر بدا و وازی لێ بێنێ. سەرەڕای ئەوەش ئەمنیش رووم وەرگێڕاوە بە بێ ئەوەی بتوانم بزانم بۆ؟

دیسانەوە لەسەر بالیقی کورسییەکە تخێڵ بۆوە، بە شەکەتییەوە گوتی:

ـ ئەوە راستییەکە. تەواو! یادداشت بکەین و ئەنجامی لێ وەرگرین.

رامبێر پرسی:

ـ چ دەرەنجامێك؟

ریڤۆ گوتی:

ـ مرۆڤ ناتوانێ هەم چارەسەر بکات و هەمیش شت بزانێ. کەوابوو بە هەموو هێزەوە با دەرمان و چارەسەر بکەین. ئەوە پێویستترە.

نیوەشەوێ تارۆ و ریڤۆ نەخشەی ئەو شوێنەیان پێشانی رامبێردا، کە بڕیار بوو بیپشکنن. تارۆ چاوی لە سەعاتەکەی کرد، کە سەری بەرز کردەوە چاوەکانی لە چاوی رامبێر ئاڵقان و پرسیی:

ـ ئاگادارت کردوونەوە؟

ڕۆژنامەنووس ڕووی وەرگێڕا و بە زەحمەتەوە گوتی:

ـ بەر لەوەی بێمە سەردانی ئێوە یادداشتێکم بۆ ناردبوون.

## (٣)

له دوایین ڕۆژەکانی مانگی ئۆکتۆبەردا بوو کە سیڕۆمەکەی کاستێل تاقی کرایەوە. ئەم سیرۆمە دوایین هیوای ریڤۆ بوو. دوکتۆر پێی وا بوو ئەگەر تووشی شکستێکی دیکە بن، ئیتر شار دەکەوێتە دەست هەوا و هەوەسی تاعوونەکەوە یا دیسانیش لە چەندین مانگی دووروودرێژی تر شوێنەواری هەر بمێنێ یا ئەوەیکە بیەوێ لەنەکاو و بەبێ هۆ کۆتایی پێ بێ.

شەوێك بەرلەوەی کاستێل سەردانی ریڤۆ بکا، کوڕەکەی ئاغای ئۆسۆن نەخۆش کەوتبوو و تەواوی ئەندامانی بنەماڵەکەی ناچار ببوون بۆ دووهەمین جار بچنەوە دابڕگە. دایکی نەخۆشەکە، کە تازە لە دابڕگە هاتبووە دەرێ، بۆ دووهەمین جار هەڵاوێردرایەوە. دادوەر، کە رێزی بۆ بڕیارە نوێیەکان دادەنا هەر لەگەڵ ئەوەی نەخۆشییەکەی لە جەستەی منداڵەکەیدا بەدی کرد، گوتی تەلەفۆن بۆ دوکتر ریڤۆ بکەن، کە ریڤۆ گەیشتێ دایك و باوك لە تەنیشت قەرەوێڵەکەوەو لە دەوری منداڵەکە راوەستابوون. منداڵەکە تەواو داهێزرابوو و بەبێ هیچ ناڵینێك هێشتی بیپشکنن. کاتێك دوکتۆر سەری بەرز کردەوە نیگای لە نیگاکانی دادوەر ئاڵقان و لە پشت روخساری ئەوەوە روخساری رەنگبزرکاوی دایکەکەی بینی کە دەسرۆکەیەکی بە بەردەمیەوە گرتبوو و زەق زەق لە دوکتۆری دەڕوانی. دادوەر بە دەنگێکی کز وتی:

ـ خۆیەتی. نا؟

ریڤۆ چاوێکی تری لە منداڵەکە کردەوە و گوتی:

ـ بەڵێ.

چاوی دایکە زەقتر بوونەوە، بەڵام متەقی لێوە نەدەهات دادوەریش بێدەنگ ببوو، ئەوجار بە دەنگێکی هێورتر وتی:

ـ دەی، دوکتۆر، ئێمە دەبێ بەو پێوشوێنە بجووڵێینەوە کە بڕیاری لەسەر دراوە.

ریڤۆ کە خۆی دەبوارد لەوەی چاو لە چاوی ئەو دایکە بکا کە دەسرۆکەکەی هەروا بە بەر دەمییەوە بوو گوتی:

ـ ئەگەر بتوانم تەلەفۆن بکەم زووتر جێبەجێ دەبێ.

ئاغای ئۆسۆن گوتی کە لەگەڵی دەچێ، بەڵام دوکتۆر بەرەو لای ژنە گەڕایەوە و گوتی:

ـ بەداخم. دەبێ ئامادە بن. خۆتان ئاگادارن.

ـ بەڵێ هەر وا دەکەم.

ریڤۆ بەر لەوەی بەجێیان بێڵێ لەخۆوە پرسیی کە ئاخۆ پێویستییان بە هیچ شتێ نیە؟ ژنە، کە هەروا بێدەنگ مابۆوە سەیری دەکرد، بەڵام دادوەر ئەمجارەیان ئاوڕی دایەوە و گوتی:

ـ نەخێر.

دوایی تفەکەی زاری قووت دایەوە و گوتی:

ـ بەڵام منداڵەکەم بۆ رزگار بکە.

دابڕگە کە لەسەرتادا تەنیا شتێکی رواڵەتی بوو، لە لایەن ریڤۆ و رامبێرەوە کرابوو بە شتێکی زۆر دژوار و ورد. بە تایبەتی ویستبوویان کە ئەندامانی یەك بنەماڵەش لە یەکتر جوێ بکرێنەوە بۆوەی ئەگەر ئەندامی بنەماڵەیەك بەبێ ئەوەی خۆی زانیبێ‌ی تووش بووبێ، نەهێڵن پەتاکە لەوە پتر پەرە بگرێ. ریڤۆ ئەو هۆکارانەی بۆ دادوەر شی کردەوە و دادوەر سەلماندنی. سەرەڕای هەمووی ئەوانەش ئەو و ژنەکەی وایان سەیری یەکتری کرد کە دوکتۆر تێگەیشت ئەم دابڕانە چەندەی تێكشکاندوونە. توانییان مادام ئۆسۆن و کچەکەی لە هوتێلی دابڕگە، کە رامبێر بەسەری رادەگەیشت رابگرن، بەڵام لێکۆڵەر جێگەی نەبۆوە. مەگەر لە ئۆردووگای دابڕاوان، کە پارێزگاری بەو خێوەتانەی کە بە قەرز لە شارەوانیی وەرگرتبوون سازی کردبوو. ریڤۆ داوای لێبوردنی لێکرد، بەڵام ئاغای ئۆسۆن گوتی: یاسا بۆ هەمووان وەك یەکە و دەبێ رەچاو بکرێ.

بەڵام منداڵەکە لە نەخۆشخانە بردرایە تەلارێکی وانەگوتنەوەی پێشوو، کە دە قەرەوێڵەیان تێدا دانابوو. ریڤۆ پاش بیست سەعات گوتی لە بارێکی نالەبار دایە و هیچ هیوایەك نیە. جەستە وردەکەی بەبێ هیچ خۆڕاگرییەك لە چڵك و کێمدا نوقم دەبوو. کوانی بچووك بچووك کە تازە سەریان هەڵدابوو، جومگەی ئەندامە مێکوتەلێدراوەکانی ئەویان داپۆشیبوو. منداڵەکە هەر لە سەرەتاوە بە چۆکدا هاتبوو. هەر بۆیە ریڤۆ کەوتە بیری ئەوەی کە سیرۆمەکەی کاستێل لەسەر ئەو تاقی بکاتەوە. هەر ئەو شەوە دوای شیوخواردن بەبێ ئەوەی بچووکترین دژ کردەوەیەك لە منداڵەکە بەدی بکرێ سیرۆمەکەیان لێ دا.

کەڕەی بەیانیی رۆژی دوایی، تەواویان بۆ داوەری لەسەر ئەم ئەزموونە لێبڕاوە، لە تەنیشت قەرەوێڵەی منداڵەکە دانیشتبوون.

منداڵەکە کە لە داهێزراوی هاتبووە دەرێ بە هەڵلەرزینەوە لە سەرچەفەکەدا گرمۆڵە دەبوو. دوکتۆر کاستێل و تارۆ لە سەعاتی چواری بەیانیەوە لە ژوور سەری بوون و هەنگاو بە هەنگاو چاویان بەسەر راوەستان یا هەڵکشانەکانی نەخۆشییەکەوە بوو. لە ژوور سەری قەرەوێڵەکەوە، بەژنی تۆکمەی تارۆ برێك چەمیبۆوە. لە خوار قەرەوێڵەکەوە، ریڤۆ راوەستابوو و کاستێل لە تەنیشتی دانیشتبوو و لە بە هەموو رواڵەتی هێمنیەوە کۆنەکتێبێکی دەخوێندەوە. وردەوردە، کە رۆژ بە تەلارە کۆنەکەی قوتابخانەکەدا بڵاو دەبۆوە ئەوانیتریش گەیشتنێ، پانیلۆ بەر لە هەموان گەیشتێ کە لەو بەری قەرەوێڵەکەوە لە تەنیشت تارۆ راوەستا و پاڵی وەدیوارەکە دا. حاڵەتێکی پڕ لە ئازار بە روخسارییەوە دیار بوو و شەکەتیی تەواوی ئەو رۆژانەی کە خۆی بۆ تەرخان کردبوون چرچ و لۆچیان خستبووە نێوچەوانە سوورەکەی ئەوەوە. ژۆزێف گرانتیش گەیشتێ، سەعاتی حەوت بوو و کارمەندی شارەوانی داوای لێبوردنی کرد کە هانکەهانکی دێ. ئەو لە ساتێك پتر لەوێ نەدەمایەوە تەنیا دەیویست بزانێ کە ئاکامێکی روونیان وەرگرتووە یان نا؟ ریڤۆ بەبێ ئەوەی متەقی لێوەبێ، منداڵەکەی نیشان دا کە بە چاوی بەستراوەوە لە روخسارە تێکشکاوەکەیدا بەو ددانانەوە کە بەهەموو توانای خۆی لەسەر یەکی دادەگرتن، بە جەستەیەکی بێجووڵە بێبڕانەوە سەری لەسەر سەرینەکەی ئەمدیو ئەودیو دەکرد. ئاخری کاتێك کە رۆژ ئەوەندە روون بۆوە کە توانییان لە سەر تەختە رەشی ئەو سەری هۆڵەکە کە هەر لە شوێنی خۆی مابوو

شوێنەواری فۆرموله سڕدراوەکان وەخوێنن، رامبێر گەیشتێ. پاڵی وەقەرەوێڵەی بەرامبەر دا و پاکەتی جگەرەگەی دەرهێنا، بەڵام پاش ئەوەی سەیرێکی منداڵەکەی کرد سەر لە نوێ پاکەتەکەی خستەوە گیرفانی.

کاستێل کە هەروا دانیشتبوو و لەسەر چاویلکەکانیەوە سەیری ریڤۆی دەکرد گوتی:

ـ هەواڵی باوکیت هەیە؟

ریڤۆ گوتی:

ـ نەخێر لە ئۆردووگای جیاکراوەکانە.

دوکتۆر میلەی ئەو قەرەوێڵەیەی توند گوشی کە منداڵەکە لەسەری دەیناڵاند. چاوی لەو نەخۆشە گچکەیە نەدەترووکاند کە لە نەکاو جەستەی رێك و رەق راگرت و بەو ددانانەوە کە زیاتر لەسەر یەکتری دادەگرتن بڕێك لە قەرەوێڵەکەدا رۆچوو و بە هێمنی دەستەکانی لێك ئاوەڵا کردن. بۆنی پەشم و ئارەقەی ترشاو لە جەستەی وردی بن بەتانیە سەربازییەکەوە هەڵدەستا. منداڵەکە وردەوردە خۆی شل کرد و دەست و لاقەکانی بەرەو نێوەندی قەرەوێڵەکە هێنا و هەر وا کوێرو بێ زمان دەتگوت خێراتر پشوو دەکێشێ. ریڤۆ چاوی لێ وەرگێڕا.

ئەوان بەر لەوە، مەرگی گەلێك منداڵیان دیتبوو، چونکە بەڵا و ترس، قوربانیی خۆیان هەڵنەدەبژارد، بەڵام هەتا ئێستا هەرگیز وەکوو ئەو رۆژە سات بە سات ئەشکەنجەی ئەوانیان نەبینیبوو. دیارە ئەو ئازارەی کە ئەو بێ تاوانانە دەیانچێشت، بە ڕای ئەوان هەمیشە بە واتای راستەقینەی خۆی، واتە بە شێوەی کارەساتێکی بێزراو خۆی دەرخستبوو، بەڵام هەتا ئەو رۆژە رق و بێزارییەکەی ئەوان بە واتایەك تایبەت بوو. لەبەر ئەوەی قەت ئاوا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە نزیکەوە بینەری ئاویلکەدان و گیاندانی بوونەوەرێکی بێ تاوان نەببوون.

هەر لەو ساتەدا، هەر وەکوو بڵێی کونێکت لە گەدەی کردبێ دیسان بە ناڵینێکی دوو جۆرە، گرمۆڵە بۆوە. بۆ ماوەی چەند چرکەیەك هەروا بە چەماوەیی مایەوە. هەڵلەرزینی بە مچووڕکەوە جەستەی رادەتلەکاند وەك بڵێی جەستەی لاوازی ئەو لە ژێر باری تووڕەی تاعووندا گرمۆڵە دەبوو و لە ژێر پشووی لەسەر یەك و ئاگرینی "تا" دا ورد دەبوو. کاتێ ئەو تەوژمە تێپەڕی منداڵەکە بڕێك کەم بۆوە. وەك بڵێی تەوژمی تا کشابێتەوە و ئەوی لەسەر کەنارێکی

شێدار و ژەهراوی جێ هێشتبێ کە حەسانەوە تێیدا هەر مەرگ بوو. کاتێك دیسانیش شەپۆلی سووتێنەر بۆ سێهەمین جار هێرشی هێنایەوە و ئەوی برێك لە جێگەکەی بەرز کردەوە، منداڵەکە خۆی وێك هێنا و لە نێو ترسی ئەو بڵێسەیەدا کە ئەوی هەڵدەچۆقاند خۆی خزاندە ئەو سەری قەرەوێڵەکە و بەتانیەکەی لەسەر خۆی لادا و شێتانە سەری راوەشاند. دڵۆپی درشتی فرمێسك کە لە بن پێڵوە هەڵمساوەکانیەوە هاتبوونە دەرێ، بەرەو روخسارە رەنگبزرکاوەکەی لووزەویان بەست و لە کۆتایی تەوژمەکەدا منداڵەکە کە بەحاڵ گیانی لەبەردا مابوو، لاقە لاوازەکانی و باسکەکانی کە لە ماوەی چلوهەشت سەعاتدا هەموو گۆشتەکەیان تولابۆوە، کۆ کردنەوە و لە نێو قەرەوێڵە شپرێوەکەدا وا راکشا دەتگوت لە خاچ دراوە.

تارۆ چەمییەوە و بە دەستە قورسەکانی ئارەقەی سەر روخسارە وردیلەکەی سرییەوە. ساتێك دەبوو کە کاستێل کتێبەکەی پێوەدا بوو و، سەیری نەخۆشەکەی دەکرد. هات قسەیەك بکا، بەڵام بۆ تەواو کردنەکەی ناچار بوو بکۆکێ، لەبەر ئەوەی کە لەنەکاو دەنگی گۆڕابوو. گوتی:

ـ ریڤۆ هیچ پێوەی دیار نیە پەتاکە پاشەکشەی کردبێ؟

ریڤۆ گوتی: نەخێر، بەڵام ئەو منداڵە بە شێوەیەکی نائاسایی ململانێ دەکا. پانیلۆ کە برێك پاڵی وەدیوارەکەوە دابوو بە بیستنی ئەو قسەیە بە لەبزێکی تێکەڵەوە گوتی:

ـ ئەگەر دەبێ بمرێ ماوەیەکی درێژتر ئازار دەچێژێ.

ریڤۆ لە پڕ ئاوڕی لێ دایەوەو زاری کردەوە قسەیەك بکا، بەڵام بێدەنگ بوو بە ئاشکرایی هەوڵی دا بەسەر خۆیدا زاڵ با و روخساری بەرەو منداڵەکە وەرسووڕاند.

تەلارەکە هەر دەهات و روونتر دەبۆوە. لەسەر پێنج قەرەوێڵەی تر پێنج تارمایی دەجوولانەوە و دەیانناڵاند، بەڵام بە جۆرە پارێزێکەوە کە دەتگوت لەوە پێش دارێژراوە. تەنیا یەکێك لەوسەری هۆڵەکەوە ماوە بە ماوە هاواری کورت کورتی لێ هەڵدەستا و ئەو هاوارانە کە بەر لەوەی نیشانەی ژان و ئازار بن زیاتر دەتگوت هۆی سەرسووڕمانن.

هەستت دەکرد کە تەنانەت نەخۆشەکانیش ئەو ترسەی رۆژەکانی سەرەتایان نەماوە. تەنانەت دەتگوت ئێستا بۆ بەرەوروو بوونەوە لەگەڵ نەخۆشییەکە جۆرە رێککەوتنێکیان لە نێواندا هەیە. تەنیا منداڵەکە بە هەموو هێزەوە پەلەقاژەی دەکرد. ریڤۆ کە جاروبارە نەك بە پێی پێویست بەڵکو بۆ

دەربازبوون لەو بێ دەنگییە تێکەڵ بە دەستەوستانیەی تووشی ببوو، ژمارەی ترپەی دڵی منداڵەکەی دەگرت و چاوەکانی خۆی لەسەر یەك دادەنان و هەستی دەکرد کە ئەو هەوڵە تێکەڵی خوێنی ئەو دەبێ. ئەوجار خۆی لە بری ئەو منداڵە ئازار چێژە دادەنا و دەیویست بە تەواوی توانای خۆیەوە کە هێشتا شەقڵ نەشکاو مابۆوە، پشتیوانیی لێ بکا، بەڵام ترپەی دوو دڵ کە بۆ ساتێك هاوڕێتم ببوون لێك دوور دەکەوتنەوە، منداڵەکە لە دەستی رادەپسکا و هەوڵەکانی ئەو لە بۆشاییدا دەکووژانەوە. ئیتر مەچەکی دەستە لاوازەکەی بەردەدا و دەگەڕایەوە سەر جێگەی خۆی.

بە درێژایی دیوارەکان کە سپی بوون روناکایی لە سوورەوە بەرەو زەردی دەچوو. لەو دیو شووشەکانەوە پێش نیوەڕۆیەکی داغ دەستی بە هەڵچۆقین دەکرد. بە زەحمەت دەنگی گرانتیان دەبیست کە دەرۆیشت و دەیگوت دوایی دەگەڕێتەوە. هەمووان چاوەڕوان بوون. منداڵەکە کە چاوەکانی هەروا قووچابوون، وێدەچوو برێك هێورتر بۆتەوە. دەستەکانی کە وەکوو چەتاڵیان لێ هاتبوو، بە هێمنی چنجرووکی لە لێواری قەرەوێڵەکە دەگرت. دەستەکان هاتنە سەری و سەرچەفەکەیان هەتا نزیك ئەژنۆکانی هەڵدایەوە و لەنەکاو لاقەکانی خڕ کردنەوە رانەکانی هێنایە نزیك زگی و جووڵەی لێ بڕا. ئەوکاتە بۆ یەکەمین جار چاوەکانی هەڵێنانو سەیری ریڤۆی کرد کە لە بەرامبەری راوەستابوو. لە قووڵایی گلێنەیدا کە ئێستا دەتگوت سوورەگڵێکی تۆخت تێ کردوون، زاری داپچڕی و دەمودەست تەنیا یەك هاواری بەرزی لێوە هەستا کە هەناسەکان بەحاستەم دەیانگۆڕی و لەپڕ ناڕەزایەتییەك تەلارەکەی ئاخنی کە زۆر مرۆییانە نەبوو، بەڵام لە هەمان کاتدا دەتگوت لە زاری هەموو مرۆڤەکانەوە دێتەدەرێ. ریڤۆ ددانی لە ریچەوە دەبردن و، تارۆ رووی وەرگێڕا. رامبێر لە قەرەوێڵەکە چووە پێش و لە کاستێل نزیك بۆوە و کاستێل کتێبەکەی کە لەسەر رانەکانی دانابوو لێك نا. پانیلۆ سەیری ئەو زارە منداڵانەیەی کرد کە نەخۆشی پیسی کردبوو و، سیخناخ بوو لە هاواری هەموو چاخ و سەدەکان و، بە هێمنی چۆکی دادا و هەمووان، بەبێ ئەوەی بەلایانەوە سەیر بنوێنێ گوێیان لێ بوو کە بە دەنگێکی کز، بەڵام بە وشەگەلێك کە لە نێو سکاڵای ناروون و بەردەوامی نەخۆشان دا تەواو دیار بوو دەڵێ: " خوایە، ئەم منداڵە رزگار بکە."

بەڵام منداڵەکە هەروا هاواری دەکرد و نەخۆشەکان لە چوار تەنیشتی ئەو هەژان. ئەو نەخۆشەی کە لەوسەری تەلارەکەوە هەروا دەیناڵاند مەودای ناڵینەکانی کەمتر کردنەوە هەتا ئەوەی کە وردەوردە ئی ئەویش بوونە هاواری راستەقینە و هەر لەو جەنگەیەدا ئەوانیتریش بە دەنگێك کە سات بە سات توندتر دەبوو دەیاننالاند. شەپۆلێك لە کلپەی گریان تەلاری داگرت و نزای پێرپانیلۆیان لە خۆدا ون کرد و ریڤۆ کە دەستی بە میلەی قەرەوێڵەکەوە گرتبوو لە حالێکدا کە شەکەتیو بێزاری وەکوو سەرخۆشانی لێکردبوو چاوەکانی لێکنا.

کاتێك چاوی هەڵێنان تارۆی لە تەنیشت خۆی بینی. ریڤۆ گوتی:

ـ ئەمن دەبێ برۆم. ئیتر تاقەتم نیە.

بەڵام لە پڕ، نەخۆشەکانی تر بێ دەنگ بوون. ئیتر دوکتۆر زانی کە دەنگی منداڵەکە کز بووە، دیسان کزتر ببووەو نووزەی لێبڕابوو. لە دەورووبەری ئەو سکاڵا و بۆڵەبۆڵ بەرز دەبۆوە، بەڵام کزترو وەکوو زایەڵەی دووری ئەو ململانیەی کە کۆتایی پێ هاتبوو. چونکە بەربەرەکانێکە کۆتایی هاتبوو. کاستێل چووبووە ئەو بەری قەرەوێڵەکە و گوتی تەواو بووە. منداڵەکە بە زاری داپچڕاو، بەڵام بێدەنگەوە لە قووڵایی سەرچەفە ئالۆزەکاندا جووڵەی لێ بڕابوو. جەستەی لەگەڵ پاشماوەی فرمێسکەکانی سەر روخساری لە نەکاو بچووك ببۆوە.

پانیلۆ لە قەرەوێڵەکە چووە پێشێو رێورەسمی (پیرۆزکردنی) بەجێ هێنا. لە پاشان تەشكوداوێنی باڵاپۆشەکەی کۆ کردەوە و بە نێوەڕاستی قەرەوێڵەکاندا وەڕێکەوت.

تارۆ لە کاستێلی پرسی:

ـ دەبێ دیسان لە سەرڕاوە دەست پێ بکرێتەوە؟

پزیشکە پیرە سەری بۆ دەلەقاند. بە بزەیەکی لەرزۆکەوە گوتی:

ـ لەوانەیە. لەگەڵ هەموو ئەو شتانەش، ماوەیەکی زۆر خۆی راگرت.

بەڵام هەر ئەو کاتە ریڤۆ بەحاڵەتێکەوە و ئەوەندە خێرا چووە دەرێ، کە وەختێ بە تەنیشت پانیلۆدا تێپەڕی، قەشە باسکی درێژ کرد بۆوەی پێشی پێ بگرێ و پێی گوت:

ـ راوەستە دوکتۆر!

ریڤۆ هەر بەو حاڵەتە قەڵیسەوە گەڕایەوە و بە تووڕەییەوە بەسەریدا نەڕڕاند:

ـ ئاخخ، خۆ تۆ دەزانی لانیکەم ئەوەیان بێ تاوان بوو!

ئیتر گەڕایەوە و بە بەردەمی پانیلۆدا لە تەلارەکە چووە دەرێ و، خۆی گەیاندە ئەو سەری قوتابخانەکە. لە نێو دارودەوەنە کورتو تۆزاوییەکان دا، لەسەر قەرەوێڵەیەك دانیشتو ئەو ئارەقەیەی سڕییەوە کە لە چاوی دەچۆڕا. حەزی دەکرد یەك بەخۆی بقیژێنێ بۆ ئەوەی بەڵکو ئەو گریێیەی وا دڵی دەهاڕی و دەیئەنجنی، بکاتەوە. گەرما وردەوردە لە نێو چڵ و پۆپی دارە هەنجیرەکانەوە دەڕژایە خوارەوە. ئاسمانی شینی دەم بەیانی بە خێرایی تارایەکی مەیلەوسپیی بەسەر دەکشا کە هەواکەی دەمەیاند*.

ریڤۆ لەسەر قەرەوێڵەکە لێی تخێڵ بوو. سەیری چڵوپۆپی دارەکان و ئاسمانی دەکرد. وردە وردە پشووی دەهاتەوە بەر خۆی و هەر دەهات و لە شەکەتییەکەی خۆی کەم دەکردەوە.

دەنگێك لە پشت سەرییەوە گوتی:

ـ بۆ دەبێ ئاوا بە تووڕەیی من بدوێنی؟ ئەو دیمەنە بۆ منیش تاقەتپڕووکێن بوو.

ریڤۆ بەرەو پانیلۆ وەرسووڕایەوە و گوتی:

ـ وایە. ببوورە، بەڵام ماندوویەتی جۆرێکە لە شێتی. لەو شارەدا جاری وایە ئەمن جگە لە نافەرمانی هیچم بە مێشکیدا نایە.

پانیلۆ بە هێمنی گوتی:

ـ تێ دەگەم. ئەم رەوشە وات لێ دەکا سەرپێچی بکەی. لەبەر ئەوەی سنوورەکانی ئێمەی بەزاندووە، بەڵام لەوانەیە پێویست بێ ئەو شتەمان خۆش بوێ کە ناتوانین تێی بگەین.

ریڤۆ بە تەکانێك هەستایە پێ. هەر بەو هێز و خرۆشەی کە لەخۆی دا شك دەبرد سەیری پانیلۆی دەکردو سەری رادەوەشاند. گوتی:

ـ نا، باوە. عیشق بە لای منەوە مانایەکی دیکەی هەیەو هەتا هەین بێزارین لەو سیستەمەی کە تێیدا منداڵان ئازار دەچێژن.

پانیلۆوە سێبەری تێکچوونێك لە روخساری نیشت. بە لەبزێکی خەمناکەوە گوتی:

---

* مەیاندن: توندکردن. ئەم دەستەواژەیە زیاتر بۆ ماست بەکار دەبردرێ و دەڵێن ماستەکە نەمەیوە یا مەیوە. لێرەدا مەبەست ئەوەیە هەواکەی وا لێ دەکرد کە مرۆڤ پشووی پێی سوار بێ.وەرگێڕ ك.

ـ ئاخ دوکتۆر ئێستا دەزانم لێبوردەیی چ واتایەکی هەیە.

ـ بەڵام ریڤۆ دیسان لەسەر قەرەوێڵەکە لێی پان بۆوە. لە قووڵایی شەکەتییەکەیەوە کە گەڕابۆوە بە لەبزێکی نەرمترەوە وەڵامی دایەوە:

ـ دەزانم، ئەوە شتێکە کە ئەمن نیمە، بەڵام ئەمن نامەوێ لەسەر ئەو شتە قسەت لەگەڵ بکەم. ئێمەش ئیش بۆ شتێك دەکەین کە لەو پەڕی جوێن و نزاکانەوە یەکگرتووی کردووین. هەر ئەمە بە تەنیا بەسە.

پانیلۆ لە تەنیشت ریڤۆوە دانیشت. دەتگوت هەڵچووە. گوتی:

ـ بەڵێ، بەڵێ. ئێوەش بۆ رزگاریی مرۆ هەوڵ دەدەن.

ریڤۆ هەوڵی دا بزەیەکی بێتێ:

ـ رزگاریی مرۆ بە لای منەوە وشەیەکی زۆر مەزنە. ئەمن ئەوەندە دوور ناڕۆم، حەزم لە تەندرووستیو سلامەتیی مرۆیە، لە پێشدا تەندرووستیی ئەو.

پانیلۆ دڕدۆنگ بوو. گوتی:

ـ دوکتۆر...

بەڵام بێدەنگ بوو. نێوچەوانی ئەویش ئارەقەی لێ دەتکا. لە بن لێوەوە گوتی:"ماڵ ئاوا."و کاتێك کە هەستایە پێ چاوەکانی دەبریسکانەوە. لەو کاتەدا کە دەیویست بڕوات، ریڤۆ کە لە بیرەوە چووبوو، لە جێی خۆی هەستا و هەنگاوێك بەرەو ئەو رۆیشت و گوتی:

ـ دیسان داوای لێبوردن دەکەم. ئەم گۆڕانە ئیتر دووپاتە نابێتەوە.

پانیلۆ دەستی بۆلای درێژ کرد و بە پەژارەوە گوتی:

ـ لەگەڵ ئەوەشدا نەمتوانی قایلت بکەم.

ریڤۆ گوتی: ـ چ پێویست دەکا؟ ئەتۆ باش دەزانی کە ئەوەی من لێی بێزارم مەرگ و خراپەیە. و تۆ پێت خۆش بێ و پێت ناخۆش بێ ئێمە لە بەربەرەکانێ لە بەرامبەریاندا و لە تەحەمولکردنیان پێکەوە و هاودەنگ نین.

ریڤۆ دەستەکانی پانیلۆی بە دەستەوە بوون و لە حاڵێکدا خۆی لەوە دەبوارد چاو لە چاوی بکا گوتی: ـ ئەوەتا، ئێستا ئیتر خوایش ناتوانێ لێکمان بکاتەوە.

## (٥)

پانیلۆ لەو کاتەوە کە چووبووە نێو ڕێکخراوی تەندروستییەوە، نەخۆشخانەو ئەو شوێنانەی بە جێ نەهێشتبوو کە تاعوونیان تێدا بەدی دەکرا، لە نێو ڕزگاریدەرەکاندا لەو ڕیزەدا کە پێی وابوو دەبێ لەوێ بێ، واتە لە ڕیزی پێشەوە بوو. بە گوێرەی پێویست بەرەنگاری مەرگ ببۆوە و لەگەڵ ئەوەدا کە بە سیرۆم دەپارێزرا، لەگەڵ بیرکردنەوە لە مەرگی خۆیشی، نامۆ نەبوو. بە ڕواڵەت هێمنی و لەسەرەخۆیی خۆی دەپاراست، بەڵام لەو ڕۆژەوە کە چەند سەعات لەسەر یەك بینەری گیانەرچوونی منداڵێك بوو دەت گوت گۆڕاوە. گوشاری دەروونی ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ لە ڕوخساری دا بەدی دەکرا. و ئەو ڕۆژەش کە بە بزەوە بە ڕیۆی گوت کە خەریکی ئامادەکردنی نامیلەکەیەکە بە ناوی:"ئاخۆ قەشە دەتوانێ ڕاوێژ بە پزیشك بکا؟" دوکتۆر هەستی کرد کە مەسەلەکە لەوە گرینگترە کە پانیلۆ خۆی دەیڵێ. چونکە دوکتۆر گوتی حەزی لێیە بزانێ ئەو کارە چییە، پانیلۆ پێی ڕاگەیاند کە بڕیارە وتارێك لەسەر " ڕێوشوێنی ئایینیی پیاوان" بخوێنێتەوە و بە کەڵکوەرگرتن لەم دەرفەتە لانیکەم بڕێك لە بیروبۆچوونەکانی خۆی دەردەبڕێ و گوتی:

ـ دەمویست ئەتۆش بێی دوکتۆر. بابەتەکەت بەلاوە سەنجڕاکێش دەبێ.

"پێر" دووەمین وتاری خۆی لە ڕۆژێکدا خوێندەوە کە بایەکی بەقەوەت هەڵی کردبوو. لە ڕاستیدا ئەوەندە خەڵکەی هاتبوون گوێی بدەنێ، لەچاو یەکەم وتار کەمتر بوون. لەبەر ئەوەی کە

ئەم جۆرە خۆنواندنانە ئیتر بە لای خەڵکی شارەکەی ئێمەوە سوابوون و شتێکی نوێ و سەرنجڕاکێش نەبوون. لەو بارەنالەبارەدا کە شار تێیدا دەژیا، تەنانەت وشەی "نوێ"ش واتاکەی خۆی نەمابوو. لە لایەکی دیکەوە، زۆربەی خەڵك، ئەگەر بە تەواوەتیش وازیان لە ئەرکەکانی خۆیان نەهێنابوو، یا ئەگەر ئەرکەکانیان لەگەڵ جۆرێك ژیانی تەواو شەخسی کە بە تەواوەتی پێچەوانەی ئەخلاق بوو تێکەڵ نەدەکرد، ژمارەیەکیان، باوەڕگەلی خۆرافی و پێچەوانەی عەقڵیان خستبووە جێی کردەوە و هەڵسوکەوتەکەی جارانیان. لەبری بەشداربوون لە ڕێوڕسمە ئایینیەکاندا، میداڵی بەلاگێڕەوە و نووشتەی "ساینت رۆش"یان بە ملیانەوە هەڵدەواسی.

بۆ وێنە دەکرێ ئاماژە بەو گرینگییە لەڕادەبەدەرە بکەین کە هاووڵاتییەکانی ئێمە بە بەربێژی*یان دەدا. لە بەهارێ دا، هەردەم چاوەڕوان بوون، کە نەخۆشییەکە کۆتایی پێ بێ و هیچ کەس بیری لەوە نەدەکردەوە کە لەسەر ماوەی نەخۆشییەکە شتێك لەویتر بپرسێ، لەبەر ئەوەی دڵنیا بوون کە زۆر ناخایەنێ، بەلام بە تێپەڕینی رۆژەکان، وردەوردە خەڵك ترسی ئەوەیان رێنیشت کە پەتاکە کۆتاییەکی نەبێ‌و لەنەکاو کۆتایی پەتا بوو بە بابەتی تەواوی هیواوو ئاواتەکان. بەو شێوەیە بەربێژییەکانی ئەستێرەناسەکان و یا پیروپیاوچاکانی کلێسەی کاتۆلیك دەستاودەستیان دەکرد. چاپخانەکانی شار لەڕێوە بە کەڵکوەرگرتنێ کە لەو تاسەبارییە دەتوانن بیکەن تێگەیشتن و ئەو دەقانەی کە دەستاودەستیان دەکرد لە ژمارەی زۆردا نەسکیان لێ گرتنەوە و بلاویانی کردنەوە.و لەبەر ئەوەی دیتیان کە هەستی کونجکۆڵیی خەڵك دانامرکێ، ژمارەیەکیان راسپارد کە لە کتێبخانەکان دا بکەونە لێکۆڵینەوەو پشکنین بۆوەی نەسك لە تەواوی ئەو شایەتە هەڵگرنەوە کە مێژوو دەیتوانی بیانخاتە روو و لە شار دا بلاویان کردنەوە. کاتێك دیتیان کە مێژووش وەلامدەری ئەو جۆرە بەربێژییانە نیە، نووسینی ئەم بابەتگەلەیان بە رۆژنامەنووسەکان ئەسپارد و ئەوان، لانیکەم بۆ ئەم بابەتە تایبەتییە، نیشانیان دا کە لە پێشینیانی خۆیان کەمتواناتر نین.

تەنانەت هێندێ لەو بەربێژییانە بە شێوەی پەراوێز لە رۆژنامەکاندا بلاو دەبوونەوە و خەڵك وەك چۆن لەسەردەمی تەندرووستی و دوورەبەلاییدا چیرۆکە هەستبزوێنەکانیان خوێندبوونەوە،

---

* بەربێژی: پێشبینیکردنی رووداوو چارەنووس کە لە فارسیدا پێی دەگوترێ(پیشگویی)و.ك.

ئاواش ئەوانەیان دەخوێندنەوە. هێندێ لەو بەربێژییانە، لەسەر بنەمای کۆمەڵێك لێکدانەوەی سەیروسەمەرە بوون کە تێیان دا مێژوو، تەمەنی مردووەکان و ژمارەیان و ئەو مانگانەی کە لە ژێر هێژموونیی تاعوونی رابردوودا بوون، دەوری دەگێڕا. هێندێکی تر، لەگەڵ تاعوونە گەورەکانی مێژوودا بەراوردییان دەکرد و لە نێویاندا هێندێ وێکچوویییان دەدۆزینەوە (کە لە بەربێژیدا پێیان دەگوترێ "نەگۆڕ") و لە رێگەی لێکدانەوەی سەیر و سەمەرەی دیکەوە، دەیانگوت کۆمەڵە دەستوور و رێوشوێنێکیان بۆ رەوشی ئێستا لەو لێکدانەوانەیان هەڵێنجاوە، بەڵام لەو نێوەدا، ئەوەی لە هەموان پتر باوەڕی پێ دەکرا، بێ گومان ئەوانە بوون کە، بە زمانێکی ناڕوون باسی زنجیرە رووداوێکیان دەکرد کە لەوانەبوو هەرکام لەو رووداوانە راست ئەو بەڵایە بێ وا شارەکە تووشی ببوو و ئاڵۆزی و ناڕوونیەکەی وای کردبوو بە هەموو شێوەیەك راڤە و تەفسیر بکرێ، بەو شێوەیە هەموو رۆژێ، دەگەڕانەوە سەر بەربێژییەکانی نۆسترادامۆس(ئەستێرەناس و پزیشکی فەرەنسی)و ساینت ئۆدیلە و بەردەوام ئاکام و دەرەنجامیان لێ وەردەگرتن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی لە تەواوی ئەو بەربێژییانەدا هاوبەش بوو، ئەوە بوو کە هەر هەموویان بە جۆرێك لە جۆرەکان دڵنیاکەرەوە بوون. تەنیا تاعوون بوو کە هیچ دڵنیاییەکی نەدەبەخشی.

کەوابوو ئەو خۆرافاتانە، بۆ خەڵکی شارەکەی ئێمە جێی ئایینی دەگرتەوە و لەو رووەوە وتارەکەی پانیلۆ لە کلێسەیەکدا خوێندرایەوە کە تەنیا سێ لەسەر چواری پڕ لە خەڵك بوو. شەوی وتارەکە، کاتێك ریڤۆ گەیشتێ، با لە کەلێنی دەرگاکانی وەژوورکەوتنەوەوە دەخزایە نێو کلێسەوە و بە ئازادی بە نێو بیسەراندا دەسووڕایەوە. لەم کلێسە سارد و بێدەنگەدا، لە نێو بەشداراندا کە هەر هەموویان پیاو بوون، دانیشت و قەشەی بینی کە چووە سەر مینبەر. پانیلۆ بە لەبزێکی هێورتر و لەسەرخۆتر لەجاری پێشوو قسەی کرد و بەشداربووان چەندین جار، نیشانەی گومانیان لە وتارەکەیدا بەدی کرد. سەیرتر ئەوەیە کە ئیتر نەی دەگوت"ئێوە" بەڵکو دەیگوت "ئێمە".

لەگەڵ ئەوەشدا وردەوردە دەنگی پتەوتر دەبوو. سەرەتا ئەوەی بیر خستنەوە کە، چەند مانگێکە تاعوون لە نێوماندایە و ئێستا باشتری دەناسین لەبەر ئەوەی گەلێ جاران بینیومانە لەسەر مینبەرەکان، یا لە ژوور سەری ئەو کەسانە دانیشتووە کە خۆشمان ویستوون، شان بە

شانمان ڕۆیشتووە و چاوەڕێ بووە بگەینە شوێنی ئیشکردنمان. کەوابوو لەوانەیە ئێستا باشتر بتوانین ئەو شتە فێر بین کە تاعوون بێوچان پێی دەگوتین. چونکە سەرەتا لەوانەبوو نەمانبیستبێ. ئەوەی پێشتر پانیلۆ هەر لەم شوێنە گوتبووی هەروا لەسەر جێی خۆی بوو. یا لانیکەم خۆی لەسەر ئەو باوەڕە بوو، بەڵام لەوانەیە دیسانیش هەر وەك بەسەر هەمووماندا دەهات و بۆ ئەویش بەژان بوو، ئەو دوور لە بەزەیی بیری کردبۆوە و قسەی کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی لەو نێوەدا ڕاستەقینەبوو ئەوە بوو کە بەردەوام هەر شتەی پەند و دەرسێکی تێدایە. توندترین تاقیکردنەوەکانیش بۆ مەسیحییەك قازانجێکی پێوەیە و بە دڵنیاییەوە ئەو شتەی مەسیحیەك وەشوێنی دەکەوێ، قازانجی خۆیەتی و لەگەڵ ئەوەی ئاخۆ ئەو قازانجە لە کوێوە هاتووە و چۆن دەکرێ بیدۆزیتەوە.

لەو ساتەدا، لە دەور و پشتی ریڤۆ، خەڵك لە نێو دەسکی کورسییەکانیاندا بارەوباریان کرد و چۆنی ئاسوودە و بەڕەحەت بوون، ئاوا دانیشتن.

یەکێك لە دەرگا چەرمییەکانی وەژوورکەوتن بە هێمنی پێوە درا. یەکێك لە جێگەی خۆی هەستایە پێ، بۆوەی نەهێڵێ بجوولێ و، ریڤۆ کە بەو جووڵەیە بیری شێوابوو بە زەحمەت گوێی لە دەنگی پانیلۆ بوو کە دەستی بە ئامۆژگارییەکەی کردەوە. دەکرێ بڵێین قەشە دەیگوت نابێ هەوڵ بدەن دیمەنەکانی تاعوون بێننە بەرچاوتا، دەبێ ئەوەی وا شیاوی لێ فێربوونە لێی فێر بین. ریڤۆ بە شێوەیەکی ناڕوون هەستی کرد قەشە هیچ شتێك بە شیاوی شیکردنەوە و وێناکردن نازانێ. کاتێك سەرنجی ڕاکێشرا کە پانیلۆ بە لەبزێکی توند گوتی: بە لای خوداوە شتگەلێ هەن کە دەکرێ قسەیان لەسەر بکەی و شییان بکەیتەوەو شتی واش هەن کە هەر بۆوە نابن قسەیان لەسەر بکەی. بێ گومان "چاکە" و خراپە هەبوون و خەڵك بە گشتی زۆر بە سانایی قسەیان لەسەر ئەو شتانە دەکرد کە ئەو دووانەیان لێك جوێ دەکردنەوە، بەڵام گرفتی کارەکە ئەو کاتە دەستی پێ دەکرد کە قسە لەسەر خراپە دەکرا. بۆ وێنە خراپەیەك هەبوو کە بە ڕواڵەت پێویست بوو و خراپەیەکیش کە بە ڕواڵەت پووچ و زیادی بوو. لە لایەکەوە "دۆن ژوان" هەیە کە بە دۆزەخدا ڕۆچوو و لە لایەکیشەوە مەرگی منداڵێك. هەر چونکە بەجێیە خودا غەزەب لە پیاوی هەوەسباز بگرێ، بەڵام مرۆ نازانێ منداڵێك بۆ دەبێ ئازار بکێشێ و لە

راستیدا  هیچ شتێك لەسەر ئەم زەوییە گرینگتر نیە لە ئازاری منداڵێك و ترسێك کە ئەو ئازارە لەگەڵ خۆیدا دەیهێنا و هۆکارگەلێك کە دەبێ بۆی بدۆزیتەوە. لە مەسەلەکانی دیکەی ژیاندا، خودا هەموو شتێکی بۆ ئێمە ئاسان دەکردەوە و هەتا ئێرە ئایین پێویستییەکی بەوە نەبوو حەقی پێ بدرێ، بەڵام لێرەوە ئایین ئێمەی لە بن دیواران دانابوو. بەو شێوەیە ئێمە لە بەردەم دیوارە گەورەکانی تاعووندا بووین و لە سێبەری مەرگهێنەری ئەو دیوارانەدا بوو کە دەبوایە قازانج و بەرژەوەندیی خۆمان لەبەر چاو بێ. پێرپانیلۆ تەنانەت ئەو قازانجە ئاسان وەدەستهاتووەشی وەلا نا کە بەهۆی وەسەر کەوتن و تێپەڕین لە دیوارەکانەوە وەدەست دەهات، بۆ وی ئاسان بوو بڵێ ئەو چێژە ئەبەدییەی چاوەڕێی منداڵەکە بوو، قەرەبووی ئازارەکەی دەکاتەوە.

بەڵام لە راستیدا  هیچ شتێکی لەم بارەوە نەدەزانی. لە راستیدا کێ دەیزانی بڵێ بەردەوامی و ئەبەدیبوونی شادییەك دەتوانێ چرکەیەك لە ئازارەکانی مرۆ قەرەبوو بکاتەوە؟ بە دڵنیاییەوە تاکی مەسیحی، کە مەسیح لە جەستە و رۆحی خۆیدا هەستی بە ئازارەکانی ئەو کردووە قسەی وا ناکا. نەخێر قەشە بە وەفاداربوون بەو ئازار و ئەشکەنجەیەی کە خاچ نیشانەکەیەتی و لە بەرامبەر ئازاری منداڵێکدا لە بەردەم دیوارەکاندا دەمێنێتەوە. و بەبێ ترس و دڵەڕاوکێ بە هەموو ئەو کەسانەی گوێ لە قسەی ئەو رادەگرن دەڵێ:" براکانم، چرکەساتی بڕیاردان گەیشتووە. دەبێ یان باوەڕ بە هەموو شتێ بێنن یا نکوڵی لە هەموو شتێ بکەن و لە نێو ئێوەدا کێ هەیە بوێرێ نکوڵی لە هەموو شتێ بکا؟"

ریقۆ چرکەیەك دەرفەتی هێنا بیر لەوە بکاتەوە کە قەشە خەریکە لە دین وەردەگەڕێ، بەڵام رێك لەودەمەدا پانیلۆ بە تین و گوڕێکی زیاترەوە دەستی کردەوە بە قسە و گوتی: ئەم بڕیار و چاوەڕوانیە بە قازانجی هەموو مەسیحیەکە و هەروەها لایەنە باشەکەیەتی. قەشە دەیزانی لایەنی زێدەڕۆیانەی ئەو باشییەی وا دەیویست باسی بکا بۆ ئەوەندە رۆحەی کە خوویان بە ئەخلاقێکی بەخشەندەتر و ئاساییترەوە گرتووە راچڵەکێنەر دەبوو، بەڵام ئایینی سەردەمی تاعوون نەیدەتوانی ئایینی رۆژگارەکانی دیکە بێ و ئەگەر خودا هەڵیگرێ و تەنانەت ئەگەر بیەوێ رۆح لە سەردەمی بەختەوەریدا بحەسێتەوە و شاد بێ، چاوەڕوانیی ئەو لە قەیرانەکانی چارەڕەشیدا زیاترە. خودا ئەمڕۆ ئەو چاکەیەی لەگەڵ خوڵقێنراوەکانی خۆی کردووە کە بیانخاتە

نێو چارەڕەشییەوە بۆ ئەوەی لە باشترین باشییەکان کە بریتییە لە "هەموو شتێك" یا "هیچ شتێك" تیٚبگەن و وەئەستۆی بگرن.

چەند سەدە لەمەوبەر نووسەرێکی بیٚ دین، بە هێنانەگۆڕێی ئەو بابەتە کە شتێك بەناوی بەرزەخ لە گۆڕێ نیە، بانگەشەی ئەوەی کرد کە نهێنیی کلێسەی لەقاو داوە. مەبەستی ئەو لە بانگەشەکەی خۆی ئەوە بوو کە هیچ پێوەرێکی مامناوەندی لە گۆڕێ نیە و تەنیا بەهەشت و دۆزەخ هەیە و مرۆڤ بە پێی ئەو رێگەی هەڵیبژاردووە یا رزگار دەبێ یان رەتێنراو. بە لای پانیلۆوە ئەوە لە دین وەرگەڕانێك بوو کە دەکرێ لە رۆحی هیچوپووچێکەوە سەرچاوەی گرتبێ. لەبەر ئەوەی بەرزەخێك لەگۆڕێ بوو، بەڵام سەردەمگەلێکیش هەبوون کە نەدەکرا هیوات بەو بەرزەخە هەبێ. سەردەمانێك کە تێیاندا باسی گوناهی بچووك لەگۆڕێ نەبوو. هەرچەشنە تاوانێك کوشندە بوو و هەر چەشنە خەمساردییەك بە خەیانەت لەقەڵەم دەدرا. یا هەموو شتێك یا هیچ شتێ.

پانیلۆ بێ دەنگ ببووو ریۆ لەو ساتەدا لە بن دەرگاکانەوە باشتر گوێی لە دەنگی با بوو کە دەتگوت لە دەرەوە دوو ئەوەندە بەقەوەت بووە. قەشە لەو کاتەدا دەیگوت باشییەکەی ئەو قەبووڵکردنی گشتییەی کە ئەو باسی دەکا ناکرێ لەو مانا بەرتەسکەدا کورت بکرێتەوە کە خەڵك پێی دەدەن. لەبەر ئەوەی ئەو قەبووڵکردنە، نە بریتییە لە خۆبەدەستەوەدانێکی پڕ شوورەیی و نە بریتییە لە داماوییەکی دژوار. دیارە داماوی بوو، بەڵام داماوییەکی تێکەڵ بە رەزامەندی. بێگومان ئازاری منداڵێك بۆ دڵ و رۆحی ئەو مایەی داماوی شەرم و داماوی بوو، بەڵام هەر بۆیەش بوو کە تێگەیشتن لێی پێویست بوو. پانیلۆ سەرنجی بیسەرانی بۆ لای ئەوە راکێشا کە دەیەوێ بڵێ گوتنی ئاسان نیە و گوتی: هەر بۆیەشە دەبێ بتەوێ لەبەر ئەوەی خودا دەیەوێ. بەو شێوەیە تاکی مەسیحی خۆی لە هیچ شتێك بە دوور نازانێ و کاتێك هەموو رێگەکان داخرابن بەرەو هەڵبژاردنی بنەڕەتی هەنگاو دەنێ. ئەو قەبووڵی تەواو، هەڵدەبژێرێ بۆ ئەوەی دانەبەزێتە ئاستی نکوڵیکردنی تەواو. وەکوو ئەو ژنە ئازایانەی کە کاتێك لە کلێسەکاندا دەیانبیست کوانەکان ئامرازێکن بۆ ئەوەی لەش چڵکوچەپەڵی خۆی هەڵڕێژێتە دەرێ دەیانگوت:" دەزانم، بەڵام ئەوەی دیکەیان جێگەی باوەڕ نیە." دەبێ بخزێینە ئامێزی ئەو شتە دوور لە باوەڕەی کە پێمان بەخشراوە بۆ ئەوەی بتوانین هەڵبژاردنەکەمان بکەین.

ئەشکەنجەی منداڵان نانی تاڵی ئێمە بوو، بەڵام ئەگەر ئەو نانەمان نەبوایە رۆحی ئێمە لە برسێتیی مەعنەویی دەمرد.

لێرەدا، ژاوەژاوێکی ناڕوون کە زۆرجاران لە کاتی بێدەنگبوونی پیرپانیلۆدا کلێسەی دادەگرت وردەوردە بەرز بۆوە و بیسترا، لەبەر ئەوەی لەنەکاو، ئامۆژگاریکەر دەستی بە قسان کردەوەو بە لەبزێکی پتەوترەوە، خۆی لەبری بیسەران پرسیی کە لەسەر یەك دەبێ چ بکەین؟ لەسەر ئەو باوەڕە بوو، کە لەوانەیە هەر هەمووان بڵێن چۆکدادان لەبەرامبەر چارەنووسدا. کێشەیەك نەبوو و ئەو لەبەرامبەر ئەو دەستەواژەیەدا هەرگیز پاشەکشەی نەدەکرد تەنیا بەو مەرجەی رێگەی بدەن وشەی چالاکانەی لێ زیاد بکەن. جارێکی دیکەش دووپاتەی دەکاتەوە کە دیارە نابێ لاسایی مەسیحییەکانی حەبەشە بکەنەوە، کە پێشتر باسی کردوون. هەروەها، نابێ بیر لەوە بکەنەوە کە بچنە ریزی تاعوونلێدراوە ئێرانیەکانەوە کە سەگەکانیان لە تاقمە مەسیحییەکان بەر دەدان و تووك و نەحلەتیان لێ دەکردن بۆ ئەوەی ئەو بێدینانەی دەیانەوێ تاعوونی نێردراو لە لایەن خوداوە شکست بدەن تاعوون لێیان بدا، بەڵام لە لایەکی دیکەشەوە نابێ لاسایی راهیبەکان بکەنەوە کە لە پەتاکانی سەدەکانی رابردوودا، لە رێوڕەسمی خواردنی قوربانیدا، نانی متفەڕکیان بە پلایس دەگرت بۆ ئەوەی خۆ لە ئاوی زاری گەرم و شێداریان بپارێزن. تاعوونلێدراوانی ئێران و راهیبەکان هەردوولا گوناهیان دەکرد. چونکە بە لای ئەوانەوە ئەشکەنجەی منداڵێك گوناه نەبوو و بە پێچەوانە، بە لای ئەوانەوە ئەو ترسەی مرۆڤ لە ئازار هەیەتی هەموو شتێکی لەخۆ گرتبوو. لەهەر دوو حاڵەتدا مەسەلە سەرەکییەکە لە بیر کرابوو. هەر هەموویان لە بەرامبەر بانگی خودادا کەڕ بوون، بەڵام نموونەی تریش هەبوون کە پانیلۆ دەیویست وەبیریان بێنێتەوە. ئەگەر باوەڕ بە نووسراوەی رووداونووسەکەی گەورەی "مارسی" بکەین لە هەشتاویەك راهیبەی کەنیسەی "مێرسی" تەنیا چوار کەسیان لە چنگی تاعوون نەجاتیان بوو. رووداونووسەکان هەر ئەوەیان دەگوت و پیشەکەیان هەڵی‌نەدەگرت لەوە زیاتر شتێك بڵێن، بەڵام پیر پانیلۆ لە کاتی خوێندنەوەی ئەو رووداوانەدا، تەواوی بیر و هۆشی چووە سەر ئەو کەسەی سەرەڕای حەفتاوحەوت تەرم، بە تایبەتی لەگەڵ ئەو نموونەیەشدا کە سێ برا دینیەکەی

پێیاندا بوو هێشتا بە تەنیا مابۆوە و قەشە لە حاڵێکدا کە مستەکۆڵەی لە قەراغی کورسیی مینبەرەکەی دەکوتا هاواری کرد:"براکانم، هەر دەبوو ئەو کەسە بێ، کە دەمایەوە."

مەبەست ئەوە نەبوو کە پشت لە پارێزی پێویست و ئەو تەکووزییە هۆشیارانەیە بکەین کە کۆمەڵگەیەك لە بازاڕی شێواوی نەهامەتی و بەڵادا، پێکی دێنێ. نابێ قسەی ئەو ئەخلاقگەرایانە لەگوێ بگری کە دەیانگوت دەبێ چۆك دابدەی و واز لە هەموو شتێ بێنی. بەڵکو دەبێ لە ناخی ئەنگوستەچاودا بڕێك بە دەستەکوتە دەست بکەی بە بەرەوپێشڤەچوون و لە ڕێگەی چاکەدا تێ بکۆشی، بەڵام لەسەر مەسەلەکانی دیکە، تەنانەت سەبارەت بە مەرگی منداڵانیش، دەبێ ڕاوەستی و قەبووڵ بکەیت و بەخودای بسپێری و بیر لە ڕێگەچارەی شەخسی نەکەیتەوە.

لێرەدا پیرپانیلۆ ڕوخساری دیاری ئۆسقۆف "بێلزونێس"ی لە جەنگەی تاعوونەکەی مارسی‌دا وەبیر دێنایەوە. ئاماژەی بەوە کردەوە کە لە کۆتایی پەتاکەدا ئۆسقۆف چی لەدەستی دەهات کردی، جا چونکە باوەڕی وابوو کە هیچ چارەیەك نیە، بڕێك پێخۆر و بژیوی هەڵگرت و لە ماڵەکەی خۆیدا خۆی بەند کرد و دیوارێکی بە چواردەورەی خۆیدا کێشا. ئیتر خەڵکی شاری کە ئۆسقۆفیان بەلاوە پیرۆز بوو، بە گۆڕینی هەست و ئیحساسی خۆیان کە بەرهەمی ئێش و ئازارە، لێی تووڕە بوون و بۆوەی ماڵەکەی لێ پیس بکەن لێیان پڕ کرد لە تەرم و تەنانەت لەسەر دیوارەکانیشەوە کۆمەڵە تەرمێکیان خستە نێو ماڵەکەیەوە بۆ ئەوەی تەواو بیفەوتێنن. بەو شێوەیە ئۆسقۆف بە هۆی لاوازییەکی بەو ئاکامە گەیشتبوو کە لە جیهانی مەرگدا خۆی جوێ بکاتەوە و مردووەکان لە ئاسمانەوە بە سەریدا هەڵ دەڕژان. بەو جۆرە ئێمەش دەبێ لەسەر ئەو باوەڕە بین کە لە وڵاتی تاعووندا دوورگەیەك لە گۆڕێ نیە. نەخێر هیچ کوێ نیە. دەبێ کارەساتەکە قەبووڵ بکەین لەبەر ئەوەی ناچارین یەکێك لەو دوو ڕێگەیانە هەڵبژێرین: یا دوژمنایەتیی خودا بکەین یان ئەوەیکە خۆشمان بوێ و کێ دەوێرێ دوژمنایەتیی خودا هەڵبژێرێ؟

دواجار پانیلۆ ئاگاداری کردنەوە کە دەیەوێ دەرەنجام لە قسەکانی وەرگرێ و، گوتی:" براکانم، خۆشەویستیی خودا عیشقێکی سەخت و دژوارە، پێویستی بەوەی واز لە خۆپەرستی

بێنن و خاکەڕا بن، بەڵام تەنیا ئەو دەتوانێ ئەشکەنجەو مەرگی منداڵان دوایی پێ بێنێ و هەر ئەویشە دەتوانێ بە پێویستیان بزانێ چونکە کەس ناتوانێ لە توانایی و ویستی ئەو تێبگا و تەنیا دەبێ رازی بە رەزای ئەو بین.

ئەوەیە ئەو وانە دژوارەی کە گەرەکم بوو پێتانی بڵێم. ئەوەیە باوەڕ، بەهێزی لەبەر چاوی مرۆڤ و لێبڕاوی بە لای خوداوە، و دەبێ لێ نزیك بیتەوە. ئێمە دەبێ بگەینە بن ئەو وێنە سامناکە. لەسەر ئەم بانوە* هەموو شتێك تێکەڵ دەبێ و حەقیقەت لە سەرووی نادادپەروەریی رواڵەتییەوە دەردەکەوێ، بەو جۆرەیە کە لە زۆربەی کڵێسەکانی باشووری فەرەنسادا تاعوونلێدراوان لە چەندین سەدە لەوەپێشەوە لە بن بەردەچنی مێحرابەکان دا چوونەتە خەوی ئەبەدییەوە و قەشەکان لەسەر گۆڕەکانی ئەوانەوە قسان دەکەنو کاکڵ و هەوێنی ئەو هزرەی کە پێشکەشی دەکەن لەو خۆڵەمێشەوە هەڵدەستێ کە منداڵانیش پشك و بەشێکیان تێیدا هەیە.

کاتێك ریڤۆ هاتە دەرێ رەشەبایەکی توند لە کەلێنی دەرگاکەوە خۆی خزاندە ژوورەوەو پەلاماری دەموچاوی ئیماندارانی دا. ئەو بایە بۆنی باران و زەویی شێداری لەگەڵ خۆیدا دێنایە نێو کلێسەوە و دەبووە هۆی ئەوەی کە ئیمانداران بەر لەوەی وەدەرکەون دیمەنی شار بێننە پێش چاوی خۆیان. بەر لە ریڤۆ قەشەیەکی بەساڵاچوو و مجێورێکی گەنج کە لەو ساتەدا دەهاتنە دەرێ بە زەحمەت توانییان دەست بە کڵاوەکانیانەوە بگرن. لەگەڵ ئەوەشدا پیرە قەشە وازی لە دەربڕینی را و بۆچوونەکەی خۆی لەسەر وتارەکە نەهێنا. تاریفی رەوانبێژیی پانیلۆی دەکرد، بەڵام نارەحەت بوو ئەو نەترسییەی کە لە بیر و رای خۆیدا نواندبووی. لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەو وتارە بەر لەوەی نیشانەی بەهێزی بێت، نیشانەی نیگەرانی بوو و، قەشەیەکی لە تەمەنی پانیلۆ دا بۆی نیە نیگەران بێ. مجێورە گەنجەکە کە سەری بەردابۆوە بۆ ئەوەی دەموچاوی لە با ببوێرێ، گوتی زۆر جاران پێوەندیی لەگەڵ پێر پانیلۆ هەبووە ئاگای لە گۆڕانی دەروونیی ئەو هەیە و دەزانێ کە نامیلکەکەی ئەو چاوقایمانەتر دەبێ و بێگومان کەس ئامادە نابێ بۆی چاپ بکا.

قەشە پرسی: کەواتە لەسەر چ باوەڕێکە؟

---

* بانو: شوێنی بەرز. (فلات)

گەیشتبوونە بەرهەیوانی کلێسەکەو با بە لوورەو گڤەوە هەڵپێچابوون و قسە ئینجیلییەکانی گەنجەکەی بڕی. کاتێك ئەو توانیی قسان بکا تەنیا وتی:

ـ کاتێك قەشە راوێژ بە پزیشك بکا، ناتەبایی و دژوازییەك دێتەپێشێ.

ریڤۆ قسەکانی پانیلۆی بۆ تارۆ گێڕایەوە، تارۆ گوتی قەشەیەکی دەناسی کە لە جەنگەی شەڕدا بە دیتنی گەنجێك کە چاویان دەرهێنابوو باوەڕی خۆی لەدەست دا.

تارۆ گوتی:

ـ پانیلۆ حەقیەتی. کاتێك چاوی بێ تاوانێك دەردێنن، تاکی مەسیحی دەبێ یا ئیمانی لەدەست بدا یا ئەوەیکە قەبووڵی بکا کە چاوەکانی دەربێنن. پانیلۆ نایەوێ ئیمانی لەدەست بدا، هەر بۆیەش هەتا دوایین قۆناغ دەچێتە پێشێ. هەر ئەوە بووە ئەوەی ویستوویەتی بیڵێ.

ئاخۆ تارۆ بە دەربڕینی ئەو بۆچوونەی دەتوانێ تیشك بخاتە سەر ئەو رووداوە تاڵانەی کە دوای ئەوە هاتنەپێشێ و هەڵسوکەوتی پانیلۆ لەو رووداوانەدا روون بکاتەوە کە بۆ دەورووبەرییەکانی ناروون بوو؟ دەی بینین.

چەند رۆژ بەر لە وتاردانەکە، پانیلۆ دەستی کرد بە راگواستنی ماڵەکەی. ئەوکاتە بوو کە هەڵکشانی پەتاکە راگواستنی بەردەوانی ماڵەکانی کردبووە پێویستییەك. هەر وەکی تارۆ ئەو هۆتێلەی بەجێ هێشتبوو کە تێیدا دەژیا قەشەش ناچار بوو ئەو ماڵە بەجێبێڵێ کە تایبەت بە خۆی بوو و لە ماڵی پیرەژنێك دا بگیرسێتەوە کە هاموشۆی کلێسەی دەکردو هێشتا تاعوون نەیگەیشتبوویە. پیرپانیلۆ لە جەنگەی ماڵ گواستنەوەدا هەستی کردبوو کە دڵەڕاوکێ و شەکەتییەکی لە هەڵچوون دایە.و بەو جۆرە بوو کە ئیتر لای خاوەن ماڵەکەی رێز و حورمەتی نەما. چونکە پیرەژنە کە بەوپەڕی کەفوکوڵەوە باسی بایەخی بەربێژییەکانی ساینت ئۆدیلەی بۆ دەکرد، قەشە لەوانەیە بە هۆی شەکەتییش بووبێ بڕێك بێوازیی نواندبوو. دواتر چی هەوڵی دا لانیکەم لە دڵی پیرەژنەدا بێلایەنیەکی خێرخوازانە بەرامبەر خۆی ساز بکات، کەچی هەر نەیتوانی. ئەو کاریگەریی خراپی لەسەر پیرەژنە دانابوو، و هەموو شەوێ بەر لەوەی بچێتەوە ژوورەکەی کە پڕ بوو لە تۆڕی دەستچن، ناچار بوو هەر پشتی خاوەن ماڵەکەی ببینێ کە لە هۆڵەکەدا دانیشتووە و بەبێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە بە لەبزێکی وشك پێی بڵێ:" شەو شاد پاپا"،

لە یەکێك لەو شەوانەدا کاتێك چوو بخەوێ، لە مەچەکی دەستەکانی و لە شەویلاگەکانی دا هەستی بە هەڵچوونی "تا" یەك کرد کە چەند رۆژ لەمەوبەر تووشی ببوو.

باقی رووداوەکە خاوەن ماڵەکەی گێڕایەوە:" بەیانیی ئەو رۆژە پیرەژنە بە پێی عادەتی خۆی زۆر زوو لەخەو هەستابوو. دوای ماوەیەك پێی سەیر ببوو کە قەشە لە ژوورەکەی نایەتە دەرا و بە دڕدۆنگییەکی زۆرەوە بڕیاری دابوو لە دەرگای ژوورەکەی بدا. دیتبووی کە هێشتا لە جێ دایەو هەتا بەیانی خەو نەچۆتە چاوەکانیەوە. تووشی پشووسواری ببوو و لەهەموو جارێك پتر خوێن خزیبووە روخسارییەوە. پیرەژن بە قسەی خۆی بەوپەڕی رێزەوە پێشنیاری پێ کردبوو کە بانگی پزیشکێك بکا، بەڵام پێشنیارەکەی ئەو بە تووڕەییەکی ئەوتۆ وەڵام درابۆوە کە بە رای ئەو جێگەی داخ بوو. پیرەژن ناچار ببوو لە ژوورەکە بێتە دەرێ. بڕێك دواتر قەشە بە تەلەفۆن بانگی کردبوو. بە هۆی هەڵسوکەوتەکەی خۆی داوای لێبوردنی کردبوو و گوتبووی کە نەخۆشییەکەی بە هیچ شێوەیەك وێناچێ تاعوون بێ، بچووکترین نیشانەی تاعوونی پێوە نیە و تەنیا شەکەتییەکی تێژتێپەڕە. پیرەژنە بە حورمەتەوە وەڵامی دابۆوە کە ئەو پێشنیارە بە هیچ شێوەیەك لەبەر ئەوە نیە کە ئەو نیگەرانی تاعوون بووە هەر وەها لە تەندرووستیی خۆیشی ناترسێ چونکە دەزانێ ئەوە بەدەست خودایە، بەڵکو تەنیا بیر لە تەندرووستیی قەشە دەکاتەوە لەبەر ئەوەی کە لەم بارەیەوە وەك خۆی هەست بە بەرپرسیارەتی دەکا، بەڵام چونکە قەشە قسەی نەدەکرد، خاوەن ماڵ کە دەیویست دوایین ئەرکی خۆی بە جێهێنابێ، پێشنیاری پێ کردبوو کە پزیشکی تایبەتیی خۆی بۆ بانگ بکا. پیرپانیلۆ دیسان قەبووڵی نەکردبوو و ئەمجارە چەند قسەیەکی لە قسەکانی خۆی زیاد کردبوو کە پیرەژن لێیان تێ نەگەیشتبوو. هەر ئەوەندەی لێ تێگەیشتبوو کە قەشە ئەو سەردانە پزیشکییە قەبووڵ ناکا لەبەر ئەوەی بە پێچەوانەی بنەما ئەخلاقییەکانی خۆی دەزانا و پیرەژنە ئەوەی زۆر بە لاوە ناڕوون ببوو. پیرەژنە بەو ئاکامە گەیشتبوو کە تا بیرو مێشکی کرێچییەکەی تێك داوەو هەر بەوەندە قایل ببوو کە قەنداوێکی بۆ بەرێ.

پیرەژنە کە سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەو ئەرك و بەرپرسیارەتییە جێبەجێ بکا کە ئەو رەوشە تووشی کردبوو، لەسەر یەك بە هەر دوو سەعات جارێك سەردانی نەخۆشەکەی کردبوو. ئەوەی لەهەموو شتێ زیاتر ئەوی راچڵەکاندبوو، ئەو هەڵچوون و بێ ئۆقرەییە بوو کە هەتا ئێوارێ قەشە

پێوەی تلّبۆوە. سەرچەفەکانی لەسەر خۆی لادەدا، دوایی دیسان بەخۆیدا دەدانەوە و دەستەکانی خۆی بەسەر تەوێڵی گەرم و شێداری دا دێنان و زۆربەی جاران هەڵدەستا کە بکۆخێ و کۆکینەکانی کپو دوو جۆرو تەڕ بوون، دەتگوت شتێك لە هەناوییەوە هەڵدەکەنرێ. دەتگوت گلۆڵە لۆکەیەك لە قورگی گیراوە کە دەیخنکێنا و نەیدەتوانی بیهێنێتە دەرێ و تووڕی هەڵ دا. پاش ئەو قەیرانانە، لەوپەڕی لاوازیدا لەسەر پشت لێی دەکەوت. دیسان ئاخێز*ی دەکردو بۆ ساتێکی کورت بە چاوتێوەبڕینێکی قووڵتر لە هەموو بێ ئۆقرەییەکانی جاران، چاوی لە پێش خۆی دەکرد، بەڵام پیرەژنە هێشتا دڕدۆنگ بوو لەوەی کە بە پێچەوانەی ویستی نەخۆشەکەی بجووڵێتەوەو بانگی پزیشکێك بکا. ئەو نەخۆشییە سەرەڕای ئەو رواڵەتە توندەی کە هەیبوو لەوانەبوو تایەکی سادەش بێ.

لەگەڵ ئەوەشدا دوانیوەڕۆ هەوڵی دا لەگەڵ قەشە قسە بکا و لە وەڵام دا، تەنیا چەند قسەیەکی ناڕوونی لێ بیست. پیرەژن پێشنیارەکەی دووپاتە کردەوە، بەڵام قەشە بە بیستنی ئەو قسانە لە جێی خۆی هەستا و لەحاڵێکدا پشووی سوار ببوو بە راشکاوی گوتی پزیشکی ناوێ. لەو کاتەدا پیرەژنی خاوەن ماڵ هاتەسەر ئەوەی هەتا بەیانی راوەستێ و ئەگەر قەشە بەرەو باشبوونەوە نەچوو، ئەوا تەلەفۆن بکا بۆ ئەو ژمارەیەی کە هەواڵنێریی رانسدۆك رۆژانە دەجار لە رادوێوە بڵاوی دەکردەوە. ئەو بەردەوام هۆشی بە لای ئەرکەکەیەوە بوو. بڕیاری دابوو کە شەوێش سەردانی کرێچییەکەی بکا و، ئاگای لێی بێ، بەڵام کاتی ئێوارێ کە قەنداوێکی دایە، بڕێك راکشا و کاتێك چاوی کردەوە هەیهوو ئەوە رۆژ بۆتەوە. بەرەو ژووری نەخۆشەکە رای کرد.

قەشە بێ جووڵە لێی کەوتبوو. لە روخساری دا سوورایییەکەی دوێنێ رەش هەڵگەڕابووو ئەو رەشهەڵگەڕانەش ئەوەندە دیار بوو کە چرچولۆچەکانی دەموچاوی داپۆشیبوو. قەشە چاوی بڕیبووە هۆنراوەیەکی مرواریی کە بە میچەکەوە هەڵواسرابوو. کاتێك پیرەژن وەژوور کەوت سەری بۆلای ئەو وەرسووڕاند. بە قسەی خاوەن ماڵ وەك بڵێی قەشە هەتا بەیانی کوترابوو و هێزی هەرچەشنە دژکردەوەیەکی تێدا نەمابوو. پیرەژنە لێی پرسی چۆنە؟ و قەشە بە دەنگێکی

---

* ئاخێز: قوون بزاوتن، هەستانێکی کەم کە بەحاڵ لە جێگەی خۆی هەڵدەستێ.

که پیرەژنه پێیوابوو بێ حاڵی و بێهێزیی پێوەدیار بوو،وەڵامی دایەوە که باش نیه. پێویستیی به پزیشك نیه و هەر ئەوەندە بیبەنه نەخۆشخانه بۆ ئەوەی کاروبارەکانی بۆ بکرێ.

ریڤۆ که نیوەڕۆ گەیشتێ به بیستنی ئەوەی پیرەژنه بۆی گێڕایەوە تەنیا وتی که پانیلۆ حەقی بووەو لەوانەیه زۆر درەنگ بووبێ. قەشه دوکتۆریشی هەر ئەو ساردیو کەمتەرخەمییه وەرگرت. ریڤۆ پشکنی و لەوەیکه جگه له پشووسواری و تەسك بوونەوەی سییەکانی هیچ نیشانەیەکی تاعوونی کوانی یا سیپەلکی لێ بەدی نەکرد سەری سووڕما. لەگەڵ ئەوەشدا ترپەی دڵی وا لاواز و حاڵەتی گشتیی نەخۆشەکه ئەوەندە مەترسیدار ببوو که بچوکترین هیوایەك نەمابۆوە. به پانیلۆی گوت:

ـ تۆ هیچ کام له نیشانەکانی تاعوونت پێوە دیار نیه، بەڵام له راستیدا جێی گومانەو من دەبێ جویێت بکەمەوە.

قەشه هەر وەك بڵێی دەیەوێ رێزو حورمەت بنوێنێ بزەیەکی سەیری هاتێ، بەڵام متەقی لێ نەهات. ریڤۆ بۆ تەلەفۆن کردن چووە دەرا و لەڕێوە گەڕایەوە. سەیری قەشەی کردو به لەسەرخۆیی گوتی:

ـ من لات دەمێنمەوە.

نەخۆش دەتگوت هێزێکی وەبەر هاتەوەو چاوەکانی که دەتگوت تینیان تێگەڕاوەتەوە، بەرەو دوکتۆر سووڕاندنەوە. ئەوجار به سەختیو به لەبزێکی که هیچ روون نەبوو خەمبارە یان نا گوتی: ـ سوپاس، بەڵام پیاوانی ئایینی پێیان خۆش نیه. له رێگەی خوادا وازیان له هەموو شتێ هێناوە.

داوای خاچەکەی کرد که لەسەرووی قەرەوێڵەکەوە بوو که پێیان دا سەیرێکی کرد.

له نەخۆشخانه، پانیلۆ زاری هەڵنەپچڕی. وەك شتێکی بێ گیان خۆی دایه دەست ئەو چارەسەرییانەی که دەیانسەپاند، بەڵام ئیتر خاچەکەی بەرنەدا. لەگەڵ ئەوەشدا دۆخی ئەو ناڕوونتر دەبوو. ریڤۆ هەروا به شك و گومان بوو. نەخۆشییەکەی قەشه تاعوون بوو و تاعوونیش نەبوو. هەرچەندە که ماوەیەك بوو تاعوون وای پێخۆش بوو کایه به دەسنیشانکردنی نەخۆشییەکان له لایەن پزیشکەکانەوە بکا و تووشی هەڵەیان بکا، بەڵام لەمەڕ پانیلۆ درێژەی رووداوەکه دەریخست کەئەو گۆڕانه بچووکانه هیچ بایەخێکیان نیه.

تا، هەڵچوو. کۆکە جاربەجار توندتر بوو و رۆژ تائێواریێ نەخۆشەکەی ئازار دا. ئاخری لە کاتی رۆژاوادا بوو کە قەشە ئەو گلۆڵەیەی کە دەیخنکاندەوە لە گەرووی خستە دەرێ. سوور بوو. لە نێو تۆفانی تا دا، پانیلۆ روانینە ساردەکانی خۆی هەروا پاراستبوو. رۆژی دواتریش کاتێك چوونە سەری کە نیوەی لەشی لە قەرەوێڵەکە هاتبووە دەرێ و مردبوو، نیگاکانی هیچیان تێدا نەدەخوێنرایەوە.

لەسەر پسوولەکەی ئەو نووسیبیان:" مەرگی گومانا‌وی."

## (٦)

جێژنی تۆوسەنی Tousaint ی ئەو ساڵە وەکوو ساڵەکانی دیکە نەبوو. دیارە هەوا هەر وەك ساڵانی پێشوو بوو: لەنەکاو گۆڕابوو و گەرمای درەنگوەخت لەپڕ جێگەی خۆی دابوو بە فێنکی. ئێستا وەکوو ساڵانی پێشوو بایەکی سارد بەردەوام هەڵی کردبوو، گەواڵە هەور لە ئاسۆیەکەوە بەرەو ئاسۆیەکیتر دەڕۆیشتن و سەرماڵانیان دادەپۆشین و پاش تێپەڕینیان تیشکی سارد و زێڕینی ئاسمانی نۆڤەمبەر بەسەر ئەو ماڵانەدا دەپژا. یەکەمین بارانپۆشەکان وەدەرکەوتبوون، بەڵام رادەیەکی سەرسووڕهێنەر پارچەی کائۆچۆکدار و بریقەدار سەرنجیان رادەکێشا. لە راستیدا رۆژنامەکان نووسیبوویان دووسەت ساڵ لەمەوبەر، لە جەنگەی تاعوونە گەورەکاندا قوماشی لووسیان لەبەر دەکرد. دووکانەکان بە کەڵکوەرگرتن لەو مەسەلەیە، رادەیەکی زۆر پارچەی کۆنیان کە لە عەمبارەکانیاندا مابۆوە ورد کردبۆوە و هەرکەسەی چاوەڕوانیی هەبوو کە بە پۆشینی ئەو پارچەیە پارێزراو بێ.

بەڵام هیچکام لەو نیشانانەی وەرز نەدەبووە هۆی ئەوەی کە خەڵك لە بیریان بچێتەوە کە گۆڕستانەکان چۆڵن. ساڵانی پێشوو، شەمەندەفەرەکان پڕ لە بۆنی تفتی گوڵان بوون و دەستەدەستە ژنان دەچوونە ئەو شوێنانەی خزموکەسیان لەوێدا نێژرابوون بۆ ئەوەی گۆڕەکانیان گوڵباران بکەن. خەڵك لەو رۆژەدا هەوڵیان دەدا کە قەرەبووی ئەو مانگە دووروودرێژانەی دابڕان بکەنەوە کە مردووەکان چێژتبوویان، بەڵام ئەو ساڵە ئیتر کەس نەیدەویست بیر لە مردووەکان بکاتەوە. یا باشتر بڵێین خەڵك ئەو رۆژانە لەڕادەبەدەر بیریان لە

مردووەکان دەکردەوە، و ئیتر باسکردن لەوەی کە بە هێندێك داخ و بە خەفەت و خەمێکی زۆرەوە سەردانیان بکەن لە گۆڕێ نەبوو. ئەوان ئیتر کۆمەڵێك وەلانراو نەبوون، کە خەڵك ساڵێ جارێك بۆ داوای لێبوردن سەردانیان بکا، بەڵکو کۆمەڵێك لاپرەسەن و ملۆزم بوون کە هەمووکەس دەیویست لەبیرخۆیان بەرێتەوە. هەر بۆیەش "جێژنی مردووان" لەو ساڵەدا دەکرێ بڵێی بە بێدەنگییەوە لەبیر کرا. یا وەك کۆتار دەیگوت و تارۆ پێی وابوو قسەیەکی تەوساوییە، هەموو رۆژەکان جێژنی مردووان بوو.

جا بە راستیش ئاگری تاعوون رۆژ بە رۆژ تاسەبارانەتر لە کوورەکانی جەستەسووتاندندا بڵێسەی دەکێشا. وایە لە رۆژێکەوە بۆ رۆژی دوایی ژمارەی مردووەکان نەدەگۆڕا، بەڵام وەك بڵێی تاعوون بە ئاسوودەییەوە لە تەشقی خۆیدا جێگیر ببوو و وەکوو کارمەندێکی رێکوپێك و بە دیسیپلین و کارامە کوشتاری رۆژانەی خۆی لە ئاستێکی تایبەتدا رادەگرت. بە پێی رابردوو و باوەڕی کەسانی شارەزا ئەوە نیشانەی باشی بوو. خشتەی هەڵکشانی تاعوون بە هەڵچوونی بەردەوامی خۆی و دواتر بە هێڵێکی راستەوخۆی درێژ کە دەیبڕی، کەسانێکی وەکوو دوکتۆر ریشاردی دڵخۆش دەکرد. ئەو دەیگوت:"ئەوە خشتەیەکی باشە. خشتەیەکی زۆر باش." پێیوابوو کە نەخۆشییەکە گەیشتۆتە "پێگۆڕکێ"ی خۆی و دوای ئەوە تەنیا لە دابەزیندا دەبێ. ئەو راوەستانەشی لە چاوی سیرۆمەکەی کاستێلەوە دەبینی کە بەراستی چەند جارێك سەرکەوتنی چاوەڕواننەکراوی بەدەست هێنابوو. کاستێلی پیر شتێکی پێچەوانەی ئەوی نەدەگوت، بەڵام لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە بەراستی پێشبینی هیچ شتێ ناکرا و مێژووی پەتا گەورەکانی جیهان پڕاوپڕە لە قەڵەمبازی چاوەڕواننەکراو. پارێزگاری کە لەمێژ بوو بە ئاواتەوە بوو رێگەیەکی هێورکەرەوە بۆ بیروڕای گشتی بدۆزێتەوە و تاعوون ئەو دەرفەتەی پێ نەدەدا، دەیویست پزیشکەکان لە دەوری یەکتر کۆ بکاتەوە بۆ ئەوەی راپۆرتێکیان لەم بارەوە لێ وەرگرێ کە هەر لەو کاتەدا راست لەسەر پێگۆڕکەکە تاعوون بەرۆکی بە دوکتۆر ریشارد گرت.

رێکخراوی دەوڵەتی لە هەمبەر ئەو نموونەیەدا، کە بێگومان راچڵەکێنەر بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەڵگری هیچ پەیامێکی نوێ نەبوو، هەر بەو بێ خەبەرییەی کە پێشتر پێی گەشبین ببوو گەڕابۆوە سەر رەشبینییەکەی. کاستێل بەوەندە قایل بوو کە سیرۆمەکەی خۆی بە هەموو تواناوە ساز بکا. ئیتر تەنانەت بینایەکی حکوومی نەمابوو نەکرێتە نەخۆشخانە یان دابڕگە، و ئەگەر هێشتا دەستیان لە

پێکهاتەی پارێزگاری نەدابوو لەبەر ئەوە بوو کە شوێنێکیان بۆ کۆبوونەوە پێویست بوو، بەڵام بەگشتی و بە پێی ئەو راوەستانە رێژەییەی کە پەتاکە لەو ماوەیەدا هەیبوو، ئەو رێکخراوەی کە دوکتۆر ریڤۆ پێکی هێنابوو بە هیچ شێوەیەك لە تاعوون دوانەکەوت.

پزیشکان و یاریدەدەران کە بە گیان و دڵ هەوڵیان دەدا، ئیتر ناچار نەبوون بیر لە هەوڵی گەورەتر بکەنەوە. تەنیا ناچار بوون کە درێژە بەو کارە بدەن کە دەکرێ بڵێی لە توانای مرۆڤ بەدەر بوو. شێوەکانی چڵککردنی سیپەلك کە ماوەیەك بوو دەرکەوتبوو، ئێستا لە چوارگۆشەی شاردا روو لە زیادبوون بوو. وەك بڵێی با ئەو پشکۆیانەی لە سینگەکاندا بوون دەیگەشاندنەوە. ئێستا بەو شێوە نوێیەی پەتاکە، مەترسیی لێگرتنەوەی زیاتر ببوو. لە راستیدا رای پسپۆڕان لەسەر ئەوە دژ بە یەك و جیاواز بوون. لەگەڵ ئەوەشدا ئەندامانی رێکخراوی تەندرووستی، بۆ دڵنیایی زیاتر هێشتا لە ژێر دەمامکی پاکژکراوەوە پشوویان دەکێشا. سەرەتا دەتگوت نەخۆشییەکە پەرە دەگرێ، بەڵام چونکە تاعوونی کوان، لە کەمیی دەدا، بالانسەکە راگیرابوو.

لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆی کەمبوونی خواردەمەنی کە رۆژبەرۆژ پتر دەبوو، هۆکاری نوێ بۆ نیگەرانی و پەرۆشی پەیدا ببوو. هەلپەرستەکان هاتبوونە مەیدان و ئەو خواردەمەنیانەی کە پێویست بوون و لە بازاڕی ئاساییدا دەست نەدەکەوتن، بە نرخی سەرسووڕهێنەر دەیانفرۆشتنەوە. بەو شێوەیە بنەماڵەی هەژاران لە رەوشێکی تاقەتپرووکێندا بوون، بەڵام خوداپێداوان بێخەم دەژیان. تاعوون بەو بێ لایەنە کاریگەرەی کە لە هەرێمی خۆیدا رەچاوی کردبوو، بە شێوەی ئاسایی دەبایە پرەنسیپی یەکسانی لەنێو خەڵکدا بەهێزتر بکا، بەڵام بە پێچەوانەوە، بەهۆی گەمەی ئاسایی خۆپەرەستییەکان، هەستی نادادپەروەریی لە دڵی مرۆڤەکاندا قووڵتر دەکرد. دیارە یەکسانیەکی بێ وێنە لە مەرگدا رەچاو کرابوو، بەڵام کەس خوازیاری نەبوو. بێ ئەنواکان کە لەو رەوشەدا ئازاری برسییەتییان دەچێشت، دیسانیش بە حەژمەتێکی زیاترەوە بیریان لە شار و گوندەکانی دەوروپشتیان دەکردەوە کە لەوێ ژیان ئازاد بوو و، نان گران نەبوو. ئێستا کە نەیاندەتوانی خواردنی پێویستیان بۆ دابین بکەن، ئەو هەستە ناژیرانەیە تێیاند گوورابوو کە دەبێ ئیزنی چوونەدەروەیان پێ بدەن. درووشمێك زار بە زار دەگەڕا، جاری وابوو بەسەر دیوارەکانەوە دەیانخوێندەوە و پێشتریش چەند جار لەبەردەم پارێزگاریدا هاواریان کردبوو: "یان نان یان هەوا."

ئەو درووشمە تەوساوییە نیشانەی خۆپێشاندانێك بوو کە خێرا پێشی پێ گیردرا، بەڵام لایەنە مەترسیدارەکانی لەکەس شاراوە نەبوو.

رۆژنامەکان لە بەرامبەر هەر نرخێکدا کە وەریانگرتبوو، رەچاوی بڕیاری گەشبینییان دەکرد. بە پێی نووسراوەکانی ئەوان ئەوەی نیشاندەری رەوشی ئێستا بوو" نموونەی بەکەفوکوڵی هێمنی و دانبەخۆداگری" بوو کە (ئەو زانیارییانەش) خەڵك پێیانیان دەدا، بەڵام لە شارێکدا کە دەرگاکانی بەسەر خۆیدا گاڵەداون و هیچ شتێ ناتوانێ بە شاراوەیی بمێنێتەوە هیچ کەس لەسەر "نموونە"یەك کە خەڵك دەیدا بەهەڵە نەدەچوو، و بۆ داوەریکردنی راست لەسەر ئەو هێمنی و دانبەخۆداگرییە هەر ئەوەندە بەس بوو کە مرۆڤ بچێتە نێو یەکێك لە دابڕگەکان یا ئەو ئۆردووگایانەوە کە لە لایەن دەوڵەتەوە پێك-هێنرابوون. گێڕەرەوە کە خۆی لە شوێنەکانی دیکەدا ئەرکی بەڕێوە بردووە لەوانەیە شارەزای ئەو شوێنانە نەبێ. هەر بۆیە لێرەدا تەنیا قسەکانی تارۆ دێنێتەوە.

تارۆ لە یادداشتەکانی خۆیدا بەسەرهاتی سەردانێك دەگێڕێتەوە کە لەگەڵ رامبێر چووبوونە سەردانی ئۆردووگایەك کە لە یانەیەکی وەرزشی شاردا سازیان کردبوو. یانە وەرزشییەکەلە نزیك دەروازەکانی شاریەوەیە و لە لایەکەوە دەچێتەوە سەر کۆڵانێك کە شەمەندەفەرەکانی لێ نزیکن و لە لایەکی دیکەشەوە دەچێتەوە سەر زەوییە بەیارەکان. ئەو زەوییانە گەیشتوونەتە ئەوسەری ئەو بانوەی شاری لەسەر ساز کراوە. وەرزشگاکە بە شێوەی ئاسایی، بە دیواری بەرزی چیمەنتۆ دەوری گیراوە و بە دانانی کێشکچی لەبەر هەر چوار دەرگای وەژوور کەوتنەکەیەوە، توانیبوویان پێش بە راکردنی خەڵك بگرن. هەروەها ئەم دیوارانە نەیاندەهێشت خەڵکی درەوە بە مڵومۆی بێ رۆحی خۆیان ئەو چارەڕەشانە ئازار بدەن کە لە دابڕگەدا بوون، بەڵام ئەم گرفتارانەی نێو دابڕگە بە درێژایی رۆژ بە بێ ئەوەی شەمەندەفەر ببینن گوێیان لە دەنگی تێپەڕینیان دەبوو و بە هۆی ئەو هاتوهوریایەی کە دەیانبیست، سەعاتی کرانەوە و داخرانی ئیدارەکانیان دەزانی. بەو شێوەیە ئەوانە کە لە ژیان وەلانرابوون، دەیانزانی کە لە چەند مەتر ئەولایانەوە ژیان لەگەڕ دایەو دیوارە چیمەنتۆییەکان دوو دنیا لێ جوێ دەکەنەوە کە هێندەی دوو ئەستێرەی جیاواز پێك نامۆن.

تارۆو رامبێر دوانیوەڕۆی یەکشەممەیەك بەرەو وەرزشگەکە وەڕێکەوتن. گۆنزالیس یاریزانی تۆپێنیش کە رامبێری دۆزیبۆوە لەگەڵیان بوو. ئاخری گۆنزالیس قەبووڵی کردبوو کە بە کێشکچێتی سەرپەرشتیاریی وەرزشگەکە وەئەستۆ بگرێ. رامبێر دەبوایە بە بەڕێوەبەری ئۆردوگای بناسێنێ. لەو سەعاتەدا کە یەکتریان بینیبوو، پێی گوتبوون ئەوە ئەو سەعاتەیە کە بەر لە هاتنی تاعوون، شمەکیان دەگۆڕی بۆ ئەوەی کێبڕکێکەیان دەست پێبکەن. ئێستێ کە وەرزشگە داگیر کرابوو ئیتر رێگەی ئەوەی نەبوو و، گۆنزالیس هەستی دەکرد کە بێکار کەوتۆتەوەو قەڵافەتیشی هەر وای دەنواند. ئەوە یەکێك لەو هۆکارانە بوو کە گۆنزالیس لەبەر ئەوان ئەو سەرپەرشتیارییەی وەرگرتبوو بە مەرجێك کە تەنیا لە رۆژەکانی کۆتایی حەوتوودا کێشك بێ. ئاسنان تەم بوو و گۆنزالیس کە سەری هەڵێنابوو بە داخ‌وکەسەرەوە ئەوەی بیر هێنایەوە کە ئەم هەوای نەگەرم و نە بارانیە گونجاوترین هەوایە بۆ یاریکردن. هەتا ئەو جێگەیەی بۆی دەلوا، بۆنی لەشی چەورکراوی شوێنی شمەك داکەندن، ریزە سەرداپۆشراوەکانی دەوری گۆڕەپانەکە، کە لە بن بارستایی جەماوەردا نزیك بوو تێکبشکێ، مایۆی تۆخی سەر عەرزە قاوەییەکە و ئەو لیمۆیەی کە لە "هاف تایم" دا دەیمژن و یا ئەو لیمۆنادەی کە گەرووی فێنك دەکردەوە، دێنایەوە بیر خۆی. هەروەها تارۆ دەنووسێ، کە لە تەواوی ئەو رەوگەیەدا، لە نێو کۆڵانە کاولەکانی گەڕەکەکانی دەرەوەی شاردا، کاکی یاریزان بەردەوام نووکە شەقی لە کلۆ بەردەکانی سەر رێگەکەی دەدا و هەوڵی دەدا یەکڕاست بیانخاتە نێو کونی ئاوەڕۆکانەوە و هەرکات توانیبای وابکا دەیگوت:" یەك بە هیچ." کاتێك جگەرەکەی تەواو دەکرد قونچکەکەی فڕێ دەدایە بەردەمی خۆی و دەیویست بە نووکە شەق نەهێڵێ بکەوێتە عەردی. لە نزیك وەرزشگەوە کە منداڵان یارییان دەکرد تۆپێکیان بەرەو ئەو تاقمە هاویشت کە بەلایاندا تێدەپەڕینو گۆنزالیس لە ریزی ئەوانیتر جویێ بۆوە بۆ ئەوەی بە جوانی بۆیان بهاوێتەوە.

ئاخری چوونە نێو یانەکەوە. شوێنە سەرداپۆشراوەکان پڕ بوون لە خەڵك، بەڵام گۆڕەپانەکە بە سەدان خێوەتی سوور داپۆشرابوو کە لە دوورەوە، قەرەوێڵەو بوخچەکانان تێدا دیار بوون. ریزە سەرداپۆشراوەکانیان بۆ ئەوە راگرتبوو کە تووشبووەکان، بتوانن لە کاتی باران و هەتاودا پەنایان بۆ بەرن. تەنیا ئەو کاتەی کە خۆر ئاوادەبوو، دەگەڕانەوە خێوەتەکان. لە بن ریزە

سەرداپۆشراوەکان، شوێنی خۆ شوشتن هەبوون کە کەڵکیان لێوەدەگیردرا و شوێنەکانی شمەك داکەندنی جارانی یاریزانەکان، کرابوونە نووسینگە و دەرمانخانە. زۆربەی تووشبووانی نێو دابڕگەکان، شوێنە سەرداپۆشراوەکانیان داگرتبوو و ئەوانیتر لە دەورووبەری گۆڕەپانەکە دەخولانەوە. چەند کەسێك لەبەردەم خێوەکانیان هەڵتووتەکابوون و نیگا بۆش و ساردەکانیان بەسەر هەموو شتێکد دەگێڕا. لە ریزە سەرداپۆشراوەکاندا زۆربەی خەڵك داهێزرابوون و دەتگوت لە حاڵەتی چاوەڕوانیدان.

تارۆ لە رامبێری پرسی:

ـ ئەوانە بە رۆژ چ دەکەن؟

ـ هیچ.

دەکرێ بڵێی هەمووان باسکیان بەردابوونەوە و دەستیان بەتاڵ بوون. ئەو جەماوەرە زۆر و زەوەندە، بە شێوەیەکی سەیروسەمەرە بێ دەگ بوو.

رامبێر گوتی:

ـ لە رۆژەکانی یەکەمدا لێرە دەنگ بە دەنگ نەدەگەیشت، بەڵام بە تێپەڕینی رۆژەکان قسەکانیان جاربەجار کەمتر بۆوە.

ئەگەر باوەڕ بە یادداشتەکانی تارۆ بکەین، ئەو باشتر لە دەروونیان تێ دەگەیشت و ئەوانی دەبینی کە لە سەرەتادا لە خێوەتەکانیاندا کۆ بوونەتەوە و خەریکی بیستنی دەنگی مێشومەگەز یا خوراندنی لەشیانن‌و هەرکات بیسەرێکیان وەدەست کەوێ هاواری ترس و تووڕەییان لێ بەرز دەبێتەوە، بەڵام لەو کاتەوە کە ئۆردووگا سیخناخ ببوو ئیتر کەس گوێی پێ نەدەدان. ئیتر تاقە کارێکی کە لە دەستیان دەهات، ئەوە بوو کە بێ دەنگ بمێننەوە و خۆ لە یەکتری ببوێرن. لە راستیدا جۆرە بێ متمانەییەکیش لەگۆڕێ بوو کە لە ئاسمانی خۆڵەمێشیی رووناکەوە، بەسەر ئۆردووگا سوورەکەدا دەباری.

بەڵێ، هەمووان رواڵەتێکی بێ متمانەیان هەبوو. لە خۆڕایی نەبوو کە ئەوانیان لە خەڵك جوێ کردبۆوە،و ئەوان لە کەسانێك دەچوون کە لەوە دەگەڕێن بزانن بۆ جوێ کراونەوە و دەشترسێن. هەر کام لەوان کە تارۆ لێی دەڕوانی، نیگایەکی بەتاڵیان هەبوو و دیاربوو کە

دابڕانی یەکجارەکی لەو شتەی کە ژیانی ئەوانی پێکدەهێنا ئازاریان دەدا، و چونکە نەیاندەتوانی هەمیشە بیر لە مەرگ بکەنەوە بیریان لە هیچ نەدەکردەوە. ئەوان لە پشوودااندا بوون. تارۆ دەینووسی:"، بەڵام لە هەمووی خراپتر ئەوەیە کە لە بیرچووبنەوە و خۆیشیان ئەوە دەزانن. ئەوانەیان لەبیر کردوون کە دەیانناسین چونکە بیر لە شتێکی دیکە دەکەنەوەو ئەوەش شتێکە هەموو کەس تێی دەگا. و ئەوانەش کە خۆشیان دەوێن، فەرامۆشیان کردوون چونکە دەبێ کاتەکانیان بۆ هەوڵ و دۆزینەوەی ڕێگەچارە بەمەبەستی هێنانەدەریی ئەوان تەرخان بکەن‌و ئەوەندە نوقمی ئەو هەوڵنە بوونە کە لە ئاکامدا بیر لەو کەسە ناکەنەوە کە دەبێ ڕزگاری بکەن. چونکە بەراستی بیرکردنەوە لە کەسێك بریتییە لەوەی کە سات بەسات لە بیریدا بین و هیچ شتێ نەتوانێ ئێمە لەو بیرو هزرە پاشگەز بکاتەوە: نە گرینگیدان بە ماڵ وحاڵ و نە بە ژیان، نە مێشێك کە هەڵدەفڕێ، نە خواردن و نە خوران، بەڵام هەمیشە مێش‌ومەگەز و ئاڵۆش لەگۆڕێ هەن. بۆیە ژیان دژوارە و ئەو کەسانە باش لەوە تێدەگەن.

بەڕێوەبەر کە بەرەو ئەوان دەگەڕایەوە، گوتی کە یەکێك بە ناوی ئاغای ئۆسۆن گەرەکیەتی بیانبینێ. گۆنزالیسی بەرەو نووسینگەکەی برد و دوایی ئەوانی بردە گۆشەیەکی سەیوانەکان. لەوێ ئاغای ئۆسۆن کە دوور لەوانیتر دانیشتبوو هاتە پێشوازییان. هەر وەکی جاران جلوبەرگی پۆشیبوو و یەخەی کراسەکەی هەروا شەق و ڕەق بوو. تەنیا تارۆ تێگەیشت کە مووی سەر شەویلاگەکانی زیاتر لە جاران تێکئاڵاوەو یەکێك لە قەیتانی یەکێك لە پێڵاوەکانی کراوەتەوە. دادوەر ماندوویەتیی پێوەدیار بوو و تەنانەت جارێکیش چاوی لە چاوی بەرامبەرەکەی نەکرد. گوتی بە دیتنیان خۆشحاڵەو داوایان لێ دەکا سوپاسی دوکتۆر ڕیڤۆ بکەن بۆ ئەو کارانەی کردوویەتی.

ئەوانیتر بێ دەنگ بوون. دادوەر دوای ماوەیەك بێ دەنگی گوتی:

ـ هیوادارم ژاك زۆری ئازار نەچێشتبێ.

ئەوە یەکەمجار بوو کە تارۆ لە زاری ئەوەوە ناوی منداڵەکەی دەبیست و زانی کە شتێك گۆڕاوە. خۆر لە ئاسۆوە ئاوا دەبوو و ڕوخساری هەرسێکیانی زەرد هەڵدەگێڕا. تارۆ گوتی:

ـ نا، نا، بەراستی ئازاری نەچێشت.

که ئەوان رۆیشتن دادوەر هەروا چاوی بڕیبووە لای زەردەپەڕ کە تیشکی خۆری لێوە بەدی دەکرا.

رۆیشتن بۆ ئەوەی مالآوایی لە گۆنزالیس بکەن کە خەریکی خوێندنەوەی تابلۆیەکی ئێشکگری بوو.

یاریزان لە حالێکدا کە دەستی ئەوانی دەگوشی گوتی:

ـ لانیکەم دیسان رێگەم کەوتەوە شوێنی شمەك گۆڕین. هەروەکی خۆی ماوەتەوە.

برێك دواتر لە حالێکدا بەڕێوەبەر و تارۆ و رامبێری لەگەڵ خۆیدا لە نووسینگەکە دەبردە دەرەوە، وەزەوز و هازەهازی مێش لە ریزە سەرداپۆشراوەکاندا دەبیسرا. دوایی بڵندگۆکان کە لە رۆژانی خۆش دا ئاکامی کێبڕکێکانیان رادەگەیاندو یا گرووپەکانیان دەناساند، بە دەنگێکی گڕ رایانگەیاند کە دەبێ هەموان بچنەوە نێو خێوەتەکانیانەوە بۆ ئەوەی بتوانن خواردنی شەو دابەش بکەن. لەسەرەخۆ خەڵك شوێنە سەرداپۆشراوەکانیان بەجێهێشت و لە حالێکدا کە لاقەکانیان لەعەرز دەخشکاندن گەڕانەوە نێو خێوەتەکانیان. کاتێك هەموان لە جێگەی خۆیان دامەزران، دوو عارەبانەی بچووکی کارەبایی، هەر لەو جۆرەی کە لە وێستگەکانی شەمەندەفەردا دەبینرێن، بە چەند مەنجەڵی گەورەوە بە نێوەڕاستی خێوەتەکاندا تێپەڕین، خەڵك باسکیان درێژ دەکردن. دوو ئەسکوێ*ی گەورە لە دوو قابڵەمە دەگەڕانو دەهاتنە دەرەوەو ئەوەی دەیانهێنایە دەرێ دەیانڕشتە نێو دوو قابڵەمەوە. ترۆمبیلەکە وەڕێدەکەوت. لە خێوەتەکەی دیکەش دا هەر ئەو بەزمە بوو. تارۆ بە بەڕێوەبەرەکەی گوت:

ـ شێوازەکەتان زانستییە.

بەڕێوەبەر لە حالێکدا کە دەستی ئەوانی رێك دەگوشی بە رەزامەندییەوە وەلآمی دایەوە:

ـ بەڵێ، زانستییە.

خۆر، ئاوا دەبوو و ئاسمان کرابۆوە. تیشکێکی نەرمو فێنك ئۆردووگای دادەپۆشی. لە هێمنیی زەردەپەڕدا دەنگی کەوچك و قاپوقاچاغ لە هەموو لایەکەوە دەبیسرا.

---

* ئەسکوێ: کەوچکی قووڵ بۆ تێکردنی شلەو شۆرباو. پیرەمێردی دەفەرموێ:

ئەوی لە دیزەی خەڵکا ئەسکوێیە   هیچ کەس نازانێ ئەسڵی لە کوێیە

شەمشەمەکوێرەکان، بەسەر خێوەتەکان دا دەخولانەوە و خێرا تێدەپەڕین. شەمەندەفەرێك لەو دیوی دیوارەکانەوە، لەسەر دوو ڕێیانی هێڵەکە دەنگی بەرز بۆوە. تارۆ لە حاڵێکدا کە لە دەرگا دەهاتە دەرەوە گوتی:

ـ دادوەری داماو، حەق وابوو کارێکی بۆ بکەین، بەڵام چۆن دەکرێ یارمەتیی دادوەرێك بدەی؟

## (٧)

لە شارەکەدا کۆمەڵێك ئۆردووگای دیکەی لەو چەشنەش هەبوون کە گێڕەرەوە لەبەر ئەوەی بەگومانە و، زانیاریی راستەوخۆی لەسەریان نیە ناتوانێ شتێکیان لە بارەیەوە بڵێ، بەڵام هەر ئەوەی کە دەتوانێ بیڵێ ئەوەیە کە بوونی ئەو ئۆردووگایانە و ئەو بۆن و بەرامە مرۆییەی لێیانەوە دەهات لەگەڵ دەنگی بەرزی بڵندگۆکان لە دەم ئێوارەدا و نهێنیی دیوارەکان و ترس لەو شوێنە تووك لێکراوانە، بەسەر رۆحی خەڵکی شارەکەی ئێمەوە قورس بوو و پەرەی بە دڵەڕاوکێ و پەرێشانی گشتی دەدا. رووداوەکان و کێشە لەگەڵ بەرپرسان پەرەی سەند.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە کۆتایی نۆڤەمبەردا هەوای بەیانییان ساردی کرد. بارانی بە لێشاو بەردچنی کۆڵانەکانی شوشتنەوە، ئاسمانی خاوێن کردەوەو پاك و بێ هەور لەسەر کۆڵانە بریقەدارەکانەوە بەجێی هێشت.و هەموو بەیانیەك هەتاوێکی بێ تین، تیشکێکی درەوشاوەو سڕی بەسەر شاردا دەپژاند. بە پێچەوانەوە، بەرەبەری شەوێ هەوا دیسان خۆشی دەکردەوە. تارۆ بۆ ئەوەی بڕێك کوڵی دڵی خۆی بۆ دوکتۆر ریڤۆ هەڵڕێژێ وەها ساتێکی دیاری کرد.

رۆژێك سەعات دەورووبەری دەی شەوێ، پاش رۆژێکی درێژ و تاقەتپڕووکێن، تارۆ لەگەڵ ریڤۆ بۆ سەردانێکی شەوانە، چوو بۆ ماڵی پیرەمێردە پشووسوارەکە. ئاسمان لەسەر ماڵەکانی گەڕەکە کۆنەکە بەحاڵ تروسکەی دەهات. شنەیەکی نەرم بێدەنگ لە چوارڕێیانە تاریکەکان دا هەڵی کردبوو. ئەو جووتە کە گەیشتبوونە کۆڵانە بێدەنگەکانەوە، بەسەر قسەکردن و چەنەوڕیی پیرەدا کەوتن. پیرەمێردە پێی گوتن کە زۆر کەس لەگەڵ ئەوەدا نین کە پارووی خۆش بۆ ئەوانی دیکەیە،

که گۆزەی ئاو ئاخرییەکەی لە ئاودا دەشکا و لەوانەیە ـ لێرەدا دەستەکانی ڕێکخشاند ـ لەوانەیە تێکهەڵچوون و پێکدادان ساز بێ. دوکتۆر کەوتە پشکنینی. لەو ماوەیە دا پیرەمێرد بێبڕانەوە رای خۆی لەسەر ڕووداوەکان دەردەبڕی.

لەسەرخۆیانەوەن گوێیان لە دەنگی پێ، بوو. پیرەمێردەکە** کە دیتی تارۆ خەیاڵی لای ئەوانە، گوتی دەروجیرانن وا لەسەر بانیژەکانن. هەروەها ئەوان تێگەیشتن کە لەوسەرەوە دیمەنێکی جوان هەیە و زۆربەی هەیوانی ماڵەکان وا دەچنەوە سەریەك، کە ژنانی گەڕەك دەتوانن بەبێ ئەوەی لە ماڵەکانیان بچنە دەرەوە بچنە لای یەکتری. پیرەمێرد گوتی:

ـ بەڵێ، بڕۆنە سەرێ. ئەوێ هەواکەی خۆشە.

دیتیان هەیوانەکە چۆڵەو سێ کورسیی لێ بوو. لە لایەکەوە، هەتا چاو هەتەری دەکرد، هەیوانی ماڵەکانیان دەبینی کە چووبۆوە سەر کەڵەکە بەردێکی رەش و ئەوان تێگەیشتن کە ئەو کەڵەکە بەردە یەکەمین تەپۆڵکەیە. لەولای دیکەوە، لەسەر چەند کۆڵان و بەندەری نەبەدییەوە*** نیگای مرۆڤ دەچووە سەر ئاسۆیەك، کە لەوێ ئاسمان و زەریا بە ترپەیەکی نادیار تێکەڵاو دەبوون. لەو پەڕی لەمپەرێکەوە کە دەیانزانی گاشەبەردەکانی بەستێنە، تیشکێك کە دیار نەبوو لە کوێوە دێ، بە رێکی هەڵ دەبوو و دەکووژایەوە. ئەوە فانۆسی دەریایی تەنگەڵانەکە بوو کە لە بەهارێوە بۆ پاپۆڕەکان هەڵدەسووڕا بۆ ئەوەی بەرەو بەندەرەکانی دیکە بسووڕێنەوە. لەو ئاسمانەوە کە با رایماڵیبوو و سامالی کردبوو، ئەستێرە چاوگەشەکان دەدرەوشانەوە و رووناکایی فانۆسە دەریاییەکە، جارنەجارێك، تیشکێکی خۆڵەمێشیی تیژتێپەڕی پێدا دەپژاندن. شنە بۆنی گیا و بەردی دێنا. بێدەنگییەکی قووڵ و کپ، وڵاتی داگرتبوو.

ریڤۆ کە دەیویست دادەنیشێ، گوتی:

ـ هەوایەکی خۆشە. هەر دەڵێی تاعوون نەگەیوەتە ئێرە.

---

** سەرنج: لە دەقە فارسیەکەی دا دیارە بە هەڵە نووسراوە "پیرێژن گوتی" بۆیە دەڵێم هەڵەیە لەبەر ئەوەی ئەوان چوونەتە سەردانی پیرەپیاوەکەو هیچ باسێك لە پیرەژن نییە و لە چەند هێڵی دواتریش دا دیسان باسەکە هەر لەسەر پیرە پیاوەکەیە.

*** نەبەدی: شتێك کە بە چاو نابینرێ. پیرەژنان کە دوعا لە یەکێك دەکەن دەڵێن"یاخودا تیری نەبەدیت وێکەوێ". واتە تیری نادیار.

تارۆ پشتی تێکردبوو و سەیری دەریای دەکرد. دوای ساتێك گوتی:

ـ بەڵێ، هەوایەکی خۆشە.

هات و لە تەنیشت دوکتۆرەوە دانیشت و بە وردی لێی روانی. سێ جار فانۆسە دەریاییەکە لە ئاسماندا دەرکەوت. دەنگی رژانی شتێك لە قووڵایی کۆڵانەوە دەگەیشتە ئەوێ. دەرگایەك پێوەدرایەوە. تارۆ بە لەبزێکی زۆر ئاسایی گوتی:

ریۆ تۆ هیچ کات نەتویستووە بزانی ئەمن کێم؟ هەست دەکەی برادەرمی؟

دوکتۆر وەڵامی دایەوە:

ـ بەڵێ، ئەمن هەست بە برادەرایەتیت دەکەم، بەڵام هەتا ئێستا کاتمان نەبووە.

ـ باشە، هەر ئەوە دڵنیاییم پێ دەبەخشێ. دەتەوێ ئەم سەعاتە سەعاتی دۆستایەتی بێ؟

ریۆ لە بری هەر وەڵامێك بزەیەکی بۆ کرد.

ـ جوان گوێ بگرە...

چەند کۆڵان بەولاوەتر، ترۆمبیلێك بۆ ماوەیەکی زۆر بەسەر بەردچنە تەڕەکەدا خلیسکا. ترۆمبیلەکە دوور کەوتەوە و دوایی داد و هاوارێکی ناڕوون کە لە دووروە دەهات دیسان دڕی بە بێ دەنگییەکە دا. دوایی ئەم بێ دەنگییە بە تەواوی قورسایی ئاسمان و ئەستێرەکانەوە بەسەریاندا هات. تارۆ هەستایە پێ و لە بەرامبەر ریۆوە کە هەروا بە قووڵایی کورسییەکەدا رۆچووبوو لەسەر دیواری هەیوانەکە دانیشت. جەستەی وەك پەیکەرێکی زەبەلاح دیار بوو کە بەسەر ئاسمانەوە کشابێ. ئەو ماوەیەکی درێژ قسەی کرد و قسەکانی ئەو بە نووسراو ئاوایە:

" ریۆ، بۆ ئەوەی بێ گرێ و گۆڵ بدوێم باشترە بڵێم کە ئەمن بەر لەوەی ئەم شارە و ئەو پەتایە بناسم تاعوون لێی دابووم. پێویست بە وتن ناکا کە ئەمنیش وەکوو هەموو خەڵکی ئەو شارەم، بەڵام زۆر کەس هەن کە ئەوە نازانن. یا حەزیان لێ نیە لەم دۆخەدا بمێننەوە و هەروەها کەسانێك هەن کە دەزانن و گەرەکیانە لەو دۆخە رزگارییان بێ. ئەمن هەمیشە ویستوومە بێمە دەرێ.

"ئەو دەمەی لاو بووم بە واتای بێ تاوانیی خۆمەوە دەژیام، واتە بەبێ هیچ باوەڕێك. ئەمن كەسێك خۆخۆرەوە* نیم و بە شێوەیەكی رەزامەندانە ژیانم دەست پێ كرد. لە هەموو كارێكدا سەردەكەوتم، لە رووی تێگەیشتنەوە دڵنیابووم، چۆنی بشڵێی ئاوا بەینم لەگەڵ ژنان خۆش بوو.و ئەگەر دڵیشم توند بوایە هەر بەو سادەییەی توند دەبوو ئاواش دەكرایەوە. رۆژێك كەوتمە خەیاڵ و بیركردنەوە. ئێستا...

" با پێت بڵێم كە ئەمن وەكوو تۆ هەژار نەبووم، باوكم دادوەری گشتی بوو و ئەوەش خۆی پێگەیەكە. لەگەڵ ئەوەشدا كابرایەكی ئاسایی و خاكەڕابوو و هیچ بەخۆی نەدەنازی و لە دادوەری گشتی نەدەچوو. دایكم ساویلكە و بێ كاریگەر بوو. هەمیشە خۆشم ویستووە، بەڵام وام پێ باشترە هەر باسی نەكەم. باوكم رێزی دەگرتم و تەنانەت پێموایە هەوڵی دەدا لێشم تێ بگا. لە دەرەوەی ماڵەوە بەسەرهاتی خۆی هەبوو. ئێستێ لەم بابەتەوە دڵنیام، بەڵام لەهەمان كاتدا قەت لەبەر ئەو شتە دڵم لە باوكم نەیەشاوە. لە هەموو ئەوشتانەدا هەر وەكی لێی چاوەڕوان دەكرا هەڵسوكەوتی دەكرد و كەسی جارِز نەدەكرد. بە كورتی كابرایەكی تایبەت نەبوو و ئێستاش كە مردووە، پێم وایە ئەگەرچی وەكوو پیر و پیاوچاكان نەژیا، بەڵام كابرایەكی خراپ نەبوو. زێدەڕۆیی نەبوو، هەر ئەوە... و لەو جۆرە كەسانە بوو كە دەكەونە بەردڵی مرۆڤ و، ئەو خۆشویستنە هەتا هەتایی دەبێ.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو تایبەتمەندییەكی هەبوو: رێنوێنی گەورەی سەفەركردن كتێبێك بوو بەناوی" Chaix" كە زۆری حەز لێی بوو. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ كات سەفەری نەكرد مەگەر لە رۆژانی پشوودا كە سەردانی بێرتانێی دەكرد كە مڵكێكی بچووكی لەوێ هەبوو، بەڵام هەركات داوات لێكردبایە ئامادەبوو كە كاتی بێ ئەملاوئەولای هاتن و رۆیشتنی شەمەندەفەری پاریس ـ بەرلین، كاتە جۆراوجۆرەكانی گۆڕینی شەمەندەفەری رۆیشتن لە لیڤۆنەوە بۆ ڤەرشۆ و مەودای نێوان هەركام لە پێتەختەكانت بێ ئەملاوئەولا پێ بڵێ.

ئاخۆ تۆ دەتوانی بڵێی كە چۆن دەكرێ لە "بریانسۆن"ــەوە بچیتە "شامۆنی"؟ تەنانەت ئەگەر سەرۆكی شەمەندەفەرێكیش بیەوێ بیڵێ تێیدا گێژ دەبێ، بەڵام باوكم هەڵەی نەدەكرد.

---

* خۆخۆرەوە: كەسێك كە هەمیشە پێش دەباتەوە بەر خۆی و لە ناخەوە خۆی دەخواتەوە و خەمەكانی نادركێنێ.

هەموو شەوان بۆ تەواوکردنی زانیارییەکانی لەم بارەیەوە تەمرینی دەکرد و بەو کارەی خۆی دەنازی. ئەمنیش بەو کارەی ئەوەوە دەخافلام. زۆر جاران پرسیارگەلێکم لێ دەکرد و دوایی بۆ ئەوەی بزانم راستی پێ وتووم یان نا، دەچووم چاوم لە کتێبی رێنوێن (رێپێشاندەر) دەکرد و کەیفی بەوە دەهات کە پێی بلێم بە هەڵە ناچی. ئەو تەمرینە بچووکانە زۆر پێکەوەی گرێداوین. لەبەر ئەوەی من بۆ ئەو بیسەرێك بووم کە ئەو باوەڕی بە نیازپاکییەکەی هەبوو، بەڵام ئەمن پێموابوو ئەو پوانەی وا ئەو لەسەر باسی شەمەندەفەرەکان هەیەتی لە هەموو پوانەکانی دیکە باشترە.

" بەڵام زۆری لەسەر دەڕۆم و مەترسیی ئەوە هەیە کە بایەخی لەرادەبەدەر بەو کابرا چاکەکارە بدەم. دوای تەواوی ئەو قسانە ئەو تەنیا کاریگەریی ناراستەوخۆی لەسەر بڕیارەکەی من هەبوو و تەنیا هەلێکی بۆ رەخساندم. کە تەمەنم گەییە حەڤدەساڵی باوکم بانگهێشتی کردم کە بچم بۆ بیستنی بانگەشەنامەکەی ئەو. دۆسییەیەکی گرینگ لە دادگای تاوانەکاندا لەگۆڕێ بوو و، بە دڵنیاییەوە پێی وابوو کە ئەو رۆژە بە باشترین شێوە خۆ دەردەخا. هەروەها پێموایە ئەو رێورەسمەی بۆ گەنجان بە شتێکی گونجاو زانیبوو و دەیەویست لەم رێگەیەوە ئەمن بەرەو کارێك هان بدا کە خۆی هەڵی بژاردبوو. ئەمن قەبووڵم کردبوو لەبەرە ئەوەی باوکم بەو قەبووڵکردنەم خۆشحاڵ دەبوو و هەروەها لەبەر ئەوەی کە حەزم لێ بوو، ئەو لە رۆڵێکی دیکەدا جگە لەو رۆڵەی لە نێو خۆماندا دەیگرێ ببینم و دەنگی ببیستم . جگە لەوە بیرم لە هیچ شتێکی دیکە نەدەکردەوە. ئەوەی لە دادگادا بەڕێوەبوو، بە لای منەوە هەمیشە، وەکوو مەشقی سەربازان لە ١٤ ی ژوولایدا یا وەکوو رێورەسمی خەڵات بەخشین شتێکی سرووشتی بوو کە نەدەبوو نەبێ. وێنایەکی لێڵم لێی هەبوو کە ئازاری نەدەدام.

"و ئەمن تەنیا وێنەیەکی ئەو رۆژەم لە زەینیدا ماوەتەوە: وێنەی تاوانبار! پێموایە ئەو بە راستی تاوانبار بوو، بەڵام ئەوە گرینگ نیە، بەڵام ئەو کابرا وردیلە قژ خەنەییە تەمەن نزیك بە سی ساڵە، ئەوەندە وێدەچوو کە سوور بێ لەسەر ئەو شتەی کردبووی و، لەوەی کە دەیانویست لەگەڵی بکەن وا تۆقیبوو کە پاش چەند ساتێکیش چاوەکانی من بە جێگەی هەموو شتێك هەر لەسەر ئەو، بەمۆڵەق وەستابوون. ئەو لە کوندەبوویەك دەچوو کە لە رووناکییەکی توند ترسابێ.

گرێی بۆینباخەکەی نەکەوتبووە سەر قووڵایی یەخەکەی. تەنیا نینۆکەکانی دەستێکی خۆی دەجوی. دەستی راستی... بە کورتی زۆری لەسەر ناڕۆم. تێگەیشتی کە ئەو زیندوو بوو.

"بەڵام ئەمن، لەو ساتەدا لەنەکاو تێگەیشتم کە هەتا ئەو کاتە، بە ئاسوودەیی و تەنیا وەکوو یەکێك لە چینی "تاوانباران" بیرم لەو کردبۆوە. ناتوانم بڵێم کە لەو ساتەدا باوکم لەبیر چووبۆوە، بەڵام هەستێك گوشاری خستبووە سەرم و جگە لە سەرنج دان بە تاوانبار نەیدەهێشت سەرنج بدەمە هیچ شتێکی دیکە. دەکرێ بڵێم هیچم نەدەبیست، هەستم دەکرد دەیانەوێ ئەو کابرا زیندووە بکووژن و وارسکەیەکی بەهێز، وەکوو شەپۆلێك ئەمنی بە جۆرە لاسارییەکەوە بەرەو لای ئەو دەبرد و، تەنیا کاتێك باوکم داوای سزای بۆ دەکرد وەخەبەر هاتم.

" ئەو کە بە باڵاپۆشە سوورەکەیەوە گۆڕابوو، ئیتر نە پیاوچاك بوو نە دلۆڤان. زاری لە جووڵە نەدەکەوت، رستەی زل زل بێوچان وەکوو ماری ئەفعی لە زاری دەهاتنە دەرەوە و تێگەیشتم کە ئەو بە ناوی کۆمەڵگەوە داوای مەرگی ئەو کابرایە دەکا و تەنانەت دەیەوێ کە سەری ببڕن. بەڵێ، راست بوو، ئەو تەنیا دەیگوت:" ئەو سەرە دەبێ لێ بکرێتەوە."، بەڵام لە کۆتاییدا جیاوازییەکە هێندە نەبوو و ئەوەش بەوپەڕی خۆی گەیشت، لەبەر ئەوەی کە ئەو سەرەی وەدەست هێنا کە دەیویست. بەو جیاوازییەوە کە بۆخۆی نەیکرد و ئەمن دوایی هەتا ئاکامەکەی وەشوێن ئەو رووداوە کەوتم. بەرامبەر بەو چارەڕەشە هەستم بە وەها نزیکایەتییەك دەکرد کە باوکم قەت هەستی پێ نەکردبوو. لەحاڵێکدا باوکم دەبوایە بە پێی رێسا لەو رێورەسمەدا بەشدار بێ کە بەشێوەیەکی رێزدارانە ناویان ناوە "دوایین ساتەکانی حوکمدراوێك" و لە راستیدا دەبێ ناوی بنێی ناشیرنترین کوشتن.

"لەو کاتەوە، بە بێزەوە سەیری رێنوێنی سەفەر "Chaix "م کرد. لەو کاتە بەدواوە، بە ترس و خۆفەوە روانیمە دادپەروەری و مەحکووم بە مەرگو لە سێدارەدران. و بە جۆرێك سەرەگێژەوە تێگەیشتم کە بە دڵنیاییەوە باوکم گەلێ جاران لە رێوڕەسمی لە سێدارەداندا بەشدار بووە و ئەوە لەو رۆژانەدا بووە کە ئەو کەڕەی بەیانی لەخەو هەڵدەستا. بەڵێ، باوکم، لەو کاتەدا سەعاتەکەی قورمیش دەکرد. نەمدەوێرا لەو بارەیەوە قسە لەگەڵ دایکم بکەم، بەڵام ئەوم زیاتر دەخستە ژێر چاوەدێرییەوە و تێگەیشتم کە ئیتر پێوەندییەکیان بە یەکترەوە نەماوە و بە

پساندنی پێوەندییەکان و ڕەزامەندییەوە دەژی و هەروەکی گوتم ئەو بیرە یارمەتیی دام لێی خۆش بم. دواتر تێگەیشتم کە هیچ شتێك بۆ لێبوردن نیە. لەبەر ئەوەی دایکم بەر لە زەماوەند هەژار بووە و هەژاری فێری سەربەردانەوە و ڕەزامەندیی کردبوو.

" بێ گومان چاوەڕێی پێت بڵێم کە لەڕێوە لە ماڵێ چوومەدەرێ و ڕۆیشتم. نەخێر، چەند مانگ و تەنانەت ماوەی ساڵێك لەوێ مامەوە، بەڵام دڵم شکابوو. شەوێکی باوکم داوای سەعاتە زەنگدارەکەی خۆی کرد لەبەر ئەوەی دەیویست بەیانی زوو لە خەو هەستێ. شەوێ خەوم لێ نەکەوت. بۆ سبەینێ کاتێ باوکم گەڕایەوە ئەمن ڕۆیشتبووم. دەبێ ئەوە بڵێم کە باوکم دەمودەست سۆراغی گرتبووم، چوومە لای و بە بێ لەسەر ڕۆیشتن بەوپەڕی هێمنیەوە پێم گوت کە ئەگەر ناچارم بکا بگەڕێمەوە خۆم دەکووژم. ئاخرییەکی قەبووڵی کرد لەبەر ئەوەی کابرایەکی نەرم و نیان بوو، لەسەر ئەوەی کە حەزکردن بە ژیانی هاوبەش گەمژانەیە (بڕیارەکەی منی ئاوا لێکدایەوە و ئەمن نەمویست بڵێم لە هەڵە دایە) زۆری لەسەر ڕۆیشت. زۆر پێشنیاری پێ کردم و ئەو فرمێسکانەی قووتدانەوە کە لە چاوەکانیدا قەتیس مابوون. دواتر، زۆر دوای ئەو ڕۆژە، بەردەوام بۆ سەردانی دایکم دەچوومەوە ماڵێ و لەو ماوەیەدا باوکیشمم دەدی. پێموایە هەر ئەوەندە پێوەندییەی بۆ بەس بوو، و، بەڵام هیچ ڕقێکم لێی نەبوو تەنیا بڕێك پەژارەم لە دڵیدا بوو. کاتێك ئەو مرد، دایکمم هێنایە لای خۆم و ئەگەر ئەویش بە نۆرەی خۆی نەمردبایە، ئێستاش لەگەڵم دەژیا.

"ئەمن زۆر پێم لەسەر ئەو دەسپێکە داگرتەوە، لەبەر ئەوەی دەسپێکەکە هەموو شتێکی تێدابوو. ئیتر ئەوجار خێراتر دەچمەپێش. لە تەمەنی هەژدە ساڵێمدا کاتێك لە ژیانی ئاسوودەییم هاتمە دەرێ هەژاریم ناسی. بۆ بژیوی ژیان کار نەما نەیکەم و سەرکەوتنیشم باش بوو، بەڵام ئەوەی لەهەموو شتێك پتر زەینی منی بەخۆیەوە خەریك دەکرد، مەحکووم بوون بە مەرگ بوو. دەمویست پاکانەحیسابێك لەگەڵ ئەو کوندە خەنەییە بکەم. هەر بۆیەش وەك دەڵێن بە قووڵایی سیاسەت دا ڕۆچووم. مەسەلە ئەوەبوو کە نەمدەویست تاعوونلێدراو بم. پێموابوو کە کۆمەڵگەیەکە لەسەر مەحکوومبوون بە مەرگ تخێڵ بووە و ئەگەر بەرەنگاری ببمەوە دژی کوشتن و جەنایەت بەشەڕ هاتووم. ئەمن باوەڕم بەو شتە بوو و تارادەیەکیش

راست بوو. ئەو کات کەوتمە لای کەسانێك کە خۆشم دەویستن‌و دەستم لە خۆشەویستییان هەڵنەگرت. ماوەیەکی زۆر لەگەڵیان مامەوە و لە ئەورووپا وڵاتێك نیە کە لە خەباتەکەیدا بەشدار نەبووبێتم. با لێی گەڕێین.

" دیارە دەمزانی کە ئێمەش بە پێی کات و شوێن، بڕیار دەدەین و مەحکووم دەکەین، بەڵام بە منیان دەگوت کە ئەو چەند مەرگە، بۆ گەیشتن بە دنیایەکی کە لەوێدا کەس کەس ناکوژێ پێویستە. ئەوە لە بارێکەوە راست بوو و دوای تەواوی ئەو قسانە لەوانەیە من جۆرێك ساز کراوم کە ناتوانم باوەڕم بەو جۆرە راستییانە هەبێ. هەر ئەوەندەم لێ سوورە کە کەوتبوومە گومانەوە و دڕدۆنگ ببووم. ئەمن بیرم لە "کوندەبوو" دەکردەوە و ئەو رەوشەش دەیتوانی درێژەی هەبێ. هەتا ئەو رۆژەی لە سێدارەدرانێکم بە چاوی خۆم بینی (لە هەنگاریا بوو) و تووشی هەر هەمان سەرەگێژە بوومەوە کە لە سەردەمی منداڵیمدا گرتبوومی، ئێستا کە پیاوێك بووم بەرچاوی تاریك کردم.

"قەت تیرەباران کردنی کەسێکت دیتوە؟ بە دڵنیاییەوە نەتدیوە. دیارە ئەو کارە بە بانگهێشتن دەکرا و بەشداران لە پێشدا هەڵبژێراون. ئاکامەکەی ئەوەیە کە زانیاریی تۆ لەو رێورەسمە هەر ئەوەندەیە کە لە وێنە و کتێباندا بینیوتە کە دەسرۆکەیەك بەسەر چاوەوە، داری سێدارەو چەند سەربازێك لە مەودایەکی دوورەوە، بەڵام نەخێر وانیە. دەزانی! بە پێچەوانەوە، شوێنی تیرەباران مەتر و نیوێك لە مەحکومکراوەوە دوورە؟ دەزانی ئەگەر تاوانبار دوو هەنگاو هەڵێنێتەوە سینگی وەتفەنگەکان دەکەوێ؟ دەزانی کە چەکدارەکان لەو مەودا کورتەوە فیشەکەکانیان بەسەر دڵیەوە دەنێن‌و تەواویان بە فیشەکە گەورەکانیان کونێك لەوێ دەکەن کە دەکرێ مستەکۆڵەی تێ بئاخنی. نەخێر تۆ نازانی، لەبەر ئەوەی ئەوانە کۆمەڵێك وردەکارین کە هیچ کەس باسیان ناکا. خەوی مرۆڤەکان پیرۆزترە لە ژیان بۆ تاعوونلێدراوان. نابێ پێش بە خەوتنی خەڵکی رێکوپێك بگری، ئەوە بێ سەلیقەییە و، هەمووان دەزانن کە سەلیقە بریتییە لە پیداگرنەبوون، بەڵام ئەمن هەر لەو کاتەوە ئیتر باش نەخەوتم. چێژی خراپی ئەو رووداوە لە زارمدا مایەوە و ئەمن دەستم لە پێداگری واتە بیرکردنەوە هەڵنەگرت.

"ئیتر تێگەیشتم کە لانیکەم لە تەواوی ئەو ساڵە دووردوودرێژانەدا، تاعوونلێدراو بوومە و بە تەواوی راستگۆییمەوە پێموابووە لەگەڵ تاعوون بەشەڕدێم. زانیم کە ناراستەوخۆ مەرگی هەزاران کەسم پشتڕاست کردۆتەوە و بە پەسندکردنی هەڵسوکەوت و بنەماگەلێك کە بە ناچاری ئەو مەرگانەیان بە دوادا دێن تەنانەت بوومەتە هۆی ئەو مەرگانەش. خەڵك وێنەدەچوو لەو رەوشە نارەحەت بووبێتن و یا لانیکەم قەت بە ئازادی قسەیان لەسەر نەدەکرد. ئەمن قوڕگم دەگوشرا. ئەمن لەگەڵیان بووم و بەوحاڵەشەوە تەنیا بووم. کاتێك نیگەرانیەکانم شی دەکردنەوە، ئەوان بە منیان دەگوت کە دەبێ بیر لەوشتە بکەیتەوە کە مەترسیدارە و زۆرجار هۆکاری کاریگەریان دەخستەروو بۆ ئەوەی ئەو شتەم دەرخوراد بدەن، کە پێم قووت نادرێ، بەڵام من وەڵامم دەدانەوە کە تاعوونلێدراوە گەورەکان، ئەوانەی کە باڵاپۆشی سوور دەپۆشن... ئەوانیش هۆکار و بیانووی باشیان بۆ ئەوشتە هەیە و ئەگەر من هۆکارگەلی تۆبزییانە(جبری) و ئەو پێویستییانەی کە تاعوونلێدراوانی بچووك بە داوا و پاڕانەوە دەیانهێننە گۆڕێ وەرگرم، ئیتر ناتوانم هۆکارو بیانووی تاعوونلێدراوە گەورەکان رەد بکەمەوە. لە وەڵامدا دەیانگوت باشترین رێگە بۆ ئەوەی رێگە بە عەبا سوورەکان بدەین ئەوەیە کە مافی حوکمدان بخەینە پاوانی ئەوانەوە، بەڵام ئەمن بەخۆمم دەگوت کە ئەگەر مرۆڤ یەکجار خۆ بەدەستەوە بدا ئیتر هۆیەك نیە بۆوەی راوەستێ. مێژوو بە گوێرەی پێویست هۆکاری خستۆتە بەردەستی من، ئەم رۆژگارە بۆ کەسێکە کە زیاتر بکووژێ. تەواویان تووشی تاسەی مرۆکوژی بوون و ناتوانن جۆرێکیتر بجوولێنەوە.

"بەهەر حاڵ ئەو بابەتەی لەگەڵی بەرەوڕوو بووم بەڵگە هێنانەوە نەبوو. کوندە خەنەییەکە بوو. ئەو رووداوە چەپەڵەی کە تێیدا زارە پیسە تاعوونیەکان، بە پیاوێکیان رادەگەیاند کە دەمرێ و تەواوی کەرەسەیەکیان بۆ ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی ئەو شەوە درێژەکانی ئاویلکەدان بە چاوی بێخەوەوە چاوەڕێی مەرگی خۆی بێ و دواتر بکوژرێ. مەسەلەی من مەسەلەی "کون لە جەرگی" بوو. بە خۆمم دەگوت جارێ لانیکەم بە نۆرەی خۆم، قەت قەت، تەنانەت بۆ جارێکیش، گوێتان لێمە! تەنانەت بۆ تاقە یەکجاریش حەق نادەم بەو قەسابییە قێزەونە. بەڵێ، ئەمن ئەو کوێرییە لاسارانەیەم هەڵبژارد بەهیوای ئەوەی کە رۆژێك، رووناکتر ببینم.

"لەمەودوا، ئیتر نەگۆڕاوم. ماوەیەکی زۆرە شەرمەزارم، شەرمەزاری ئەوەی کە چ لەدوورەوە و چ لە نیازپیاکییەوە ئەمن بە نۆرەی خۆم پیاوکوژ بوومە. وردە وردە تێگەیشتم کە تەنانەت ئەوانەی وا لە خەڵکیش باشترن، ئێستێ ناتوانن لە کوشتن یا پەسندکردنی کوشتن خۆ ببوێرن، چونکە ئەوە بەشێکە لە لۆژیکی ژیانیان و ئێمە ناتوانین لەم جیهانەدا جووڵەیەك بکەین کە مەترسیی مەرگی پێوە نەبێ. بەڵێ ئەمن بە شەرمەزارییەوە درێژەم پێ دا. تێگەیشتم کە هەر هەمووومان نوقمی تاعوونین و ئیتر ئاسوودەیی و هێمنیی خۆمم لە دەست دا. ئێستێ بە شوێن ئەو هێمنیەدا دەگەڕێم. هەوڵ دەدەم کە لە هەموو شتێك تێ بگەم و بە خوێنی کەس تینوو نەبم. تەنیا دەزانم بۆوەی تاعوونی نەبیت دەبێ هەرچی پێویستە بیکەی و هەر ئەوەیە کە هیواو هێمنی و ئەگەر ئەوەش دەست نەکەوت مەرگێکی هێمنت پێ ببەخشێ. هەر ئەوەیە کە دەتوانێ مرۆڤەکان هێور بکاتەوە و ئەگەر نەشیتوانی رزگاریان بکا، لانیکەم لەوانەیە کەمترین ئازاریان پێ بگەیەنێ و تەنانەت چارەسەریشیان بکا. هەر بۆیەشە ئەمن بڕیارم دا هەموو شتێ وەلاوە بنێم. تەواوی ئەو شتانەی کە لە نزیکەوە یا لە دوورەوە، بە هۆی باش یا خراپ، مرۆ دەکوژێ یا پەسندی دەکا، کە مرۆڤ بکووژێ.

" دیسان هەر لەبەر ئەوەیە، کە ئەو پەتایە هیچ شتێك فێری من ناکا، جگە لەوەی کە دەبێ شانبەشانی ئێوە شکستی بدەم. ئەمن لێم سوورە (بەڵێ، ریڤۆ دیوتە من هەموو شتێك لەسەر ژیان دەزانم) کە هەر کەسەی لە ناخی خۆیدا تاعوونی هەیە، لەبەر ئەوەی هیچ کەس، نەخێر، هیچ کەس لە دنیادا لێی دەرباز نابێ و، مرۆڤ دەبێ بەردەوام ئاگای لەخۆی بێ نەکا لە چرکەیەکی بێ ئاگاییدا، بە پژاندنی هەناسەی خۆی بەسەر کەسێکی دیکەدا، تاعوونی بداتێ. ئەوەی ئاساییە میکرۆبە و ئەویتر، سلامەتی و گەورەیی و پاکی، ئاکامی ویست و ئیرادەیە. ویستێك کە قەت نابێ بوەستێ. پیاوی گەورە، واتە ئەوەی نایەڵێ کەس لێی بگرێتەوە، ئەو کەسەیە کە بە دەگمەن هۆشی بلاو دەبێ و، مرۆڤ بۆ ئەوەی قەت هۆشی بلاو نەبێ پێویستیی بە ویست و سەرنجی تەواو هەیە. بەڵێ، ریڤۆ، تاعوونلێدراوی زۆر تاقەتپڕووکێنە، بەلام دیسان ئەوە تاقەتپڕووکێنترە کە مرۆڤ بیەوێ تاعوونلێدراو نەبێ. هەر بۆوەیە کە هەموو خەڵك شەکەت و ماندوو دیارن. لەبەر ئەوەی کە ئێستێ تەواوی خەڵك تا رادەیەك تاعوونلێدراون، و هەربۆیەشە ئەو چەند کەسەی کە دەیانەوێ لە تاعوونلێدراوی

دەرباز بن لەگەڵ شەکەتیی بێ سنوور ئاشنان، کە هیچ شتێ جگە لە مەرگ لە چنگی ئەو رزگاریان ناکا.

" لەم ساتە بەدواوە، ئەمن دەزانم کە ئیتر هیچ شتێکم بۆ ئەم دنیایە ناوێ و لەو کاتەوە کە لە خۆکوشتن پاشگەز بوومەتەوە و خۆم بە غوربەتێکی هەمیشەیی مەحکووم کردووە. ئەوە ئەوانیترن کە مێژوو دەخولقێنن. دەشزانم کە ناتوانم دادوەرییەکی روالەتی و رووکەشی لەسەر ئەوانیتر بکەم. مرۆڤ بۆ ئەوەی بکووژێکی ژیر و ئاقڵ بێت، تایبەتمەندییەکی ریزپەڕی هەیە کە من نیمە، و ئەوەش وەك لایەنێکی باش چاوی لێناکرێ، بەڵام ئێستا من دەمەوێ هەر ئەوە بم کە هەمو فێری خاکەڕایی بوومە. تەنیا دەڵێم کە بەڵا و قوربانی لەسەر زەوی زۆرن و دەبێ هەتا ئەو جێگەی کە دەلوێ خۆ ببوێری لە هاریکاریکردنی بەڵا. لەوانەیە ئەوە بەلای تۆوە ئاسان بنوێنێ و، من نازانم ئاسانە یان نا، بەڵام دەزانم راستە. من گوێم لە کۆمەڵێك بەڵگەهێنانەوە بووە کە چی وای نەماوە گێژم بکەن و سەریان لە زۆر کەس شێواندووە و وای لێکردوون بڕوایان بە پیاوکوشتن هەبێ. و تێگەیوم کە تەواوی چارەڕەشیی مرۆڤەکان لەوەڕا سەرچاوە دەگرێ کە بە زمانێکی روون و بێ گرێ و گۆڵ قسە ناکەن. لەو رووەوە بڕیارم داوە کە بە روونی بدوێم و روون هەڵسوکەوت بکەم بۆوەی کە بکەومە سەر رێگەی راست. کەوابوو دەڵێم کە بەڵا و قوربانیەکان هەن و هیچی تر. ئەگەر بە وتنی ئەو قسەیە خۆم دەبمە بەڵا، لانیکەم بە ویستی خۆم نیە. ئەمن هەوڵ دەدەم کە بکوژێکی بێ تاوان بم. خۆ دەیبینن کە داوایەکی گەورە نیە.

" دیارە دەبایە دەستەیەکی سێهەمیش هەبێ. گرووپی پزیشکانی راستەقینە، بەڵام ئەوە شتێکی دەگمەنەو دەبێ زۆر ئەستەم بێ. هەربۆیە ئەمن لە هەر دەرفەتێك دا، بۆ ئەوەی خەسارەکە سنووردار بکەمەوە، کەوتمە ریزی قوربانیەکانەوە. لە نێو ئەواندا، لانیکەم دەتوانم بەدوای ئەوەدا دەچم کە بزانم چۆن دەکرێ بگەیتە گرووپی سییەم، واتە ئاشتی و هێمنی."

تارۆ کاتێك قسەکانی تەواو کردن، لاقەکانی جوولاندن و لەسەرەخۆ بە نووکی لاقی لە هەیوانەکەی دەکوتا. پاش برێك بێدەنگی، دوکتۆر برێك خۆی قیت کردەوە و پرسی کە ئاخۆ تارۆ باوەڕێکی لەمەڕ ئەو رێگەیەوە هەیە کە بۆ گەیشتن بە هێمنی و ئاسوودەیی دەبێ بیگرێتە بەر؟

ـ بەڵێ، خۆشەویستی.

دوو لوورەی ئامبولانس لە دوورەوە بەرز بۆوە. ئەو دەنگ‌و هاوارانەی کە چەند ساتێك لەمەوبەر لێڵ بوون، لەو سەری شارەوە، لە تەنیشت گردۆکە بەردینەکەی شارەوە کۆ بۆوە. لە هەمانکاتدا ، دەنگێك دەبیسترا کە لە دەنگی تەقینەوە دەچوو. ریڤۆ دوو ترووسکەی فانۆسی دەریایی ژمارد. شنە دەتگوت بەهێزتر بوو و هەر لەو کاتەدا کە بایەك لە لای دەریاوە هەڵێکردبوو، بۆنی خوێی لەگەڵ خۆی هێنا. ئێستا شڵپەی شەپۆلان لەسەر تاشەبەردەکان بەوپەڕی روونیەوە دەبیسران.

تارۆ بە سادەیی گوتی:

ـ لەسەر یەك ئەوەی بۆ من سەرنجڕاکێشە ئەوەیە کە بزانم مرۆڤ چۆن پیرۆز دەبێ.

ـ بەڵام خۆ تۆ باوەڕت بە خودا نیە.

ـ وایە. تاقە شتێکی کە لێم روونە ئەوەیە کە دەکرێ بەبێ خوداش پیرۆز بیت.

لە نەکاو لەو لایەوە کە دەنگەکان هاتبوون رووناکاییەکی زۆر هەستا و داد و فیغانێکی لێڵ لەگەڵ شنەی با، گەیشتە گوێی ئەو دووانە. رووناکییەکە دەمودەست دامرکایەوە و دوورتر لەسەر لێواری هەیوانەکان تەنیا تیشکێکی سوور بەجێ ما. دەنگی زەنازەنای خەڵکەکە بە شنەیەکی بەقەوەت دا هات. دوایی دەنگی تەقەیەك و هاتوهاواری جەماوەر. تارۆ هەستابوو و گوێی هەڵخستبوو. ئیتر هیچیتر نەبیسرا.

ـ دیسان دەروازەکان وێککەوتن.

ریڤۆ گوتی:

ـ ئیتر تەواو بوو.

تارۆ لەبن لێوانەوە گوتی قەت تەواو نەبووە و دیسان قوربانی هەر دەبن. لەبەر ئەوەی تەکووزییەکە وا دەخوازێ.

دوکتۆر گوتی:

ـ لەوانەیە، بەڵام ئەمن زیاتر لەگەڵ شکستخواردووواندا خۆم بە هاودەرد دەزانم هەتا پیاوچاکان. پێموایە ئەمن زۆر کەیفم بە پاڵەوانێتی و پیرۆزایەتی نایە. ئەوەی، بەلامەوە بایەخی هەیە ئینسانیەت و مرۆڤبوونە.

ـ بەڵێ. ئێمە هەرکمان بە شوێن یەك شتەوەین، بەڵام ئەمن هەڕوگیڤم کەمترە.

ریڤۆ پێی وابوو کە تارۆ گاڵتەی دەکا، و سەیری کرد، بەڵام لەو ڕووناکاییە کزەی کە لە ئاسمانەوە دەهات روخسارێکی خەمبار و جیدیی بەدی کرد. با سەرلەنوێ هەڵی دەکردەوە و ریڤۆ لەسەر پێستی دەموچاوی هەستی کرد کە ئەو بایە گەرمای پێوەیە. تارۆ تەکانێکی لەخۆی دا و گوتی:

ـ دەزانی کە لە پێناوی دۆستایەتیماندا دەبێ چ بکەین؟

ریڤۆ گوتی:

ـ هەرچی بەڕێزت بفەرمووی.

ـ خۆ بە دەریا دادەین. ئەوە تەنانەت بۆ پیاوچاکێکی داهاتوو، چێژێکی شیاوە.

ریڤۆ بزەیەکی هاتێ.

ـ بەو پسوولەی هاتوچۆیانەی پێمانن، دەتوانین بچینە سەر ئەسکەلەکان. بە گشتی زۆر گەمژەییە کە مرۆڤ هەر لە تاعووندا بژی. هەڵبەت مرۆ دەبێ لە پێناوی قوربانیەکاندا خەبات بکا، بەڵام ئەگەر هیچ شتێکی دیکەی پێ خۆش نیە، ئیتر خەبات بە کاری چی دێ؟

ریڤۆ گوتی:

ـ بەڵێ، با بچین.

چەند چرکە دواتر ترۆمبیلەکە لە نزیك میلەکانی بەندەرگەکە راوەستا. مانگ هەڵاتبوو. ئاسمانی شیری سێبەرێکی کزی دەخستە هەموو لایەك. شار لە پشت سەریانەوە چین بە چین هەڵدەکشا و پشوویەکی گەرم و نەخۆشی لێ هەڵدەستا کە ئەوانی بەرەو دەریا دەبرد. بەڵگەکانیان پێشانی یەکێك لە کێشکەکان دا و ئەو ماوەیەکی دوورودرێژ لێیان وردبۆوە. تێپەڕینو بە زەوییە چەورێژکراوەکەدا کە پڕ بوو لە بەرمیل و بە نێو بۆنی شەراب و ماسیدا بەرەو ئەسکەلە وەڕێ کەوتن. برێك بەر لەوەی بگەنە ئەوێ، بۆنی خوێ و قەوزە هەواڵی دەریای هێنا. ئیتر دەنگیان بیست.

دەریا لەخوار تاشەبەردە گەورەکانی ئەسکەلەکەوە بە هێمنی دەیلووراند و کاتێك کە بەسەریاندا تێدەپەڕی، لەبەر چاوی ئەو دووانە لە مەخمەرێکی ناسك و ئاژەڵێکی هێمن و

لەسەرخۆ دەچوو. بەرەو دەریا لەسەر تاشەبەردەکان دانیشتن. ئاو بە هێمنی دەهاتە سەرو دەچۆوە خوارێ. ئەو پشووە هێمنەی دەریا بریسکەبریسکی وەئاوەکە دەخست و دەیسڕینەوە. لە بەرامبەریان دا، شەو بێ سنوور بوو. ریڤۆ کە لە بن قامکەکانی دا هەستی بە روخساری زیبکەزیبکەی تاشەبەردەکان دەکرد، هەستی بە بەختەوەرییەکی سەیر دەکرد. کاتێك رووی لە تارۆ کرد هەر ئەو بەختەوەرییەی لە روخساری هێمن و جیددیی هاوڕێکەیدا بەدی کرد کە تەنانەت پیاوکوشتنیش لەبیر ناکا.

خۆیان رووت کردەوە. لە پێشدا ریڤۆ چووە نێو ئاوەکەوە. کاتێك هاتە سەرێ هەستی کرد ئەو ئاوەی کە سەرەتا پێی سارد بوو ئێستا شلەتێنە. پاش چەند جووڵەیەك هەستی کرد کە ئەو شەوە دەریا شلەتێنە. شلەتێنیی دەریاکانی پاییزی کە گەرمای پاشکەوتکراوی مانگە گەرمەکان لە زەوی دەستێنێتەوە. بە رێکوپێکی و لەسەر یەك مەلەی دەکرد. جووڵەی لاقەکانی لە پشتەوەی کەف و تۆقلەی ساز دەکرد. ئاو بە شان و باهۆیدا دەهاتەخوارێ و دەگەیشتە لاقەکانی. دەنگی کەوتنی شتێکی قورس نیشانی دا کە تارۆ خۆی بە ئاوەکە داداوە. ریڤۆ خۆی خستە سەرپشت و بەرەو ئاسمان کە بە ئەستێرە داپۆشرابوو جووڵەی لە خۆی بڕی، ماوەیەکی زۆر پشووی هەڵکێشا، دوایی روونتر گوێی لە دەنگی ئەو زەبرانە بوو کە بە توندی وەئاوەکە دەکەوتن و هەستی بە بێدەنگی و خەڵوەتیی شەو کرد کە بە شێوەیەکی سەیر و سەمەرە هەستی پێدەکرا. تارۆ نزیك دەبۆوە گوێی لە دەنگی هەناسەکانی بوو. ریڤۆ وەرسووڕا، گەیشتە لای هاوڕێیەکەی و، هەر بەو خێراییەوە کەوتە مەلە کردن. تارۆ بە هێزێکی پترەوە بەرەو پێشەوە دەکشا،و ریڤۆ ناچار بوو کە خۆی گورجتر بکا. چەند خولەك دواتر بە یەك ریتم و یەك خێراییەوە، تەنیا و بە دوور لە هەموان و سەربەخۆ لە شار و تاعوون، بەرەوپێشەوە کشان. سەرەتا ریڤۆ راوەستا و بە هێمنی گەڕانەوە. هەتا ئەوکاتەی کە بەسەر تەوژمێکی توند و سارددا کەوتن. هەردووکیان بەبێ ئەوەی قسەیەك بکەن لە حاڵێکدا ئەو دیاردە چاوەڕواننەکراوە رایچڵەکاندبوون، بەپەلەتر و خێراتر رۆیشتن.

کاتێك شمەکەکانیان لەبەر کردەوە، بە بێ ئەوەی قسەیەك بکەن، گەڕانەوە، بەڵام هەردووکیان یەك هەستی وەك یەکیان هەبوو و، بیرەوەیی ئەو شەوەیان بۆ شیرین بوو. کاتێك لە دوورەوە

چاویان بە کێشکی تاعوون کەوت، ریڤۆ دەیزانی تارۆش وەك ئەو لە دڵی خۆیدا دەڵێ، نەخۆشی ئەوانی لەبیر کردبوو و ئەو ساتانە زۆر شیرن و خۆش بوون و ئێستا دەبوو دەست پێبکەنەوە.

بەڵێ پێویست بوو دەست پێ بکەنەوە و تاعوون هیچ کەسێکی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەبیر نەدەکرد. لە جەنگەی مانگی دیسێمبەردا تاعوون لە سینگی هاووڵاتییانی ئێمەدا بڵێسەی دەکێشا. کوورەی جەستە سووتاندنی هەر بە هەڵکراوی هێشتەوە، ئۆردووگاکانی پڕ کرد لە پەیکەرگەلێك بە دەستی بۆشەوەو هەر بەو هەڵسوکەوتە چاوقایمانەو رێکوپێکەی، لە پەرەگرتن نەکەوت. بەرپرسانی دەوڵەتی هیوادار بوون کە رۆژە ساردەکان پێش بەو پەرە گرتنە بگرن، لەگەڵ ئەوەشدا تاعوون بە بێ ئەوەی مێشێکی لێ میوان بێ، بە نێو مانگە ساردەکانی وەرز دا تێدەپەڕی. دەبوو دیسان چاوەڕێ بن و سەرانسەری شارەکەی ئێمە بە بێ ئەوەی هیوایەکی بە داهاتوو هەبێ دەژیا.

بەڵام دوکتۆر... ئەو چرکەساتە تیژ تێپەڕەی هێمنی و هاوڕێیەتی کە بە نەسیبی ببوو سبەینێ و داهاتوویەکی نەبوو. دیسانیش نەخۆشخانەیەکی تازەیان کردبۆووە و ریڤۆ جگە لە نەخۆشان سەروکاری لەگەڵ کەسیتر نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا تێگەیشت کە لەو قۆناغەی پەتاکەدا، لە حاڵێکدا تاعوون جاربەجار سیپەلکەکانی دادەگرێ، دەتگوت نەخۆشەکان بە شێوەیەك یارمەتیی دوکتۆر دەدەن. لەبری ئەوەی کە خۆیان بدەنە دەست بێ ئۆقرەیو شێتیی سەرەتای نەخۆشی، وێدەچوو کە روانگەیەکی درووستیان لەسەر بەرژەوەندیی خۆیان هەیە و هەڵسوکەوتێك بەسەر خۆیاندا دەسەپێنن کە بە قازانجیانە. بەردەوام داوای ئاویان دەکرد و خۆشیان گەرم دادەپۆشی. هەرچەندە رادەی شەکەتیی دوکتۆر فەرقێکی نەکردبوو، لەوەها دەرفەتگەلێکدا کەمتر هەستی بە تەنیایی دەکرد.

لە کۆتاییەکانی دیسێمبەردا، نامەیەکی لە لایەن ئاغای ئۆسۆنەوە کە هێشتا لە ئۆردووگا بوو پێ گەیشت. لێکۆڵەر لەو نامەیەدا دەیگوت کە سەردەمی دابڕگەیی ئەو کۆتایی هاتووە، بەرپرسانی دەوڵەتی رێکەوتی هاتنی ئەو بۆ ئۆردووگا نادۆزنەوە و وێدەچێ کە لەرادەبەدەر لە ئۆردووگادا رایانگرتبێ. ژنەکەی کە ماوەیەکە هاتووەتە دەرێ، لای پارێزگار نارەزایەتیی خۆی دەربڕیوە، بەڵام گوێیان پێ نەداوە و، گوتوویانە کە بە هیچ شێوەیەك هەڵە نەکراوە. ریڤۆ بە

رامبێری گوت تاوتوێی بکا و چەند رۆژ دواتر ئاغای ئۆسۆنی بینی کە هاتووەتە سەردانی. بەراستی هەڵە کرابوو و ئەوەش ریڤۆی توورە کرد، بەڵام ئاغای ئۆسۆن کە لاواز ببوو، دەستی لاوازی خۆی هەڵێنا و، لە حاڵێکدا کە زەختی لەسەر وشەکان دەکردەوە گوتی کە لەوانەیە هەموو کەسێك بە هەڵە بچێ. دوکتۆر تەنیا پێی وابوو کە شتێك لەودا گۆڕاوە. گوتی:

ـ گەرەکتە چ بکەی جەنابی دادوەر؟ دۆسییەکانت چاوەرێتن.

دادوەر گوتی:

ـ نەخێر، دەمویست داوای پشوو بکەم.

ـ پێویستە. تۆ دەبێ پشوو بدەی.

ـ نەك بەو مەبەستە, دەمویست بگەڕێمەوە ئۆردووگا.

ریڤۆ سەری سوورما:

ـ بەڵام خۆ تۆ تازە لەوێ هاتوویە دەرێ.

ـ ئەمن نەمتوانی مەبەستی خۆم بگەیەنم. پێیان گوتم کە کۆمەڵێك کارمەندی ئیدارەکان بە خۆبەخشی لەو ئۆردووگایەن.

دادوەر چاوە خڕەکانی برێك وەرسووڕاندبوو و دەیویست چەپکێك لە قژە قرژبووەکانی بخەوێنێتەوە.

ـ تێدەگەی، دەرفەتێکم دەبێ. و دوایی، هەرچەندە وتنەکەی بێ مانایە، کەمتر هەست بە دابڕانی کوڕەکەم دەکەم.

ریڤۆ سەیری دەکرد. لەوانەبوو کە لە نەکاو هێمنیەك لەو چاوە توورە و بێ هەستانەدا گوورابێ، بەڵام دەتگوت کە تەمێك بەسەر ئەو چاوانەدا کشابوو لە بریسکەبریسك کەوتبوون.

ریڤۆ گوتی:

ـ هەڵبەت، جا کە ئێستا تۆ حەزت لێیە جێبەجێی دەکەم.

دوکتۆر کارەکەی بۆ رێکخست و ژیانی شاری تاعوونلێدراو، هەتا نۆئێل هەر بەو جۆرە درێژەی هەبوو. تارۆ هێمنیی کارێگەری خۆی بۆ هەموو شوێنێ لەگەڵ خۆیدا دەبرد. رامبێر لای دوکتۆر دانی بەوەدا نا، کە لە سایەی دوو گەنجی کێشکچی‌دا لەگەڵ ژنەکەی بە دزییەوە نامەیان

گۆڕیوەتەوە. جاروبارە نامەیەکی بەدەست دەگەیشت. پێشنیاری بە ریڤۆ کرد کە کەڵك لە شێوازەکەی ئەو وەرگرێ و دوکتۆریش قەبوولّی کرد.پاش چەندین مانگی دووروودرێژ بۆ یەکەم جار نامەیەکی نووسی، بەڵام بە کێشەیەکی زۆرەوە. ئەو زمانێکی تایبەتی هەبوو کە ئێستا لە بیری چووبۆوە. نامەکە رۆیشت و گەڕانەوەی وەڵام زۆری خایاند. کۆتار وەك خۆی بەختەوەر بوو و خەریك بوو بە ساتوسەودای ورد ورد دەوڵەمەند بێت، بەڵام گرانت ... رۆژەکانی جێژن سەرکەوتنێکی بۆ ئەوە بە دواوە نەبوو.

نۆئێلی ئەو ساڵە لەبری ئەوەی کە جێژنی ئینجیل بێت زیاتر جێژنی دۆزەخ بوو. دووکانە بەتاڵ و بێبەش لە رووناکییەکان، نوقڵ و شیرینیی تەزویر یا سندووقی بەتاڵی نێو جامخانەکان، شەمەندەفەری پڕ لە روخساری تێکسمڕاو، هیچکام لەوانە وەبیرهێنەرەوەی جێژنەکانی پێشوو نەبوون. لەو جێژنەدا کە جاری جاران هەموو خەڵك، بە هەژار و دەوڵەمەندەوە لێك کۆدەبوونەوە، هیچ شتێك لەگۆڕێ نەبوو جگە لەوەی کە دەوڵەمەندان بۆ چەند خۆشییەکی پڕ لە شەرمەزاری و تایبەتی لە قوژبنە بچووکەکاندا بە نرخێکی زۆر شتێکیان بۆ خۆیان ساز دەکرد. کلێسەکان لەبری ئەوەی پڕ بن لە چاکەکاری پڕاوپڕ بوون لە ناڵەناڵ. لە شاری خەم لێ نیشتووی سەهۆڵێندا چەند منداڵ، بێ ئاگا لەو شتەی کە هەڕەشەیان لێ دەکا، رایان دەکرد، بەڵام کەس نەیدەوێرا کە بوونی ئەو خودایەی ساڵانی پێشوویان پێ رابگەیەنێ کە دیاریی دەبەخشییەوە و وەکوو ئازارەکانی مرۆڤێکی بەساڵاچوو و وەکوو هیواکانی گەنجان نوێ بوو. ئیتر دڵی هیچ کەسێك جێگەی هیچ شتێکی تری نەدەبۆوە. مەگەر بۆ هیوایەکی زۆر کۆنو زۆر رەش، هیوایەك کە ناهێڵێ خۆی بهاوێتە نێو ئامێزی مەرگەوە و تەنیا بریتییە لە لاسارییەك بۆ ژیان.

گرانتی پیر نەچووبووە سەر ئەو بەڵێنەی کە دابووی. ریڤۆ کە نیگەران بوو، بەیانی زوو چووبووە ماڵەکەی و نەیدۆزیبۆوە. هەمووان بەو مەسەلەیەیان زانیبوو. دەوروبەری سەعات ١١ رامبێر هاتە نەخۆشخانە و دوکتۆری ئاگادار کردەوە کە لە دوورەوە گرانتی دیتووە کە بە روخسارێکی شێواوەوە بە کۆڵاناندا خولاوەتەوە. دوایی لێی ون بووە. دوکتۆر و تارۆ بە سەیارە وەشوێنی کەوتن.

نیوەڕۆ، لە هەوای سەهۆڵێندا، ریڤۆ لە ترۆمبیلەکەی دابەزیبوو و لە دوورەوە سەیری گرانتی دەکرد کە پاڵی بە جامخانەیەکەوە دابوو. ئەو جامخانەیە پڕ بوون لە لەیستۆك (ملعبە)ی وا کە بە

ناشیگەری ساز کرابوون. لەسەر روخساری کارمەندە پیرەکە، فرمێسك بە خوڕ دەهاتنە خوارێ و ئەو فرمێسکانە ریڤۆیان دەشێواند، چونکە لێیان تێدەگەیشت و قوڕگی دەگوشرا.

ئەو جێژنی دەسگیرانداریێتییەکەی ئەو چارەڕەشەی وەبیر هاتبۆوە ئەو کاتەی لە بەردەم دووکانێکی لەیستۆکی نۆئێل دا "ژیان" خۆی بۆ نووشتاندبۆوەو گوتبووی قایلە. گومان لەوەدا نەبوو کە لە قوولآیی ئەو هەمووە ساڵەوە، تەنانەت لە ناخی ئەو ترس و سەرشێتییەدا، دەنگی شیرنی ژیان دەگەیشتە گوێی گرانت. ریڤۆ دەیزانی ئەو پیرەمێردەی کە دەگری ئێستا لە چ دۆخێك دایە و ئەویش خۆی وەك گرانت پێی وابوو کە ئەم دنیا بێ ئەڤین و خۆشەویستییە وەکوو جیهانێکی مردوو و بەردەوام کاتی ئەوە دێ کە مرۆڤ لە بەندیخانە و کار و هەوڵدان ماندوو دەبێ و داوای روخسار و دڵێك دەکات، کە لەبەر مێهرەبانی و دلۆڤانی پشکووتبێ.

بەڵام گرانت لە ئاوێنەی جامخانەکەدا ئەوی بینی. بە بێ ئەوەی لەگریان بکەوێ گەڕایەوەو پاڵی وە جامخانەکە دا و سەیری هاتنی ئەوی کرد. دەیگوت:

ـ ئاخ دوکتۆر، ئاخ.. دوکتۆر...

دوکتۆر بەمەبەستی هاودەردیکردن سەری بۆ لەقاند و قسەی پێ نەکرا. ئەو داماوییە داماوی و چارەڕەشیی خۆیشی بوو و ئەوەی لەو چرکەساتەدا دڵی ئەوی رێکدەگوشی تووڕەییەکی بێ سنوور بوو ك لە بەرامبەر ئازاری هاوبەشی تەواوی مرۆڤەکاندا تووشی مرۆ دەبێ. گوتی:

ـ بەڵێ گرانت.

ـ دەمویست ئەوەندەم کات هەبێ کە نامەیەکی بۆ بنووسم. بۆ ئەوەی ئەو بزانێ...و بتوانێ بەبێ پەژیوانی، بەختەوەر بێ.

ریڤۆ بە پاڵ پێوەنان گرانتی وەپێش خۆی دا. لە حاڵێکدا کە خۆی شل کردبوو بۆ ئەوەی دوکتۆر بە راکێش راکێش لەگەڵ خۆی بیبا بە پرتەپرت گوتی:

ـ ئەوە زۆر لە مێژە ئەو رەوشە درێژەی هەیە. مرۆڤ حەز دەکا خۆی بەدەستەوە بدا. ئاخ دوکتۆر، ئاوا ئاسوودەم، بەڵام بۆوەی هەمیشە حاڵەتێکی ئاساییم هەبێ پێویستیم بە هێزێکی پترە. ئێستا زیاتریش.

لە حاڵێکدا تەواوی گیانی دەلەرزی و بڵێسەی ئاگری لە چاوانی دەبۆوە، ڕاوەستا. ریڤۆ دەستی گرت. لە "تا" دا خەریك بوو دەسووتا.

ـ دەبێ بگەڕێیتەوە ماڵەوە.

بەڵام گرانت خۆی لە دەستی ڕاپسکاند و چەند هەنگاوێك ڕایکرد، دوایی ڕاوەستا، باسکەکانی لێك کردنەوە و خۆی گرمۆڵە کرد، بە دەوری خۆیدا سووڕایەوە و لەسەر عەرزە بەستووەکە تلایەوە. ڕوخساری بە فرمێسکەکانی خووسا. ڕێبواران لە نەکاو ڕاوەستانۆ لە دوورەوە سەیریان دەکرد، بەڵام نەیاندەوێرا بێنە پێشتر. ریڤۆ ناچار بوو پیرەمێرد لە باوەش بکا.

ئێستێ گرانت لە قەرەوێڵەکەی خۆی دا پشووی سووار ببوو. پەتاکە پەلاماری سییەکانی دابوو. ریڤۆ لە بیرەوە چووبوو. کارمەندی شارەوانی بنەماڵەی نەبوو. ڕاگواستنی ئەو بۆ نەخۆشخانە چ قازانجێکی هەبوو؟ هەر خۆی بە تەنیایی و بە یارمەتیی تارۆ دەیتوانی چاوی بەسەرییەوە بێ...

گرانت بە ڕوخساری ڕەشداگەڕاو و چاوی کزەوە، بە قووڵایی بالیفەکەدا ڕۆچووبوو. چاوەکانی بڕیبووە ئەو ئاورە کەمەی کە تارۆ بە تەڵاشەداری سندووقێکی شکاو لە کوانووەکەدا دایگیرساندبوو. دەیگوت:" باش نیم". و لەگەڵ هەر قسەیەکی کە دەیکرد، خشەخشێکی سەیر لە ناخی سییەکانیەوە دەهاتە دەرێ ریڤۆ پێشنیاری پێکرد و گوتی دەڕوا، بەڵام دەشگەڕێتەوە. بزەیەکی نامۆ نیشتە سەر لێوەکانی نەخۆشەکەو نەرمو نیانیەك لە ڕوخساریدا دەرکەوت. بە زۆری چاوێکی داگرت و گوتی:" ئەگەر زیندوو دەرچووم کڵاوەکەت هەڵگرە و کرنۆش بەرە."بەڵام دوای ئەو قسەیە دەمودەست کەوت و لەخۆ چوو.

چەند سەعات دواتر کاتێك ریڤۆ و تارۆ گەڕانەوە لای نەخۆشەکە، دیتیان لەسەر قەرەوێڵەکەی ئاخێزی کردووە. ریڤۆ بە دیتنی هەڵچوونی نەخۆشییەکەی کە خەریك بوو گڕی تێبەردا، تۆقی، بەڵام گرانت گەشبینتر دیار بوو و لەڕێوە، بە دەنگێکی کە بە شێوەیەکی سەیرو سەمەرە بۆش بوو داوای لێکردن ئەو نووسراوەیەی بۆ بێنن کە لە یەکێك لە چەکمەجەکانی نابوو. تارۆ کاغەزەکانی دایە دەستی. گرانت بە بێ ئەوەی سەیریان بکا بە سینگییەوە نان، دوایی دانی بە دوکتۆر و داوای لێکرد بیانخوێنێتەوە. نووسراوەیەکی کورت

بوو، لە پەنجا لاپەڕەیەکدا. دوکتۆر هەڵی داوە و، تێگەیی کە لە تەواوی ئەو لاپەڕانەدا ڕستەیەك دووپاتە بۆتەوە، دەستی تێوەردراوە و ڕاستەوپاستە کراوە یا شێوێنراوە. بە دوای یەکدا مانگی مەی، ژنێکی سوارچاك و، شەقامەکانی دارستانی چڕ، بە شێوەی جۆراوجۆر لە پاڵ یەکترەوە دانرابوون. هەروەها نووسراوەکە کۆمەڵێك تێبینیشی لەسەر بوون کە جاری وابوو لەرادەبەدەر دوورودرێژ بوون و دیسانیش بەشێوەی جۆرا وجۆر، بەڵام لە کۆتایی دوایین لاپەڕەدا، دەستێکی کارامە بە مەرەکەبێك کە هێشتا تازە بوو نووسیبووی:"ژیانی زێدە ئازیزم، ئەمڕۆ نۆئێلە..."و لەسەرەوەی بە خەتێکی زۆر جوانو بەوپەڕی سەرنجەوە دوایین ڕستە دەبینرا. گرانت گوتی:"بیخوێننەوە."و دوکتۆر خوێندییەوە:

" لە بەرەبەیانیەکی مانگی مای دا، ژنێکی سوارچاکی تەرپۆش، بە سواری ماینێکی کوێت، بەنێو گوڵاندا و بە شەقامەکانی دارستاندا تێدەپەڕی..."

کابرا پیرە بەدەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

ـ ئەوەیە؟

سەیری ریڤۆی کرد. گرانت لە حاڵێکدا کە هەژابوو، گوتی:

ـ ئای، دەزانم. جوان، جوان... ئەوە ئەو وشەیە نیە کە من دەمویست.

ـ لێی گەڕێ دوکتۆر... کاتی ئەوەم نیە...

سینگی بە زەحمەت هەڵدەستا و دەنیشتەوە و لە نەکاو گوڕاندی:

ـ بیسووتێنن...

دوکتۆر دڕدۆنگ بوو، بەڵام گرانت بڕیارەکەی خۆی ئەوەندە بە توندی و بە وەها ئازارێکەوە دووپاتە کردەوە، کە ریڤۆ لاپەڕەکانی خستە نێو ئەو ئاگرەوە کە خەریك بوو دادەمرکایەوە، ژوورەکە لەپڕ ڕووناك بۆوە و گەرمایەکی تێپەڕ هەست پێکرا. کاتێك دوکتۆر ئاوڕی لە نەخۆش دایەوە، کابرا پیرە پشتی تێکردبوون و دەموچاوی وەدیوارەکە دەخشان. تارۆ کە دەتگوت بەو دیمەنە نامۆیە لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەی دەکرد. پاش لێدانی سیرۆمەکە ریڤۆ بە هاوڕێکەی گوت کە گرانت ئەمە شەو ڕۆژ ناکاتەوە و تارۆ پێشنیاری کرد لەوێ بمێنێتەوە. دوکتۆر قەبوولی کرد.

شەوێ هەتا بەیانی بیرکردنەوە لەوەی کە گرانت لەسەرە مەرگ دایە مێشکی داگیر کرد، بەڵام بەیانی ریڤۆ گرانتی لە حاڵێکدا بینی کە لە سەر قەرەوێڵەکەی دانیشتووە و لەگەڵ تارۆ قسان دەکا.. "تا"یەکە تەواو ببوو. تەنیا شوێنەواری بێهێزییەکی گشتی مابۆوە. کارمەندەکەی شارەوانی دەیگوت:

ـ ئاخ دوکتۆر، ئەمن هەڵەم کرد، بەڵام دیسانیش دەنووسمەوە. هەموویم لەبیرە. ئەوە دەشیبینی.

ریڤۆ بە تارۆی گوت:

با جارێ چاوەڕێ بین.

بەڵام نیوەڕۆش هیچ شتێ نەگۆڕابوو. لە کۆتایی رۆژدا دەکرا بڵێی کە گرانت نەجاتی بووە. ریڤۆ هیچ سەرەدەری لەو رابوونە دەرنەدەکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەر لەو سەروبەندەدا، نەخۆشێکیان هێنایە لای ریڤۆ کە دوکتۆر بە دیتنی ئیتر هیوای بە چاکبوونەوەی نەبووو هەر لەگەڵ ئەوەی گەیشتێ گوتی لەوانیتری جوێ بکەنەوە. کچە گەنجە وڕێنەی دەکرد و تەواوی نیشانەکانی تاعوونی سیپەلك تێیدا دەرکەوتبوو، بەڵام رۆژی دواتر تای دابەزیبوو. دوکتۆر سەبارەت بەوەشیان هەروەکی مەسەلەی گرانت پێی وابوو داکشانی سەرلەبەیانیە و ئەزموونی فێری ئەوەی کردبوو کە ئەو دابەزینی نەخۆشییە بە نیشانەیەکی مەترسیدار بزانێ. لەگەڵ ئەوەشدا، کاتی نیوەڕۆ "تا"یەکە بەرز نەبۆوە. شەوێ چەند پلەیەك چووە سەرێ و بۆ بەیانی شوێنەواری تا نەما. کچە گەنجەکە لەگەڵ ئەوەدا کە لاواز ببوو لە سەر جێگەکەی بە ئاسانی هەناسەی دەکێشا. ریڤۆ بە تارۆی گوت کە نەخۆش بەپێی تەواوی یاسا و بنەماکان، رزگار بووە، بەڵام هەرئەو رۆژە تا ئێوارێ چواری دیکەی لەو چەشنەیان هێنایە لای دوکتۆر ریڤۆ.

لە کۆتایی هەر ئەو حەوتووەدا، پیرەمێردە پشووسووارەکە، لە حاڵێکدا کە شوێنەواری هەڵچوونێکی بە تەوژمی تێدا بەدی دەکرا، بانگی دوکتۆر و تارۆی کرد. دەگوت:

ـ جێبەجێ بوو، دیسان خەریکن دێنەوە.

ـ کێ؟

ـ مشکەکان.

له مانگی ئەپریل بەولایەوە هیچ مشکێکی مردوو نەدۆزرابۆوە. تارۆ بە ریڤۆی گوت:

ـ یانی سەر لەنوێ دەست پێدەکاتەوە؟

پیرەمێرد دەستەکانی لێکدەخشاند:

ـ خۆزگە دەتدی چۆن رادەکەن. ئای کە خۆشە.

ئەو دوو مشکی زیندووی دیتبوو کە لە کۆڵانەوە هاتبوونە نێو ماڵەکەیەوە. دەروجیران پێیان راگەیاندبوو کە مشك لە ماڵی ئەوانیشدا دەرکەوتوون. لە هێندێ لە قەفەزەکاندا ئەو دەنگانە دەبیسرانەوە کە چەندین مانگ بوو لەبیر چووبوونەوە. ریڤۆ چاوەڕێی ئاماری گشتی بوو، کە لە سەرەتای هەر حەوتوویەکدا بڵاو دەبۆوە. ئامارەکە نیشاندەری پاشەکشێی نەخۆشییەکە بوو.

هەرچەندە ئەو پاشەکشێ لەنەکاوەی پەتاکە چاوەڕواننەکراو بوو، بەڵام هاووڵاتییەکانی ئێمە بۆ شادی و خۆشحاڵی پەلەیان نەکرد.

ئەو مانگانەی کە بەڕێیان کردبوون لەگەڵ ئەوەدا کە تاسە و ئاواتی ئازادیی تێدا بەهێز کردبوون لە هەمانکاتدا ئەوانی فێری پارێزو دووربینی کردبوو. وایان لێهاتبووکە هیوایەکی ئەوتۆیان بەوە نەبایە کە نەخۆشییەکە بەو زووانە کۆتایی بێ.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دیاردە نوێیە زار بە زار دەگەڕا و لە ناخی دڵەکاندا هیوایەکی گەورەی دەژیاندەوە کە دەرنەدەبڕدرا. تەواوی شتەکانی دیکە کەوتبوونە پلەی دووەمەوە. لە تەنیشت ئەم رووداوە سەیروسەمەرەیەدا ئیتر گرینگی بە قوربانیەکانی دیکەی تاعوون نەدەدرا. هەرچەندە خەڵك بە روونی هیوایەکیان بە رۆژانی تەندرووستی و لەشساخی نەمابوو، بەڵام لەگەڵ هەمووی ئەوانەدا بەدزییەوە چاوەڕوانی بوون و یەکێك لە نیشانەکانیشی ئەوە بوو کە هاووڵاتیانی ئێمە هەر لەو ساتەوە دەستیان کرد بە قسەکردن لەسەر ئەوەی کە دوای تاعوون، چۆن بە ژیانیان رادەگەن و دەیڕازێننەوە.

تەواوی خەڵك لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە ئاسوودەیی ژیانی رابردوو دەسبەجێ دەستەبەر نابێتەوە و کاولکردن زۆر لە نۆژەنکردنەوە ئاسانترە.

تەنیا هیوادار بوون بەوەی کە مەسەلەی خۆراك لەوانەیە بڕێك باشتر بێ، و بەوجۆرە خەڵك لەدەست نالەبارترین کێشەکان نەجاتیان بێ، بەڵام بە کردەوە، لە بن پەردەی ئەو دەربڕینە هێوری دەرانەدا، هیوایەکی بێ جێ، لەنەکاو و بە وەها تەوژمێکەوە هەوساری دەپچڕاند کە هاووڵاتییەکانی ئێمە جاری وابوو تێدەگەیشتن و بە پەلە بە یەکتریان دەگوت کە بەهەرحاڵ نابێ بەو هیوایە بین کە لە ماوەی یەك دوو رۆژ دا نەجاتمان بێ.

لە راستیشدا، تاعوون لە ماوەی یەك دوو رۆژان دا رانەوەستا، بەڵام وادیار بوو کە خێراتر لەوەی چاوەڕوانیی لێ دەکرا لە کزیی دا (بەرەو کزبوون چوو). لە جەنگەی یەکەم رۆژەکانی ژانویەدا، سەرما لاسارییەکی بێوێنە دەرگای بە خەڵك گرت و دەتگوت بەسەر شارەوە درەوشاوەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئاسمان قەت قەت ئەوەندە شین نەبووە. رۆژە یەك لە دوای

یەکەکان، درەوشانەوەی نەگۆڕ و سەهۆڵینی، شارەکەمانی لە نووریکی بەردەوامدا نوقم کرد. لەو سامالەدا، تاعوون لە ماوەی سێ حەوتوودا و بە دابەزینی بەردەوام، وەك بڵێی لەو تەرمانەدا دەتوایەوە کە رۆژ بە رۆژ لە کەمیی دەدا. دەکرێ بڵێی تەواوی ئەو هێزەی کە بە درێژایی مانگەکان بەدەستی هێنابوو لە ماوەیەکی کورتدا لەدەستی دەدا. لەکیسدانی نێچیرگەلێکی بژاردەی وەکوو گرانت یا ئەو کچە گەنجەی هێنابوویانە لای ریڤۆ، هەڵچوونی لە هێندێ گەڕەکدا بۆ ماوەی دوو یا سێ رۆژ و لە هەمانکاتدا ونبوونی لە گەڕەکەکانی دیکەدا، زیادکردنی قوربانیەکانی دووشەممەوان و بە پێچەوانەوە وەلانانی تەواوی قوربانیەکانی چوارشەممەوان، و بەو شێوەیە تێن تێدانەمان و لەبڕستکەوتن یا بەهەشتاوبوونەکەی، سەلمێنەری ئەوە بوو، کە تاعوون بە هۆی تووڕەیی و شەکەتییەوە خەریك بوو لە گرێژەنە دەچوو و لە هەمانکاتدا کە ئیتر نەیدەتوانی بەسەر خۆیدا زال بێ، کاریگەریی ئاکاری لێبڕاوانەشی کە نوێنەری دەسەڵاتەکەی بوو، لەنێو دەچوو. سیرۆمەکەی کاستێل بەردەوام کۆمەڵێك سەرکەوتنی دەستەبەر دەکرد کە تا ئەوکات پێی نەبڕابوو. هەرکام لە هەوڵەکانی پزیشکان، کە پێشتر ئاکامێکی لێ نەکەوتبۆوە، لەپڕ ئاکامی لێبڕاوانەی لێ دەکەوتەوە. وێدەچوو کە تاعوون گەمارۆ درابێ و لاوازییە لە نەکاوەکەی، هێزی نابێتە بەر تەواوی ئەو چەکانەی کە هەتا ئەو رۆژە لەبەرامبەریدا بێهێز بوون. تەنیا جارنەجارێك، پەتاکە قوت دەبۆوەو بە قەڵەمبازێکی کوێرانە، سێ چوار لەو نەخۆشانەی کە بەرەو چاکبوونەوە دەچوون، لەگەڵ خۆی دەبرد. ئەوانە بێ شانسەکانی سەردەمی تاعوون بوون کە نەخۆشی هاوکات لەگەڵ هیواو ئارەزوو گیانیشی دەستاندن. ئۆسۆنی لێکۆڵەر، وای بەسەر هات و تەرمەکەیان لە ئۆردووگای دابڕگە بردە دەرەوە. تارۆ گوتی ئەو شانسی نەبوو و دیاریش نەبوو بیر لە مەرگی ئەو دەکاتەوە یا لە ژیانی.

بەڵام بە گشتی چڵك و چەپەڵ لەهەموو لاوە لە پاشەکشێ دابوو، و راگەیەندراوەکانی شارەوانی کە سەرەتا هیوایەکی ناروون و نهێنییان بەخشیبوو، ئاخری ئیمان و باوەڕی لە دڵی خەڵك دا چێ کرد بەوەی کە سەرکەوتوون و نەخۆشیو پەتا خەریکە باروبنەی دەپێچێتەوە. لە راستیدا دانانی ناوی سەرکەوتن لەسەر ئەو رەوشە زۆر ئەستەم بوو. تەنیا ناچار بوون ئەوە پشتراست بکەنەوە کە پەتا وەکی هاتبوو ئاواش دەڕوا. ئەو رەوشەی کە بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵیدا رەچاو دەکرا نەگۆڕابوو،

تەنیا ئەو شێوازانەی کە تا دوێنێ کاریگەرییان نەبوو ئەمڕۆ ئاکامیان لێ دەکەوتەوە. تەنیا وێدەچوو کە نەخۆشییەکە خۆی ماندوو بووە و یا دوای گەیشتن بە تەواوی مەبەستەکانی ئیتر دەکشێتەوە. یا بەواتایەکی تر، ئەو ڕۆڵەی هەیبووە بە کۆتایی گەیشتووە.

لەگەڵ ئەوەدا دەکرێ بڵێی کە هیچ شتێ لە شاردا نەگۆڕابوو. کۆڵانەکان کە لە ڕۆژدا بەردەوام چۆڵ بوون دیسان شەوانە پڕ دەبوونەوە لە جەماوەر، بەو جیاوازییەوە کە زۆربەیان باڵتۆیان لەبەرو ملپێچیان لە مل دابوو. سینەما و کافتریاکان بەردەوام پڕ و چۆڵ دەبوونەوە، بەڵام کە لە نزیکەوە سەرنجی خەڵکت دەدا، دەتدی کە ڕواڵەتیان گەشتر بۆتەوە و جاروبارە پێدەکەنن و ئەوەش دەرفەتێك بوو بۆ تێگەیشتن لەو خاڵە کە هەتا ئەوکاتە کەس لە کۆڵانەکاندا پێنەدەکەنی. لە ڕاستی دا، ئێستا کەلێنێك کەوتبووە ئەو پەردە مات و ڕەشەی کە لە چەند مانگ لەوەپێشەوە بەدەوری شار دا کێشابوویان، و هەموو دووشەمووان، بە بیستنی هەواڵەکانی ڕادوێ هەموو کەسێك تێدەگەیشت کە ئەو کەلێنە گەورەتر دەبێتەوە و بە گشتی ئەو دەتوانێ هەناسە بکێشێ. دیسان ئەو هێورکردنەوەیە، جۆرە هێورکردنەوەیەکی خراپ بوو و، بە ڕوونی دەرنەدەبڕدرا. تەنیا ئەگەر لەوە پێش دەگوترا، شەمەندەفەرێك ڕۆیشتووە یا پاپۆڕێك گەیشتووە یا ڕێگە بە ترۆمبیل دراوە هاتوچۆ بکەن، هیچ کەس باوەڕی نەدەکرد، بەڵام ڕاگەیاندنی ئەو مەسەلانە لە نیوەی ژانویەدا نەبووە مایەی هیچ سەرسووڕمانێك. بێ گومان ئەو دەرفەتگەلە کەم بوون، بەڵام هەر ئەو گۆڕانە بچووکە نیشاندەری کۆمەڵێك پێشکەوتنی گەورە بوو کە هاووڵاتیانی ئێمە بەرەو هیواو ئاواتەکانیان وەدەستیان هێنابوو. لە لایەکی دیکەوە دەکرێ بڵێی لەو کاتەوە کە بچووکترین هیواکان لە دڵی خەڵکدا گووران، دەسەڵاتی سەقامگرتووی تاعوون کۆتایی هات.

لە سەرانسەری مانگی ژانویەدا، هاووڵاتییەکانی ئێمە هەڵسوکەوتی دژواز و ناتەبایان هەبوو. جاری وابوو شاد و بە کەیف بوون و جاری واش بوو کە لە خەم و پەژارەدا بوون. بەوشێوەیە تەنانەت لەوکاتانەدا کە ئامارەکانی تاعوون دۆخێکی لەباریان نیشاندەدا، دیسانیش کەسانێك ڕایان دەکرد. ئەو ڕەوشە بەرپرسانی حکوومی و تەنانەت کێشکچییەکانیشی تووشی سەرسووڕمان کردبوو. لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەو ڕاکردنانە بە ئاکام گەیشتن، بەڵام ئەوانەی کە لەو چرکەساتانەدا

رایان دەکرد، بە دوای هەستە ئاساییەکانی خۆیان دا دەڕۆیشتن. لە ناخی هێندێکیان دا، بە هۆی تاعوونەوە، ڕەشبینیەکی ئەوتۆ ڕەگی داکوتابوو کە نەیاندەتوانی خۆی لیٚ دەرباز بکەن.

هیوا لە دڵی ئەواندا شوێنێکی نەدەدۆزییەوە. تەنانەت ئەوکاتەش کە سەردەمی تاعوون بەسەر چووبوو، ئەوان بە پێی پێوەرەکانی خۆیان دەژیان. ئەوان لە کاروانی ڕووداوەکان بە جیٚ مابوون. بە پێچەوانەوە ژمارەیەکی دیکە بە تایبەتی ئەوانەی کە هەتا ئەوکاتە لە خۆشەویستەکانیان دابڕابوون دوای ئەو قۆناغە دوورودرێژەی دوورەپەرێزی و بیٚ هیوابییە، بە هەڵکردنی شنەی هیوا، ئاگری بیٚ ئۆقرەیی لە ناخیاندا بە جۆرێك کڵپەی سەندبوو کە هەرچەشنە هێزێکی بەسەرخۆدا زاڵبوونیان لەدەست دابوو. بە بیرکردنەوە لەوەی کە لە مەودایەکی ئەوها نزیك لە مەبەست، لەوانەیە بمرنو چاویان بەو بوونەوەرە نەکەوێتەوە کە خۆشیان دەویٚ، و ئازارە دوورودرێژەکانیان بیٚ ئاکام بمێنێتەوە، جۆرە ترسێك بەسەریاندا زاڵ دەبوو. ئەوەی کە ترس‌وبیٚ هیوایی نەیتوانیبوو تێکی بشکێنیٚ و لە ماوەی چەندین مانگدا بە پێداگرییەکی ناروون سەرەڕای بەندیخانەو غوربەتی بەردەوام رایانگرتبوو بە یەکەم نیشانەی هیوا دارِما. شێتانە پەلەیان کرد کە وەپێش تاعوون بکەون. چونکە ئیتر هێزی ئەوەیان لەبەردا نەمابوو کە هەتا دوا چرکە شانبەشانی لەگەڵیدا بڕۆن.

لە لایەکی دیکەوە، هەر لەوکاتەدا، نیشانەکانی گەشبینی لەخۆوە وەدەرکەوتن، بە جۆرێك کە نرخەکان بە شێوەیەکی هەستپێکراو دابەزین. لە ڕووی ئابوورییەوە، ئەو بزووتنەوەیە هیچ هۆکارێکی نەبوو. کێشەکان هەروەکوو خۆیان مابوونەوە، دامودەستووری دابڕگەکان لەبەردەم دەروازەکان هەر وەکی خۆیان بوون، دابینکردنی پێویستییەکان بەوزووانە جێبەجیٚ نەدەبوو. کەوابوو ئەوە جۆرە دیاردەیەکی مەعنەوی بوو کە پاشەکشەی تاعوون لە هەموو شوێنێك دا هێنابوویە ئاراوە. لەکاتی گەشبینیدا سەردانی ئەو کەسانەی دەکرد کە پێشتر بەکۆمەڵ دەژیانو پەتا ناچاری کردبوون لێك دابڕێن. دوو کەنیسەی شار سەر لەنویٚ ساز کرابوونەوەو ژیانی هاوبەش دەستی پێکردەوە. ئەو ڕەوشە سەربازەکانیشی گرتەوە و ناچاری کردن سەرلەنویٚ ئەوانی لەو سەربازخانانەدا کۆ کردنەوە کە ماوەیەك بوو لێی رزگار ببوون و ئیتر ژیانی سەربازگەیی دەستی پێکردەوە. ئەو ڕووداوە بچووکانە نیشانەگەلێکی گەورە بوون.

خەڵك هەتا ڕۆژی بیست و پێنجی ژانویە لەو هەژانە شاراوەیەدا ژیان. لەو حەوتووەدا، ئامارەکان ئەوەندە هاتنەخوارەوە کە دوای ڕاوێژی کۆمیسیۆنی پزیشکی پارێزگاری ڕایگەیاند کە دەکرێ بڵێی پەتاکە ڕاوەستاوە هەڵبەت ڕاگەیەندراوەکە ئەوەشی زیاد دەکرد کە بۆ پارێزکردن ـ کە دیارە خەڵکیش پێیان باش بووـ بۆ ماوەی دوو حەوتووی دیکە دەروازەکانی شار هەڵناگیرێن‌و ڕێوشوێنە تەندرووستییەکان بۆ ماوەی دوومانگی دیکەش هەر بەڕێوە دەچن. لەو ماوەیەدا، بچووکترین نیشانەیەك کە هێمایەك بێ لە گەڕانەوەی پەتاکە،" دەبێ Ststuquo ڕەچاو بکرا و ڕێساکان بگەڕێنەوە سەر دۆخی پێشوو." لەگەڵ ئەوەشدا خەڵك هەمووان ئەو نیشانانەیان بە شتگەلێکی ڕواڵەتی دەزانی‌و دەمەوئێوارەی ۲۵ی ژانویە، جموجۆڵێکی پڕ لە خۆشی شاری تەنیەوە. پارێزگار بۆوەی هاوبەشی شادی‌و خۆشییەکانی خەڵك بێ فەرمانی دا ڕووناکیی سەردەمی تەندرووستی بدەنەوە بە شار. لە بن ئاسمانی سارد و سامالدا خەڵکی شارەکەی ئێمە دەستە دەستە و لێو بە بزە، بە کۆڵانە ڕووناکەکان وەربوون.

دیارە دەرگای زۆربەی ماڵەکان بە داخراوی مانەوەو هێندێ بنەماڵە هەبوون کە بە بێ دەنگییەوە ئەو شەوانەیان تێپەڕاند کە خەڵکی تر بە چەپڵەڕێزان و شادی بەسەریان برد. لەگەڵ ئەوەدا هێمنیەکی قووڵیش بۆ ئەو بوونەوەرە ماتەمینانەش لەگۆڕێدا هەبوو. جا ئیتر لەبەر ئەوە بووبێ کە ئەو ترسە نەمابوو کە نەکا ئەندامانی دیکەی بنەماڵەش تووش بن یا لەبەر ئەوە بووبێ کە ئیتر خۆیان لەبەردەم هەڕەشەو مەترسیدا نەدەبینی، بەڵام ئەو بنەماڵانەی کە لە هەمووان پتر بەو شادی و خۆشییە گشتییە نامۆ بوون ئەوانە بوون کە لەو ساتەش دا، لە نەخۆشخانە نەخۆشێکیان هەروا لە بن چنگی تاعوون دا هەبووو لە دابڕگە و ماڵەکانی خۆیان دا چاوەڕێی ئەوە بوون کە تاعوون هەروەکی دەستی لەوانی تر هەڵگرتبوو بەرۆکی ئەوانیش بەربدا.

دیارە ئەو بنەماڵانەش هیوایەکیان هەبوو، بەڵام بە پارێزەوە ئەو هیوایەیان لە دڵیاندا ڕادەگرت و نەیاندەویست بەر لەوەی بەراستی حەقیان بێ کەڵکی لێوەرگرن. ئەو چاوەڕوانییەش ئەو شەونخوونیە کپە لە نیوەڕێگەی ئاویلکەدان و شادی و لە نێو جێژنی گشتیدا، بۆ ئەوان بەژانتر دیار بوو.

بەڵام ئەو ریزپەڕانە هیچ شتێکی لە شادیی ئەوانیتر کەم نەدەکردەوە. بێ گومان، تاعوون هێشتا کۆتایی نەهاتبووو زۆر زووش ئەوەی دەسەلماند. سەرەڕای ئەوەش هەر لەو ساتەوە لە

تەواوی دڵەكان دا، چەند حەوتوو بەر لە كاتی خۆی، شەمەندەفەرەكان لەسەر هێڵە ناكۆتاكان وەڕێدەكەوتن‌و پاپۆڕەكان دەریا درەوشاوەكانیان دەپێوا. دیارە بۆ سبەینێ دڵەكان ئەهوەنتر دەبوونەوە و دڕدۆنگییەكان دیسان دەگەڕانەوە سەر جێی خۆیان، بەڵام جارێ سەرانسەری شار پڕ بوو لە جموجۆڵ و شوێنە داخراو و تاریك‌و بێ جووڵەكانی كە رەگی بەردینی خۆی لێ داكوتابوون بەجێ دەهێشت و، بە بارێكی پڕ لە زیندووانەوە وەڕێدەكەوت. ئەو شەوە تارۆ و ریڤۆ رامبێر و ئەوانیتر بە نێو جەماوەردا دەرۆیشتن و هەستیان دەكرد كە لاقیان وەعەرز ناكەوێ. ریڤۆ و تارۆ زۆر بەر لەوەی شەقامەكانیان جێ هێشتبێ، تەنانەت لەو كاتانەدا كە لە كۆڵانە چۆڵەكانیش دا، بە بەردەم پەنجەرە داخراوەكان دا تێدەپەڕین، گوێیان لە دەنگی ئەو شادی‌و خۆشییە دەبوو كە وەشوێنیان دەكەوت و لەبەر شەكەتی و ماندوویەتییان نەیاندەتوانی ئەو ئازارەی كە لەو دیو پەنجەرەكانەوە هێشتا بەردەوام بوو لەو شادی و خۆشییە جوێ بكەنەوە كە بڕێك بەولاوەتر كۆڵانەكانی داگرتبوو. ئەو رزگارییەی كە نزیك دەبۆوە روخسارێكی تێكەڵاو لە پێكەنین و فرمێسكی هەبوو.

لەو ساتەدا كە قریوەقریوی شادی و خۆشی بەرزتر بۆوە، تارۆ وێستا. لەسەر بەردەچنە رەشەكە، قەڵافەتێك نەرم نەرم رایدەكرد. پشیلەیەك بوو. یەكەمین پشیلەیەك كە لە بەهارێوە بەولایە دیتبووی. ساتێك لە نێوەڕاستی كۆڵانەكە راوەستا، دڕدۆنگ بوو، پەنجەی بەرز كردەوەو بە خێراییەوە بردییە پشت گوێی راستی خۆی، دیسان هەروا بەنەرمی دەستی كردەوە بە راكردن و لە ناخی شەودا لەچاوان ونبوو. تارۆ بزەی هاتێ. بە دڵنیاییەوە پیرەوردیلەش شاد دەبێ.

## (٢)

بەڵام لەو ساتەی دا کە وێدەچوو تاعوون دوور دەکەوێتەوە، بۆ ئەوەی بخزێتەوە ئەو کونەی لەوێوە هاتبووە دەرێ، لانیکەم لە شاریدا یەکێك هەبوو کە ئەو گەڕانەوەیە ئەوی تۆقاندبوو و ئەگەر باوەڕ بە یادداشتەکانی تارۆ بکەین ئەو کەسە کۆتار بوو.

راستیتان دەوێ، ئەو یادداشتانە، لەو کاتەوە کە ئاماری تاعوون روو لە داکشان دەکەن، شێوازێکی سەیروسەمەرە بەخۆوە دەگرن. لەوانەیە بەهۆی ماندوویەتییەوە بێ کە نووسینەکەی وای لێ دێ نەخوێندرێتەوە و زۆربەی جاران هەر جارەو باسی شتێك دەکا. جگە لەوەش، بۆ یەکەمین جاریش ئەو یادداشتانە، رەهەندی بینینی بێ لایەنی وەلا دەنێن و تێبینیی شەخسی جێگەیان دەگرێتەوە. بەو شێوەیە لە نێو ئەو هەمووە دێڕەدا کە بۆ حاڵەتی کۆتار تەرخان کراوە، راپۆرتێکی کورت لەسەر پیرەمێردە پشیلە خۆشەویستەکە بەرچاو دەکەوێ. ئەگەر سەرنج بدەینە نووسینەکانی تارۆ، تاعوون هیچ گۆڕانێکی لەو باوەڕەدا بەدی نەهێناوە کە بەر لە پەتاکە لەسەر ئەو پیاوە هەیبوو. ئەو دوای تاعوونیش دەیویست وەکوو پێشوو بایەخ بەو پیاوە بدا و ئەگەر سەرەڕای هەموو گەشبینیەکەشی تێیدا سەرنەکەوت، خەتاکەی لە ئەستۆی تارۆ بوو. چونکە تارۆ هەوڵی دابوو بیبینێ. چەند رۆژ دوای ئەوە شەوی ٢٥ی ژانویە، لە گۆشەی کۆڵانە تەسکەکەدا چاوەڕوانی ببوو. پشیلەکانی لەکاتی دیاریکراودا لەوێ بوون و خۆیان لەبەر بەرۆچکەکە هەڵخستبوو، بەڵام جاران کە لەوکاتەدا پەنجەرەکان هەمیشە کراوە بوون ئێستا بە لاسارییەوە داخرابوون، لە رۆژەکانی دیکەش دا تارۆ هەر نەیدیتن و بە کونجکۆڵییەوە بەو ئاکامە گەیشت کە پیرەمێردە وردیلەکە یا رەنجاوە یا مردووە. ئەگەر دڵی یەشابێ کەوابوو بە دڵنیاییەوە پێی وابووە کە حەق بەو بووە و تاعوون خراپەی لەگەڵ کردووە،

بەڵام ئەگەر مردبێ، دەبێ سەبارەت بەویش هەر وەکی پیرە پشوو سوارەکە لەخۆمان بپرسین کە ئاخۆ ئەویش لە ریزی پیر و پیاوچاکان بووە؟ تارۆ پێی وانەبوو وا بێ، بەڵام پێی وابوو کە نیشانەی پیاوچاکی لەو پیرەدا هەبوو. لە یادداشتەکانیدا ئەوە بەرچاو دەکەوێ:" لەوانەیە بکرێ تەنیا بگەیتە نیزکییەکانی پیاوچاکی. بەو پێیە دەبوو قایل بی بە خووخدەی شەیتانیی خاکەڕایانە و خێرخوازانە."

لە یادداشتەکان دا، لە نێو سەرنجەکانی پێوەندیدار بە کۆتارەوە، ئاماژەگەلێکی پەرش‌وبڵاو و جۆراوجۆر بەدی دەکرێن. هێندێکیان پێوەندییان بە گرانتەوە هەیە کە لە سەردەمی چاکبوونەوە دایە و هەر دەڵێی نەبای دیتووە نە بۆران دیسانەکە دەستی کردبۆوە بەکارکردن. بەشەکانی دیکەش تەرخان کراوە بۆ دایکی دوکتۆر ریڤۆ. چەند قسە و باسێك کە بە کەڵك وەرگرتن لەو ژیانەی کە تارۆ لەگەڵ ئەوان دا تێپەڕی کردبوو، بزەی ئەو و، دەربڕینی بۆچوونەکانی لەسەر تاعوون بە وردی نووسراونەتەوە. تارۆ بە تایبەتی لەسەر بێ رەنگیو بێ کاریگەریی مادام ریڤۆ پێی داگرتۆتەوە، لەسەر قسەکانی ئەو کە هەموو شتێکی بە رستەی سادە دەردەبڕی. لەسەر هۆگرییەکی تایبەتی کە بە پەنجەرەی هەبوو. پەنجەرەیەك کە بەرەو کۆڵانە هێمنەکە دەکرایەوە و لە کاتی ئێوارەدا لە پشت ئەو پەنجەرەیە دادەنیشت بە بەژنێکی بڕێك قیت و باسکی بەردراوە و نیگای وردەوە، هەتا ئەو کاتەی کە زەردەپەڕ ژوورەکە داگرێ و لە تیشکێکی تەماویدا کە وردەوردە بەرەو تاریکی دەچێ پەیکەرێکی رەشی لێ ساز بکا و وردەوردە ئەو پەیکەرە بێ جووڵەیە لەخۆیدا نوقم بکا. لەسەر جووڵەی نەرم و لەسەرەخۆی ئەو لە ژوورێکەوە بۆ دیوێکی دیکە، لەسەر مێهرەبانیەکەی کە قەت بۆ تارۆی دەرنەخستبوو، بەڵام تارۆ لە هەموو هەڵسوکەوتو قسەکانی دا ئەوەی بەدی دەکرد، بە گشتی لەسەر ئەوەی کە تارۆ پێی وابوو ئەو هەموو شتێك دەزانێ بە بێ ئەوەی بیر لە شتێك بکاتەوە و، سەرەڕای ئەو هەمووە بێ دەنگی و "لێڵی"یە، دەیتوانی بکەوێتە سەرووی هەرچەشنە تیشکێکەوە تەنانەت تیشکی تاعوونیش. لەمەوەدوا، دەستوخەتی تارۆ بە شێوەیەکی سەیروسەمەرە ئاڵۆز بوو. ئەو دێڕانەی کە بە دوای دا دەهاتن، بە زەحمەت دەخوێنرانەوە، بۆ ئەوەی نیشانەیەك لەو ئاڵۆزییەتان بۆ بخەمە روو دوایین وشەکانی، یەکەم وشەیەك بوون کە لایەنی کەسێنی و

شەخسییان هەبوو:" دایکی منیش هەر وابوو. لەودا هەر ئەم بێ کاریگەری و بێ ڕەنگییەم خۆش دەویست و ئەوەی بەردەوام دەمویست پێی بگەم ئەو بوو. ئەوە هەشت ساڵە کە ناتوانم بڵێم ئەو مردووە. تەنیا برێك لە جاران پتر کەمڕەنگتر و بێ کاریگەرتر بۆتەوە و کاتێك گەڕامەوە ئەو ئیتر نەمابوو."

بەڵام دەبێ بگەڕێینەوە سەر کۆتار. لەو کاتەوە کە ئامارەکان دادەبەزین، کۆتار بە بیانووگەلی جۆراوجۆر سەردانی ریڤۆی کردبوو، بەڵام لە راستیدا هەموو جارێ پرسیاری رەوتی پەتاکەی لە ریڤۆ دەکرد:" پێت وایە هەروا لەنەکاو و لەخۆوە راوەستێ؟ لەو رووەوە رەشبین بوو یا باشترە بڵێین کە پێی وا بوو، بەڵام ئەو هەمووە پرسیارە بەردەوامەی دەیکردن ئەوەی دەردەخست کە باوەڕێکی پتەوی لەو بارەیەوە نیە. لە نیوەی ژانویەدا ریڤۆ بە گەشبینیەکی زۆرەوە وەڵامی دابۆوەو هەموو جارێ وەڵامەکانی ئەو لەبری ئەوەی ببنە مایەی خۆشحاڵیی کۆتار، بە پێی رۆژە جۆراوجۆرەکان دژکردەوەی جیاوازی هەر لە لاسارییەوە بگرە هەتا دەگاتە بێهیوایی لەخۆی نیشان دەدا. بە گشتی دوکتۆر بە ناچاری پێی گوتبوو کە لەگەڵ ئەو نیشانە باشانەی ئامارەکان دەیخەنە روو واباشترە لە ئێستاوە قریوەی سەرکەوتن بەرز نەکەینەوە. و کۆتار گوتبووی: بە واتایەکی دیکە، کێ چووزانێ؟ بەڵکو لە یەکێك لە رۆژەکاندا، پەتاکە سەر لەنوێ دەست پێ بکاتەوە.

ـ بەڵێ، هەروەکی لەوانەیە کاروباری چارەسەرکردن خێراتر بکرێ، پێچەوانەکەشی بۆی هەیە ببێ.

ئەو دڕدۆنگییە کە هەمووانی پەرۆش کردبوو، دیار بوو کۆتاری ئەهوەنە دەکردەوە، و لە لای تارۆ گەنگەشەیەکی لەگەڵ کاسبکارەکان دەست پێ کردبوو کە دەیویست وایان لێ بکا باوەڕی ریڤۆ قەبووڵ بکەن. دیارە لەو کارەشیدا سەرکەوتوو دەبوو، لەبەر ئەوەی دوای کەفوکوڵی یەکەمین سەرکەوتنەکان، گومان و دڕدۆنگییەك گەڕابۆوە ناخی هێندێ کەس و، ئەو گومانو دڕدۆنگییە، دوای ئەو شادی و خۆشییانەی کە بە شوێن راگەیەندراوەکەی پارێزگاریدا هاتن، هەروا بەردەوام بوو. کۆتار بە دیتنی ئەو پەرۆشییە، دڵنیا دەبۆوە. هەروەکی بە شتی دیکە تووشی بێهیوایی دەبوو و، بە تارۆی دەگوت:" بەڵێ، ئاخری دەروازەکان دەکەنەوە و، دەبینن کە هەموویان بە جێم دێڵن."

هەتا ٢٥ی ژانویە، گۆڕانی دەروونیی ئەو بۆ هەمووان دەرکەوت. چەند رۆژی بەردەوام، پاش هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر بۆ راکێشانی سەرنجی خەڵکی گەڕەك‌و ئاشناکانی خۆی، لەنەکاو پێوەندیی لەگەڵ دەپساندن. لانیکەم لە رواڵەتدا خۆی دوورەپەرێز رادەگرت و رۆژبەرۆژ زیاتر پەنای دەبردە بەر ژیانی دوورە پەرێزی. ئیتر نە لە ریستورانت دەیانبینی و نە لە شانۆو نە لەو کافتریایانەی کە حەزی لێیان بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، وێدەچوو کە نەگەڕابێتەوە سەر ژیانە دووپاتەو تاڵەکەی پێش تاعوون. ئەو لە ئاپارتمانەکەی دا بە تەواوی تەریك کەوتبۆوە و خواردنیشیان هەر لە ریستۆرانتەکەی تەنیشتیانەوە بۆ دەبرد. تەنیا سەروبەندی خۆرنشین بە دزییەوە وەدەر دەکەوت، پێداویستییەکی دەکڕی و بە پەلە لە دووکانەکان دەهاتە دەرەوە و خۆی دەخزاندە نێو کۆڵانە چۆڵەکانەوە. لەو کات و ساتانەدا، ئەگەر تارۆش چاوی پێی کەوتبایە، جگە لە چەند وەڵامی کورت هیچی لێ نەدەبیست. دوایی بە بێ ئەوەی هۆیەکی تازە لە گۆڕێ دابێ، دەیاندی کە بۆتەوە بە کەسێکی کۆمەڵایەتی، بیروباوەڕی هەموو کەسی دەپرسی و دیسان شەوانە بە رووگەشییەوە دەهاتەوە نێو خەڵك.

ئەو رۆژەی راگەیەندراوەکەی پارێزگاری دەرکرا، کۆتار بە تەواوەتی ون بوو، دوو رۆژ دواتر تارۆ دیتی کە لە کۆڵانەکاندا وێڵ و بەرەڵا دەخولێتەوە. کۆتار داوای لێکرد کە هەتا گەڕەکەکانی دەرەوەی شاری لەگەڵ بچێ. تارۆ کە بە تایبەتی کاری ئەو رۆژە شەکەتی کردبوو، دڕدۆنگ بوو، بەڵام کۆتار پێی چەقاند. زۆر هەژاو دیار بوو. بە شێوەیەکی زۆر نائاسایی سەرودەستی رادەوەشاند و بەرز بەرز قسەی دەکرد. لە تارۆی پرسی ئاخۆ بەراستی پێی وایە کە راگەیەندراوی پارێزگاری هۆکاری کۆتایی تاعوون بێ؟ دیارە تارۆ لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە یەك راگەیەندراوی ئیداری لە خۆوە بۆ کۆتایی هێنان بە بەڵایەك، بەس نیە، بەڵام دەکرێ بە پێی عەقڵ وای لێکبدەیتەوە کە پەتاکە بەرەو تەواوبوون دەچێ، مەگەر ئەوەیکە رەوشێکی چاوەڕواننەکراو هاتبێتە پێشێ.

کۆتار گوتی: بەڵێ، ئەگەر حاڵەتی چاوەڕواننەکراو نەیەتە پێشەوە و، خۆ رووداوی چاوەڕواننەکراویش قەت نابڕێنەوە.

تارۆ بیری خستەوە کە پارێزگاریش بە شێوەیەك هەر ئەو رەوشە چاوەڕواننەکراوەی پێشبینی کردووە و دوو حەوتووی بۆ کرانەوەی دەروازەکان دیاری کردووە.

کۆتار کە هەروا هەژابوو گوتی: کارێکی باشی کردووە. لەبەر ئەوەی ئەو دۆخەی کە ئێستا هەیە، لەوانەیە بە هیچ دەرچێ.

تارۆ لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە هیچ شتێك محال نیە، بەڵام بیری کردەوە کە لەگەڵ ئەوەدا واباشترە چاوەڕوانی کرانەوەی دەروازەکان و گەڕانەوە بۆ ژیانی سرووشتی بن.

کۆتار گوتی: بە گشتی، دەبێ پێی قایل بین، بەڵام تۆ مەبەستت لە گەڕانەوە بۆ ژیانی سرووشتی چییە؟

تارۆ بە پێکەنینەوە گوتی: فیلمە نوێیەکان لە سینەما.

بەڵام کۆتار پێنەدەکەنی. دەیویست بزانێ ئاخۆ دەکرێ بیهێنیتە پێش چاو کە تاعوون هیچ شتێ لە شار دا نەگۆڕا و هەمووشتێ وەکوو پێشوو دەست پێ بکاتەوە، واتە بە جۆرێك کە وەك بڵێی هیچ نەقەومابێ؟ تارۆ لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە تاعوون شار دەگۆڕێ و ناشیگۆڕێ. دیارە ئارەزووی هاووڵاتیانی ئێمە ئەوەیە کە بە بێ هیچ گۆڕانێك بژین. سەرەڕای ئەوە، لە لایەکەوە هیچ شتێ ناگۆڕدرێ، و لە لایەکی دیکەشەوە، ناکرێ تەنانەت بە ورەی لێبڕاوانەشەوە، هەموو شتێ لەبیر بکەی و تاعوون لانیکەم شوێنەوار لەخۆی بەجێدێڵێ. کۆتار راشکاوانە گوتی ئیشی بەسەر "دڵ" ـەوە نیە و مەسەلەی دڵ بە لای ئەوەوە بێ بایەخترین مەسەلەیە. ئەوەی بۆ ئەو گرینگە ئەوەیە کە بزانێ ئاخۆ دامودەزگا حکوومییەکان دەگۆڕدرێن یان نا و ئاخۆ تەواوی رێکخراوەکان وەکوو رابردوو ئیش دەکەنەوە؟و تارۆ ناچار بوو بڵێ کە تەواوی ئەو رێکخراوانە کە لە جەنگەی پەتاکەدا تێکچوونە، بۆ ئەوەی دەست بە کارەکانیان بکەنەوە، برێك تووشی چەرمەسەری دەبن و ئەو مەسەلانە لانیکەم دەبنە هۆی پێویستبوونی دامەزرانەوەی رێکخراوەکانی جاران.

کۆتار گوتی: ئاخ! لەوانەیە، لە راستیدا هەموو کەسێك دەبێ هەموو شتێك لە نوێ دەست پێ بکاتەوە.

پێکەوە گەیشتبوونە نزیك ماڵی کۆتار. ئەو هەژابوو و زۆریی لەخۆی دەکرد کە گەشبین بێ. شاری دێنایە پێش چاوی خۆی کە هەموو شتێکی دەست پێکردۆتەوە. رابردووی خۆی تەواو وەلاناوە و لە سفرەوە دەست پێکردۆتەوە.

لەبەر دەرگا بوون و دەستیان بە دوگمەوە بوو. کۆتار کە زۆر زیاتر لە پێشوو هەژابوو دەیگوت: حەقتە. زۆر باش دەبێ کە لە سفرەوە دەست پێ بکەنەوە.

بەڵام لە تاریکایی دالآنەکەوە دوو پیاو هاتنە دەرێ. تارۆ بە زەحمەت توانیی گوێی لە دەنگی کۆتار بێ کە دەیپرسی ئەو بوونەوەرانە لێرە چ کارێکیان هەیە.

بوونەوەرەکان کە رواڵەتی کارمەندگەلێکی رێکوپێکیان هەبوو، لە کۆتاریان پرسی کە ئاخۆ ناوی کۆتارە؟ و ئەو کە بە سەر سوورماوییەوە هاوارێکی کزی لێ بەرز ببۆوە، بەر لەوەی تارۆ و ئەوانیتر دەرفەتی بچووکترین جووڵەیان ببێ گەڕایەوە و لە تاریکایی شەودا لە چاوان ون بوو. کە سەرسووڕمانە سەرەتاییەکە رەوییەوە تارۆ لەو جووتەی پرسی کە چیان دەویست؟ ئەوان بە تێبینیەوە و لە هەمانکاتدا  بە راوێژێکی رێزدارانەوە وتیان هێندێ زانیارییان دەویست و بە قورسی بەرەو ئەو لایە رۆیشتن کە کۆتار رووی تێکردبوو.

تارۆ لەگەڵ وەژووری کەوتنی بۆ ئەو ماڵە ئەو دیمەنەی لە یادداشتەکانی خۆیدا هێناوەتەوە و دەمودەست (نووسینەکەی شایەتە) ئاماژە بە شەکەتیی خۆی دەکا. و هەر وەها ئەوەی لێ زیاد دەکا کە هێشتا کاری زۆری لە پێشە، بەڵام سەرقاڵبوون نابێتە هۆی ئەوەی کە ئامادە نەبێ و لەخۆی دەپرسێ کە ئاخۆ بە راستی ئامادەیە. لە کۆتاییدا وەڵام دەداتەوە کە لە رۆژ و شەودا بەردەوام کات و ساتی وا هەن کە کە تێیدا مرۆڤ ترسنۆك و بێ غیرەتە و ئەو تەنیا لەو کات و ساتانە تۆقیوە. و لێرەدایە کە یادداشتەکانی تارۆ دەگەنە کۆتایی.

## (٣)

دوو ڕۆژ دواتر، چەند ڕۆژ بەر لە کرانەوەی دەروازەکان، دوکتۆر ریڤۆ هاتەوە ماڵەکەی خۆی و نەیدەزانی ئاخۆ ئەو تەلەگرافە گەیشتووە کە چاوەڕوانیبوو یان نا؟ هەرچەندە کاری ئەو ڕۆژە لەسەردەمی تاعوون زیاتری شەکەت کردبوو، چاوەڕوانیی ڕزگاربوونی یەکجارەکی تەواو حەساندبوویەوە. ئێستا هیوادار بوو و لەو سۆنگەیەوە شاد بوو. بەردەوام ناکرێ بەسەر ویستو ورەی خۆت دا زاڵ بیت و قایم لەسەر جێگەی خۆت ڕاوەستی. ئەوەش بەختەوەرییەکە کە ئیتر مرۆڤ بە شادییەوە تانوپۆی ئەو وزە و هێزە بپسێنێ کە بۆ بەربەرەکانێ چنراوە. ئەگەر ئەو تەلەگرافەش کە چاوەڕێی بوو هەواڵی خۆشی پێ بایە ریۆ دەیتوانی ژیان دەست پێ بکاتەوە. ئەو لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە هەمووان دەبێ دەست پێ بکەنەوە.

بە بەردەم ژووری خزمەتکارەکەدا تێپەڕی. خزمەتکارەکە پاڵی بە دەلاقەکەوە دابوو و بزەی لەسەر لێو بوو. ریڤۆ کاتێك لە پلیکانەکانەوە دەچووە خوارێ ڕوخساری ئەو لەبەر چاو بوو کە بە هۆی ماندوویی و شەکەتیو بەشمەینەتی هەڵبزرکابوو.

بەڵێ، لەگەڵ ئەوەی کە خەیاڵەکان تەواو دەبوون، ئەو ژیانێکی نوێی دەست پێ دەکردەوە، و بە بڕێك شانسەوە..، بەڵام لەو ساتەدا کە دەرگای دەکردەوە، تووشی دایکی بوو کە پێی گوت تارۆ باش نیە. بەیانی هەستابوو، بەڵام نەیتوانیبوو بچێتە دەرێ و دیسان خەوتبۆوە. مادام ریڤۆ پەرۆشی بوو. کوڕەکەی گوتی:

ـ لەوانەیە شتێکی گرنگ نەبێ.

تارۆ لە قەرەوێڵەکەیدا راکشابوو. سەرە قورسەکەی بالیفەکەی قووڵ دەکرد، سینگە پانەکەی لە بن لێفە ئەستوورەکەوە دیار بوو. تای هەبوو و سەری ژانی دەکرد. بە ریڤۆی گوت هێندێ نیشانەی سەیر لەخۆیدا هەست پێ دەکا کە لەوانەیە ئاسەواری تاعوون بن.

ریڤۆ دوای پشکنینی ئەو گوتی:

ـ نەخێر، هێشتا هیچ شتێ دیار نیە.

بەڵام تارۆ خەریك بوو بخنکێ. لە کۆریدۆرەکەدا دوکتۆر بە دایکی گوت کە لەوانەیە دەسپێکی تاعوون بێ. مادام ریڤۆ گوتی:

ـ ئاخ! پێموانیە، ئەویش ئێستا. و بە دووی ئەوەدا گوتی:

ـ بێرنار، با ئەو لای خۆمان راگرین.

ریڤۆ خەیاڵ هەڵیگرتبوو. گوتی:

ـ ئەمن بۆم نیە کاری وا بکەم، بەڵام بەم زووانە دەروازەکان دەکرێنەوە. پێموایە ئەگەر تۆ لێرە نەبای، ئەمن دەمتوانی بۆ یەکەمین جار ئەو مافە بۆخۆم دەستەبەر بکەم.

دایکی گوتی:

ـ بێرنار، پێکەوە رایدەگرین. خۆ ئەزانی من تازە دەرزیم لە خۆم داوە.

دوکتۆر گوتی تارۆش دەرزیی لەخۆی دابوو، بەڵام لەوانەیە بە هۆی شەکەتی و ماندوویەتی دوایین سیرۆمی لەخۆی نەدابێ و چەند پارێزێکی لەبیر کردبێ.

ریڤۆ بەرەو ئۆفیسەکەی رۆیشت. کە گەڕایەوە ژوورەکەی تارۆ دیتی کە دەرزیی گەورە گەورەی سیرۆمی لەگەڵ خۆی هێناوە. گوتی:

ـ ئمم، کەوابوو خۆیەتی.

ـ نەخێر، بەڵام دەبێ پارێز بکەین.

تارۆ لە بری هەر وەڵامێك باسکی هێنایە بەرەوە و ملی بۆ ئەو دەرزی لێدانە درێژخایەنە راکێشا کە خۆی گەلێ جاران لە نەخۆشانی دابوو. ریڤۆ گوتی:

ـ ئەم شەو دەی بینین.

و لە روخساری تارۆی روانی.

ـ بۆ جویّ کرنەوە گەرەنتییەك وەرناگری ریڤۆ؟

ـ هیچ مسۆگەر نیە کە تۆ تاعوونت گرتبیّ.

تارۆ بە زەحمەت بزەیەکی هاتیّ و گوتی:

ـ ئەوە یەکەم جارە دە دەبینم سیرۆم لیّدریّ بە بیّ ئەوەی فەرمانی جویّکردنەوە بدریّ.

ریڤۆ ئاوڕی دایەوە و گوتی:

ـ ئەمنو دایکم چاومان بەسەرتەوە دەبیّ. ئیّرە بۆ تۆ باشترە. تارۆ بیّدەنگ بوو و، ریڤۆ کە دەرزییەکانی دەختستەوە شویّنی خۆیان، بەر لەوەی بگەڕیّتەوە راوەستا بۆوەی ئەو قسە بکا. ئاخری بەرەو لای قەرەویّڵەکە چوو. نەخۆشەکە سەیری دەکرد. روخساری ماندوویەتیی پیّوە دیاربوو، بەڵام چاوە خۆڵەمیّشییەکانی هیّمن بوون. ریڤۆ بزەیەکی هاتیّ :

ـ ئەگەر دەتوانی بنوو. ئەمن خیّرا دەگەڕیّمەوە.

کاتیّك گەیشتە بەر دەرگا گویّی لە دەنگی تارۆ بوو کە بانگی دەکرد. گەڕایەوە لای، بەڵام دەتگوت تارۆ لە ناخی خۆیدا ئالۆزە و نەیدەزانی ئەوەی دەیویست بیڵیّ چۆنی دەربڕیّ. ئاخری گوتی:

ـ ریڤۆ دەبیّ هەموو شتیّکم پیّ بڵیّی. پیّویستمە بیزانم,

ـ بەڵیّن بیّ.

تارۆ دەموچاوی برِیّك ویّك هیّنا و بزەیەکی هاتیّ و گوتی:

ـ سوپاس. نامەویّ بمرمو بەربەرەکانیّ دەکەم، بەڵام ئەگەر دۆڕاندم دەمەویّ بە باشی تەواوی بکەم.

ریڤۆ نووشتایەوە و شانی گوشی و گوتی:

ـ نا، بۆ گەیشتن بە پیرۆزایەتی دەبیّ بژیت، خەبات بکەی.

بە دریّژایی رۆژ سەرما، کە زۆر تووش بوو، برِیّك هیّور بۆوە، بەڵام دوانیوەڕۆ کردیە گۆپاڵبارانو تەرزە. کاتی زەردەپەڕ ئاسمان برِیّك روون بۆوە و تەزووی سەرما زیاتر بوو. ریڤۆ سەرەتای شەویّ بوو گەڕایەوە ماڵیّ، بە بیّ ئەوەی کە باڵتۆکەی داکەنیّ چووە ژووری هاورِیّکەی. دایکی خەریکی چنین بوو. تارۆ دەتگوت لە جیّی خۆی نەبزووتووە، بەڵام لیّوەکانی کە بە هۆی تا سپی هەڵگەڕابوون نیشاندەری بەربەرەکانیەك بوو کە لە ناخیدا بەرِیّوە بوو. دوکتۆر پرسی:

ـ دەی! چۆنی؟

تارۆ شان و شەپیلکە پانەکانی کە لە قەرەوێڵەکەوە هاتبوونە دەرەوە، بڕێك هەڵتەکاندن و گوتی:

ـ هیچ، خەریکە دەیدۆڕێنم.

دوکتۆر بەسەریدا نووشتایەوە. کوانەکان لە بن پێستە گڕ گرتووەکەوە هەڵیان دابوو، سینگیشی دەتگوت دەنگی کارگەی ئاسنگەرییەکی ژێرزەمینیی لێوە دێ. تارۆ سەیر ئاسەواری هەردووك جۆرە نەخۆشییەکەی بەسەرەوە دیار بوو، ریڤۆ کە خۆی قیت دەکردەوە گوتی هێشتا سیرۆمەکە دەرفەتی ئەوەی نەبووە کە هەموو کاریگەرییەکەی خۆی نیشان بدا. تارۆ ویستی چەند قسەیەك بکا، بەڵام شەپۆلێکی تا قوڕگی گوشی و وشەکانی لەخۆیدا نوقم کرد.

دوای شیوخواردنێ، ریڤۆ و دایکی گەڕانەوە و لە تەنیشت نەخۆشەکە دانیشتن. شەو بۆ ئەو، لەگەڵ بەربەرەکانێ دەستی پێدەکرد و ریڤۆ دەیزانی کە ئەو بەربەرەکانێ دژوارە لەگەڵ فریشتەی تاعووندا، هەتا بەیانی دەخایەنێ.

بەهێزترین چەکی تارۆ، شان و باهۆ و سینگە پتەوەکەی نەبوو، بەڵکو ئەو خوێنە بوو کە بڕێك لەوە پێش ریڤۆ لە بن پێستەکەیدا وەگەڕی خستبوو و، لەو خوێنەدا، شتێك کە لە رۆح بنچینەییتر بوو و هیچ زانستێك نەیدەتوانی بیدۆزێتەوە و ریڤۆ دەبوو تەنیا سەیری ململانێ و بەربەرەکانێی هاوڕێکەی بکا. چەندین مانگ، شکانی بەردەوام فێری ئەوەی کردبوو کە رادەی کاریگەریی ئەوەی کە دەبێ جێبەجێی بکا، ئەو لووانەی کە دەبێ دروستیان بکا، ئەو دەرمانە وزە بەخشانەی کە دەبوو بۆ نەخۆشیان بنووسێ، لەوەپێش پێشبینی بکا. لە راستی دا، تاقە ئەرکی ئەو ئەوە بوو کە دەرفەت بدا بەو رێکەوتەی کە زۆرجاران نەدەهاتە پێشەوە و، دەبایە بێتە پێشێ. چونکە ریڤۆ خۆی لەبەرامبەر جۆرێك تاعووندا دەبینیەوە کە تووشی سەرسووڕمانی دەکرد. جارێکی دیکەش تاعوون ئەو شێوازانەی چەواشە دەکردن کە لە دژی بەکار دەهێنران. لەو شوێنانە ون دەبوو کە پێشتر دامەزرابوو و لە هێندێ شوێنیش دەردەکەوت کە چاوەڕوانییان نەدەکرد. جارێکی دیکەش هەوڵی دەدا تووشی سەرسووڕمانیان بکاتەوە.

تارۆ بە بێ جووڵە بەربەرەکانێی دەکرد. شەو هەتا بەیانی بچووکترین بێ ئۆقرەییەکی لە بەرامبەر هەڵچوونەکانی نەخۆشییەکەدا لەخۆی نیشان نەدا، تەنیا بە قەڵافەتە درشتەکەیو بە

دانبەخۆداگرییەوە درێژەی بە ململانێکەی دا، بەڵام تەنانەت بۆ جارێکیش زاری لێك نەکردەوە بۆ ئەوەی بەو لەبزە تایبەتییەی بڵێ کە رابواردنو خۆشی بۆ ئەو بەسەرچووە. ریڤۆ تەنیا قۆناغەکانی ململانێی لە چاوەکانی هاورێکەیدا بەدی دەکرد کە بە نۆرە یا کرابوونەوە یا لێکنرابوون. پێلووەکان یا قووچابوون یا لێك جویێ ببوونەوە و چاوەکانی یا بەسەر شتێکەوە قەتیس مابوون یا لە دوکتۆرو دایکی بڕیبوون. هەرکات چاوی دوکتۆر لەو نیگایە دەئالقان، تارۆ بە هەوڵێکی زۆرەوە بزەیەکی دەهاتێ.

لەو نێوەدا، لە کۆڵانەوە گوێیان لە دەنگی بەپەلەی پێ بوو. خەڵکەکە لە پێش گرمەی هەورەتریشقەیەکی دوورەوە رایان دەکرد کە وردەوردە نزیك دەبۆوە و کۆڵانەکەی پڕ دەکرد لە بارینی خۆی. بارانە دایکردبۆوە و برێك دواتر تێکەڵاوی تەرزەیەك بوو کە لە وەعەرزکەوتنیدا ترپەی دەهات. لە بەردەم پەنجەرەکانەوە پەردە گەورەکان شەپۆلیان دەدا.

لە نیوەی تاریکی ژوورەکەدا، ریڤۆ کە چرکەیەك هۆشی چووبووە سەر باران بارینەکە، دیسان سەیری تارۆی دەکردەوە کە روخساری بە تیشکی گڵۆپی خەوتن رووناك ببۆوە. دایکی خەریکی چنین بووو جاروبارە سەری هەڵدەبڕی و بە وردی سەیری نەخۆشەکەی دەکرد. ئێستا دوکتۆر تەواوی ئەو کارانەی کردبوون کە دەبوو بیانکا. کە باران خۆشی کردەوە، بێدەنگیی ژوورەکە قووڵتر بۆوە. دوکتۆر کە لە بێ خەوییان، دەلەرزی، هەستی دەکرد کە لە سنوورەکانی بێدەنگی دا، گوێی لەو فیکە نەرم و رێکەیە کە بە درێژایی پەتاکە لەگەڵی بووە. ئاماژەیەکی بە دایکی کرد کە بچێ بنوێ. مادام ریڤۆ بە جووڵەی سەر، گوتی نا و، چاوەکانی بریسکانەوە. دوایی بەو پەڕی وردبینیەوە بە نووکی میلی چنینەکەی، ئەو ئالقەیەی تاقیکردەوە کە لێی دڵنیا نەبوو. ریڤۆ هەستا ئاو بدا بە نەخۆشەکە، گەڕایەوە و دانیشتەوە.

رێبوارەکان، بە کەڵکوەرگرتن لە خۆشکردنەوەی باران بە پەلە بە شۆستەکەدا دەرۆیشتن. دەنگی هەنگاوەکانیان کەمتر دەبۆوە و دوور دەکەوتەوە. دوکتۆر بۆ یەکەمین جار تێگەیشت کە ئەم شەو، پڕ لە رێبواری ناوەخت و بێ لوورەی ئامبولانس، لە شەوەکانی جاران دەچێ. شەوێك بوو، رزگاربوو لە تاعوون و، دەتگوت پەتاکە، کە بە زەبری سەرما و جەماوەری خەڵك رەتێنرابوو، لە قووڵایی تاریکی شار دەرچووە و خزیوەتە نێو ئەم ژوورە گەرمەوە بۆ ئەوەی دوایی

هێرشی خۆی بکاتە سەر جەستەی بێ جووڵەی تارۆ. ئیتر خەرمانکوتی بەڵا لەسەر ئاسمانی شار نەدەخولایەوە، بەڵام لەسەرەخۆ لە هەوای قورسی ژوورەکەدا دەیلووراند. ئەوە دەنگی ئەو بوو کە ریڤۆ لە چەندین سەعات لەوە پێشەوە دەیبیست. دەبوو دان بەخۆدا بگرن بۆ ئەوەی لە لەوێش ئەو لوورەیە کپ و بێدەنگ بێ. بۆ ئەوەی لەوێش تاعوون دان بە شکستدا بێنێ.

برێك بەر لە کازیوە، ریڤۆ بەلای دایکیدا نووشتایەوە و گوتی:

ـ ئەتۆ دەبێ بنووی بۆ ئەوەی سەعاتی هەشت بتوانی جێگەی من بگریتەوە. بەر لە خەوتن قەترە لە لووتت بکە.

مادام ریڤۆ هەستا. چنینەکەی کۆ کردەوە و بۆ لای نوێنەکەی چوو. تارۆ دەمێك بوو چاوەکانی هەڵنەدێنان. ئارەقە، قژەکانی خستبووە سەر نێوچەوانە پتەوەکەی. مادام ریڤۆ ئاخێکی هەڵکێشا و نەخۆشەکە چاوەکانی هەڵێنان. روخسارە دلۆڤانەکەی بینی کە بەسەریدا نووشتاوەتەوەو بزەی پێداگرانەی دیسان دەرکەوتەوە، بەڵام چاوەکان دیسان لێك نرانەوە. ریڤۆ کاتێك تاق کەوتەوە، لەسەر ئەو کورسییە دانیشت کە دایکی چۆڵی کردبوو. کۆڵان بێدەنگ بوو و ئێستا بێدەنگیی رەها زاڵ بوو. سەرمای دەمەوبەیانی وردەوردە لە ژوورەکەدا هەستی پێدەکرا.

دوکتۆر خەونووچکە بردییەوە، بەڵام یەکەمین گالیسکەی بەیانییان، لە خەو راپیەڕاند. جەستەی دەلەرزی و سەیری تارۆی کرد. زانی راوەستانێك بووە و نەخۆشەکەیش خەوتووە. چەرخە چێوی و ئاسنینەکانی گالیسکەکە هێشتا لە دوورەوە دەسووڕان. کاتێك دوکتۆر بەرەو قەرەوێڵەکەی رۆیشت، تارۆ بە چاوە بێهێزەکانی سەیری ئەوی دەکرد. وەك بڵێی هێشتا، بە چاوی کراوەوە لە خەو دایە. ریڤۆ پرسی:

ـ خەوتی. وانیە؟

ـ بەڵێ.

ـ پشووکێشانت باشترە؟

ـ برێك. ئەوە مانایەکی هەیە؟

ریڤۆ بێدەنگ مایەوە و، پاش ساتێکە گوتی:

ـ نا، تارۆ ئەوە مانایەکی نیە. ئەتۆش وەکوو من ئاگات لە دابەزینی بەیانیان هەیە.

تارۆ سەلماندی و گوتی:

ـ سوپاس، هەمیشە وەڵامی راستیم بدەوە.

ریڤۆ لە خوار قەرەوێڵەکەوە دانیشتبوو. لە تەنیشتییەوە، لاقەکانی تارۆ کە راکشاو و توند بوون، هەستی دەکرد لاقی مردوون. تارۆ توندتر پشووی دەکێشا. بە هانکەهانك گوتی:

ـ تا دیسان سەر هەڵدەداتەوە. نا، ریڤۆ؟

ـ بەڵێ، بەڵام نیوەڕۆ. ئەوکات دەاتوانین قسەیەکی لێ بکەین.

تارۆ چاوەکانی لێکنان. دەتگوت دەیەوێ هێزی خۆی کۆ بکاتەوە. حاڵەتی شەکەتی و بێزاری لە قەڵافەتیدا بەدی دەکرا. چاوەڕوانی تایەك بوو کە هەر لە ئێستاوە لە ناخییەوە وەجموجۆڵ کەوتبوو. کاتێك چاوەکانی کردنەوە نیگای لێڵ ببوون. کاتێك ئەو نیگایە روون بۆوە کە ریڤۆی دی بەسەریدا نووشتاوەتەوە. دوکتۆر گوتی:

ـ بخۆوە.

تارۆ ئاوی خواردەوە و سەری لەسەر سەرینەکەی وێڵ کرد. گوتی:" دوورودرێژە" ریڤۆ باسکی گرت، بەڵام تارۆ کە رووی وەرگێڕابوو ئیتر دژکردەوەیەکی لەخۆی نەدەنواند. و لە نەکاو تا، وەك بڵێی بەنداوێکی لە ناخیدا شکاندبێ، بە ئاشکرا هەتا نێوچەوانی هێرشی هێنا. کاتێك نیگای تارۆ بەرەو لای دوکتۆر سووڕایەوە، ریڤۆ بە روخسارە گرژەکەیەوە هەوڵی دا، غیرەتی وەبەر بنێ. ئەو بزەیەی تارۆ ویستی بیخاتە لێوی، لە شەویلکە داتەپیوەکانی و لەو لێوانەوە کە کەفێکی سپییان لێ نیشتبوو، سەرووتر نەچوو، بەڵام لە روخسارە ساردەکەیدا، چاوەکانی دیسان بە تەواوی بریسکەی غیرەت و ئازایەتییەوە درەوشانەوە.

سەعات حەوت مادام ریڤۆ وەژوور کەوت، دوکتۆر چووە نووسینگەی کارەکەی بۆ ئەوەی تەلەفۆن بۆ نەخۆشخانە بکا و کەسێك لە جێگەی خۆی دابنێ. هەر وەها بڕیاری دا چاوپێکەوتن و سەردانەکانی بخاتە کاتێکی دیکە. چرکەساتێك لەسەر قەرەوێڵەی عەیادەکەی راکشا، بەڵام لەڕێوە هەستا و گەڕایەوە ژوورەکەی، تارۆ سەری بۆ لای مادام ریڤۆ وەرسووڕاندبوو و سەیری ئەو جەستە وردیلەی دەکرد کە لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو و دەستەکانی لە ئەژنۆی وەراندبوو. ئەو بە وردبنیەکی ئەوتۆوە سەیری پیرەژنەی دەکرد کە مادام ریڤۆ قامکی خۆی لەسەر لێوەکانی دانا و هەستا و چراکەی سەر ئەوی کوژاندەوە، بەڵام

لەو دیو پەردەکانەوە رۆژ بە خێرایی وڵاتی رووناك دەکردەوە و برێك دواتر، کاتێك گنج و هێڵی روخساری نەخۆش لە نێو تاریکییەوە وەدەرکەوتن، مادام ریڤۆ دیتی کە تارۆ هەروا لێی دەڕوانێ. بەرەو لای ئەو نووشتایەوە و سەرینەکەی بۆ راست کردەوەو کاتێك دەگەڕایەوە سەر جێگەی خۆی لەو ساتەدا دەنگێکی لێڵی بیست کە وەك بڵێی لە ئەشکەوتەوە بێتە دەرێ و سوپاسی دەکرد و دەیگوت ئێستا ئاسوودەترە. کاتێك لەسەر جێگەی خۆی دانیشتەوە، تارۆ چاوەکانی لێك نابوون و روخسارە بێ هێزەکەی، سەرەڕای زارە قووچاوەکەی دەتگوت دیسانەوە پێدەکەنێ.

کاتی نیوەڕۆ، نۆبەتێیەکە، گەیشتبووە لووتکەی خۆی. جۆرە کۆخەیەکی هەناوی نەخۆشەکە، رایدەتلەکاند. ئێستا تارۆ خوێن دەڕشایەوە. ئیتر کوانەکان هەویان نەدەکرد و رەق رەق، وەکوو بەردیان لێ هاتبوو. ریڤۆ قەڵاشتنەوەی ئەو کوانانەی بە کارێکی مەحاڵ و نەکردە دەزانی. لە نێوان نۆبەتێ و کۆخەدا، تارۆ دیسان دووراودوور لە هاوڕێکانی دەڕوانی، بەڵام برێك دواتر، ئیتر چاوەکانی برێك دەکرانەوە و ئەو بریسکەیەی کە روخسارە تێکسمڕاوەکەی گەش دەکردەوە سات بە سات بەرەو کزی دەچوو. ئەو تۆفانەی کە جەستەی ئەوی بە هەڵچوونی بەلەرزینەوە رادەتلەکاند، دووراودوور بریسکەیەکی لەو روخسارەدا درووست دەکردو تارۆ وردە وردە لە قووڵایی ئەو تۆفانەدا نوقم دەبوو. ئەو پەیکەرە مرۆییەی کە ئەو هەمووەی لێوە نزیك بوو ئێستا بە زەبری نێزە کون ببوو، بە ئازارێکی تاقەتپڕووکێن سوورەوە ببوو و بە تەواوی باهۆزە تووڕەکانی ئاسمان تێکەوە پێچرابوو و ئێستا لە بەردەم چاوەکانی ئەودا بە قووڵایی ئاوەکانی تاعووندا دەچووە خوارێ و ریڤۆ هیچ هێزێکی بۆ بەرەنگاری و راوەستان لە بەرامبەریدا پێ نەبوو. ناچار بوو بە دەستی بەتاڵ و دڵی شکاو، بێ چەكو بێ پشتیوان، لەسەر کەنار راوەستێ و سەیری ئەو بەڵایە بکا و دواجاریش فرمێسکی داماوی نیشتە سەر و روخساری ریڤۆ و نەیهێشت ئەو ببینێ و تارۆ لە پڕ بەرەو دیوارەکە وەرسووڕایەوە و بە ناڵەیەکی بەتاڵ گیانی دەرچوو، وەك بڵێی لە گۆشەیەکی گیانیدا سیم (وایەر)ێکی هەستیار پسابێ.

شەوی دوای ئەو رووداوە، ئیتر شەوی بەرنگاری نەبوو، بەڵکو شەوی بێدەنگی بوو. لەو ژوورە تەریك و لە دنیا دابڕاوەدا، لەسەر ئەو تەرمەی کە ئێستا جلوبەرگی لەبەردا بوو، ریڤۆ هەستی بە پەرەگرتنی ئەو هێمنیە سەرسووڕهێنەرە کرد کە چەندین شەو پێش ئێستا، لەسەر هەیوانەکە و لەسەرووی تاعوونەوە و بە دوای هێرش بۆ سەر دەروازەکان سەقامگیر ببوو. هەر لە ئێستاوە، بیری لەو

بێدەنگییە دەکردەوە کە لە نوێنە بەتاڵەکەی مردوواندا هەستی پێ دەکرا. لە هەموو جێگەیەك هەر ئەو راوەستانە، هەمان مەودای مەزن و هەر هەمان هێمنی بوو کە بە دوای بەرەنگارییەکاندا دەهات. ئەو بێدەنگییەش، بێدەنگیی بەزین و شکست بوو، بەڵام ئەو بێدەنگییەی ئێستا بەسەر هاوڕێکەی ئەو دا زاڵ بوو پەرش و بڵاو بوو. لەگەڵ بێدەنگیی کۆڵانەکان و شاری رزگاربوودا ئەوەندەی یەك دەگرتەوە کە ریڤۆ هەستی کرد کە ئەمجارە دوا شکستو بەزینە. هەر ئەو بێدەنگییەی کە کۆتایی بە شەڕەکان دێنا و ئازارێکی چارەهەڵنەگر لە ئاشتی و هێمنی ساز دەکا. دوکتۆر نەیدەزانی کە ئاخۆ تارۆ لە کاتی مەرگدا گەیشتووە بە هێمنی یان نا؟، بەڵام لانیکەم لەو ساتەدا دەیزانی کە ئیتر ئەو قەت رووی هێمنی بەخۆیەوە نابینێ، هەروەکی بۆ دایکی لە منداڵ دابڕاو یا بۆ پیاوێکی کە هاوڕێکەی کفن دەکا هێمنیەك نیە.

لە دەروە هەر ئەو شەوە سارده بوو و ئەستێرەی کەسیرە لە ئاسمانی سامال و سەهۆڵێندا. لە ژوورە نیوەکراوەکەدا، قورسایی سەرماو پشووی رەنگبزرکاوی شەوێکی جەمسەری (قوتبی) لەسەر شووشەکان هەست پێدەکرا. لە تەنیشت قەرەوێڵەکەوە مادام ریڤۆ هەروا خۆمانە دانیشتبوو و چرای خەوتن، لای راستی رووناك کردبۆوە. لە نێوەڕاستی ژوورەکەدا، بەدوور لە رووناکایی ریڤۆ لەسەر کورسییەکە چاوەڕوان بوو. سات بە سات بیری ژنەکەی بە مێشکی دادەهات، بەڵام خۆی لەدەست ئەو بیرە رادەپسکاند.

لە سەرەتای شەوێ دا، بە روونی دەنگی هەنگاوی رێبوارانی لە شەوی کەسیرەدا بیستبوو. مادام ریڤۆ پرسیبووی:

ـ هەموو کارەکانت راپەڕاندن؟

ـ بەڵێ، تەلەفۆنم کردووە.

ئیتر شەونخوونیی بێدەنگی خۆی دەست پێکردبۆوە. مادام ریڤۆ جاروبارە سەیری کوڕەکەی خۆی دەکرد. هەرکات نیگاکانیان تێك دەئاڵقان، ریڤۆ بزەی دەهاتێ. دەنگە ئاشناکان لە شەوێ دا پەیتا پەیتا دەبیسران. سەرەڕای ئەوەی هێشتا بە فەرمی ئیزن نەدرابوو، بەڵام ترۆمبیلەکان کەوتبوونەوە هاتوچۆ. ئەوان بە خێرایی بەسەر بەردچنەکاندا تێدەپەڕین و نەدیو دەبوون و دیسان دەردەکەوتنەوە. دەنگەدەنگەکان، زەنازەنا، دیسانەوە بێدەنگی، دەنگی سمی ئەسپ، جیڕەجیڕی سووڕانەوەی شەمەندەفەر، قریوەقریوی ناڕوون و دیسان هەناسەکانی شەو.

ـ بێرنار؟

ـ بەڵێ.

ـ ماندوو نیت؟

ـ نا.

دەیزانی دایکی بیر لە چی دەکاتەوە و دەیزانی کە دایکی لەو ساتەدا خۆشی دەوێ، بەڵام لە هەمان کاتدا دەشیزانی کە خۆشویستنی بوونەوەرێك شتێکی هێندە گرینگ نیە و لانیکەم ئەڤین ئەوەندە بەهێز نیە کە زمانی تایبەتیی دەربڕینی خۆی بدۆزێتەوە. بەو شێوەیە ئەو و دایکی بەردەوام لە بێدەنگیدا یەکتریان خۆش دەویست. ئاخری دایك ـ و یا کوڕـ بە نۆرەی خۆی دەمرێ بە بێ ئەوەی لە تەواوی ژیانیان دا توانیبێتیان بە شێوەیەکی روون خۆشەیستیی خۆیان دەربڕن. هەر بەو شێوەیە ئەو لە تەنیشت تارۆ ژیابوو ئەو رۆژە تارۆ مردبوو بە بێ ئەوەی برادەرایەتییەکەیان بەراستی دەرفەتی ژیانی بووبێ. تارۆ هەر وەکی خۆی دەیگوت یارییەکەی دۆڕاندبوو، بەڵام چ سەرکەوتنێك بە ریڤۆ بڕابوو؟

سەرکەوتنی ئەو لەو نێوەدا تەنیا ئەوە بوو کە تاعوون بناسا و رۆژێك ناچار بێ کە بیهێنێتەوە یاد. هەر هەموو ئەو شتەی وا ئەوەی مرۆڤ دەیتوانی لە گەمە و کێبڕکێی تاعوون و ژیاندا بیباتەوە، بریتی بوو لە تێگەیشتن و بیرەوەری. ئەوەی تارۆ ناوی نابوو "بردنەوەی یاری" هەر ئەوە بوو.

دیسان ترۆمبیلێك تێپەڕیو مادام ریڤۆ لەسەر کورسییەکەی برێك جووڵا. ریڤۆ بزەیەکی بۆی هاتێ. دایکی پێی گوت کە ماندوو نیە و بەدوای ئەوەدا گوتی:

ـ ئەتۆ دەبێ بچی لەوێ لە کوێستانێ پشوو بدەی.

ـ بە دڵنیاییەوە دایە.

بەڵێ، لەوێ پشووی دەدا. بۆ نەحەسێتەوە؟ ئەو کارە لە هەمانکاتدا بۆ ئەوە دەبووە بیانوویەك بۆ یادکردنەوە، بەڵام ئەگەر بردنەوەی یاری هەر ئەوە بوو، ژیان، تەنیا بەو شتەوە کە مرۆڤ دەیزانێ و بەوەی کە وەبیری دێتەوە و بێبەش لەوەی کە ئارەزوویەتی، چ دژوار بوو. بێ گومان تارۆش هەروا ژیابوو. دەشیزانی کە ژیان بە بێ ئاوات و ئارەزووەکان چەندە

ئەستێور و نەزۆکە. هێمنی بە بێ ئاوات و هیوا مەحاڵە و تارۆ کە مافی مەحکوومکردنی مرۆڤی بە هیچ کەس نەدەدا و سەرەڕای ئەوەش دەیزانی کە هیچ کەس ناتوانێ خۆ لە مەحکوومکردن ببوێرێ و قوربانیگەلێکیش جاروبارە خۆیان لە جێگەی جەللاددا دەبیننەوە... بەڵێ تارۆ لە چنگی ئاڵۆزی و دژوازی و ناتەبابییدا ژیابوو و هیچ کات ئاوات و هیوای بەخۆوە نەبینیبوو. ئاخۆ هەر لەبەر ئەوە بوو کە کەوتبووە بیر "پیرۆزایەتییەوە" و لە خزمەتکردن بە خەڵکدا بە شوێن هێمنیی دەروونیی خۆی دا گەڕابوو؟ لە ڕاستیدا ریڤۆ هیچی نەدەزانی و ئەو بابەتە بە لای ئەوەوە هیچ گرینگ نەبوو.

تاقانە وێنەی تارۆ کە لە زەینی دا مابوونەوە، وێنەی پیاوێك بوو کە فەرمانی ترۆمبیلەکەی ئەوی توند دەگرت بۆوەی لێی خوڕێ و وێنەی ئەو جەستە درشتەی کە ئێستا بێ جووڵە درێژ ببوو. گەرمای ژیان و وێنەی مەرگ... ئەوە بوو تێگەیشتن.

بێ گومان هەر بۆیە بوو کە دوکتۆر ریڤۆ بۆ بەیانیەکەی بەوپەڕی لەسەرەخۆیی و هێمن هەواڵی مەرگی ژنەکەی وەرگرت. لە نووسینگەی کارەکەی بوو. دایکی بە هەڵەداوان* هاتبوو کە تەلەگرامێکی بداتێ، دوایی بۆ ئەوەی دەستخۆشانەیەك بدا بە نامەهێنەرەکە، چووبووە دەرێ. کاتێك گەڕایەوە، کوڕەکەی تەلەگرامەکەی کربۆوە و بە دەستییەوە بوو. دایکی سەیری کرد، بەڵام ریڤۆ پێداگرانە لە پەنجەرەوە سەیری ئەو خۆرە جوانەی دەکرد کە لەسەر بەندەرگەوە دەهاتە سەرێ. مادام ریڤۆ گوتی:

ـ بێرنار.

دوکتۆر بە وڕی و کاسبوونەوە سەیری کرد.

مادام ریڤۆ پرسی:

ـ تەلەگرامەکە هەواڵێکی تێدابوو؟

ریڤۆ بۆی سەلماند:

ـ بەڵێ تێیدا بوو. ئەمرۆ حەتووەکە.

---

* بە هەڵەداوان: واتە بەپەلە، بۆ پەلەکردنی گەیاندنی خەبەری ناخۆش بەکاری دێنن.

مادام ریڤۆ رووی لە لای پەنجەرەکە کرد. دوکتۆر بێدەنگ بوو. دوایی بە دایکی گوت نەگری و گوتی چاوەڕوانی وەها هەواڵێك بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دژوار بوو. تەنیا ئەو دەمەی ئەو قسەیەی کرد دەیزانی کە ئازاری ئەو چاوەڕواننەکراو نیە. لە چەندین مانگ لەوەپێشەوە و لە دوو ڕۆژ لەمەوبەرەوە هەر ئەو ئازارە بوو کە درێژەی هەبوو.

## (٤)

ئاخری، سەر لە بەیانیی رۆژێکی جوانی مانگی فێبریوەر، لەگەڵ پیرۆزبایی خەڵك و رۆژنامە و رادوێ و راگەیەندراوەکانی پارێزگاریدا دەروازەکانی شار کرانەوە. ئێستا لەسەر گێڕەرەوەیە کە نووسەری رووداوەکانی کات و ساتەکانی دوای کرانەوەی دەروازەکان بێ. لەگەڵ ئەوەدا کە خۆی لەو کەسانە بوو کە ئازاد نەبوون بەهەموو تواناوە لەو شادیو خۆشییەدا بەشدار بن.

جێژنە گەورەکان بۆ رۆژو شەو رێكخرابوون. شەمەندەفەرەکان لە وێستگەکانیانەوە دووکەڵیان وەرێخستو لە هەمان کاتدا پاپۆڕەکان کە لە دەریای دوورەوە هاتبوون لە بەندەرگەی ئێمەدا گیرسانەوە بۆ ئەوەی بە شێوازی خۆیان ئەوە نیشان بدەن کە ئەو رۆژە، بۆ ئەوانەی بەدەست جودایی و دابڕانەوە دەیاننالاند رۆژی گەورەی بەیەك گەیشتنەوەیە.

لێرەدا بە ئاسانی دەتوانی ئەو هەستی لێکدابڕانە کە لەمێژ بوو لە دڵی هاوولاتیانی ئێمەدا جێگەی خۆش کردبوو، بێنیتە بەرچاو و بزانی چی لێهاتووە. ئەو شەمەندەفەرانەی کە هەتا ئێوارێ هاتنە نێو شارەکەمانەوە راست وەکوو ئەوانەی کە چوونە دەرەوە پڕ بوون لە موسافیر. هەموو کەسێك لەو پازدە رۆژە چاوەڕوانیەدا بلیتی قیتاری بۆخۆی کڕیبوو. هەموانیش لەوە دەترسان کە نەکا بڕیارەکەی پارێزگاری لە دوایین چرکەساتدا هەڵوەشێنرێتەوە. ژمارەیەك لە موسافیرەکان کە لە شار نزیك دەبوونەوە، هێشتا ترسەکەیان تەواو نەڕەویبوو، لەبەر ئەوەی ئەگەر بە گشتیش لە چارەنووسی

خزم و کەسەکانیان بێ خەبەر بوون، بەڵام ئاگایان لە چارەنووسی ئەوانی تر و شار نەبوو و، لە خەیاڵی خۆیاندا، روخسارێکی سامناکیان لێ ساز کردبوو بەڵام ئەوە تەنیا ئەو کەسانەی دەگرتەوە کە بە درێژایی ئەو ماوەیە لە ئاگری تاسە و ئارەزووادا نەسووتابوون.

شێت و شەیداکان، لە راستیدا، خۆیان دابووە دەست هزرە نەگۆڕ و چەقبەستووەکەی خۆیانەوە. تەنیا یەك شت بە لای ئەوانەوە گۆڕابوو: کات... کە لە سەرانسەری مانگەکانی غوربەتیاندا ویستبوویان وەپێشی بخەن بۆ ئەوەی خێراتر تێپەڕێ. دیسان کاتێك لە دوورەوە دیمەنی شارەکەی ئێمەیان دەبینی بە تاسەو تاسووقەوە دەیانویست خێراتری بکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا کە شەمەندەفەرەکە راوەستا، بە ئاواتەوە بوون کە کات هێواشتر تێپەڕێ. هەستی نادیار و لە هەمان کاتدا  توندوتیژی تەواوی ئەو مانگانەی کە بۆ ئەڤینەکەیان لە کیس چووبوو، داوای ناڕوونی جۆرە خەڵاتێکی لەواندا دەگووراند، کە بە هۆی ئەو هەستەوە، کاتی خۆشی و شادی لە چاو سەردەمی چاوەڕوانی دووهێندە هێورتر تێپەڕێ. ئەوانەش کە لە ژوورێکدا یا لەسەر ئەسکەلەوە چاوەڕوانیان بوون، وەکوو رامبێر کە ژنەکەی لەگەڵ بیستنی هەواڵەکە، لە چەند حەوتوو لەوەپێشەوە خۆی ئامادە کردبوو بیگاتێ، تووشی ئەو بێئۆقرەییە ببوو. لەبەر ئەوەی مانگەکانی تاعوون ئەو عیشق و خۆشەویستییەی کردبووە شتێکی زەینی و رامبێر بە جەستەیەکی لەرزۆکەوە چاوەڕێ بوو ئەو هەستە زەینیە بەو بوونەوەرە بگرێ کە بە پاڵپشتی خۆی دەزانی.

بە ئاواتەوە بوو کە هەر ببێتەوە بەو کەسەی، کە لەسەرەتای پەتاکەدا ئامادە بوو بە پەلامارێك لە شار رابکا و خۆی بگەیەنێتەوە ئەو کەسەی کە خۆشی دەویست، بەڵام دەیزانی کە وەها گۆڕانێك روو نادا. دەیزانی کە تاعوون جۆرە وڕی و گێژییەکی لەودا گووراندووە کە بە هەموو هێزی خۆیەوە هەوڵ دەدا حاشای لێ بکا و لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دڵەڕاوکێ و وڕییە لە ناخیدا درێژەی دەبێ. لە لایەکەوە ئەو هەستەی هەبوو کە تاعوون زۆر لەنەکاو کۆتایی پێ هاتووە و ئەو بە گوێرەی پێویست هۆشی لەسەر خۆی نەبووە. بەختەوەری بەوپەڕی خێراییەوە دەهاتە پێشێ و ئەو رووداوەی کە رووی دابوو خێراییەکەی لە چاوەڕوانی پتر بوو. رامبێر دەیزانی کە هەموو شتێکی بە جارێك پێ دەدرێتەوەو شادی کەفوکولێکە کە چێژوەرگرتن لێی مەحاڵە.

ئیتر هەموو کەس بە زانیاریی کەمترەوە یا زیاتر، وەکوو ئەو وابوون و لێرەدا دەبێ باسی هەمووان بکەین. لەو سەکۆی سکەی شەمەندەفەرەدا کە ژیانی شەخسیی ئەوان دەستی پێ دەکرد، هێشتا، بە بزە و چاولێکداگرتن، هەستیان بە هاوبەشیی رەوشی خۆیان لەگەڵ ئەوانیتردا دەکرد، بەڵام هەستی غوربەتیان، لەگەڵ دیتنی یەکەمین دووکەڵ و هەڵمی شەمەندەفەر، لەنەکاو لە ژێر رێژنەی شادییەکی لێڵ و وڕکەردا دامرکایەوە. کاتێك شەمەندەفەرەکە وێستا، ئەو لێکدابڕانە دوورودرێژانەی کە هەر لەسەر هێڵی ئەو شەمەندەفەرە دەستی پێکردبوو، لە یەك چرکەدا کۆتایی هات. لە هەمان کاتدا کە بە تاسە و ئارەزووەکی پڕ لە کەفوکوڵ و شادییەوە باسکەکان لە نێوقەدێك هاڵان، کە شێوە و بیچمەکەیان لەبیر چووبۆوە. رامبێر خۆی دەرفەتی ئەوەی نەبوو سەیری ئەو بوونەوەرە بکا کە بەرەو ئەو رایدەکرد و خۆی بە سینگییەوە دەگوشی. کاتێك ئەوی لە ئامێز گرتبووو ئەو سەرەی کە تەنیا دەیتوانی قژە ئاشناکانی ببینێ بە سینگیەوە دەگوشی، لێگەڕا ئەو ئەسرینانەی بە لووزەو بێنە خوارێ کە نەیدەزانی بەرهەمی ئەو شادییەی ئێستایە یا ئازای شاراوەی ئەو ماوە دوورودرێژە. لانیکەم دڵنیا بوو لەوەی ئەو فرمێسکانە ناهێڵن بزانێ کە ئەو روخسارەی لە قووڵایی شانیدا شاراوەتەوە، روخساری دوورودرێژی ئەوە یا روخساری نامۆیەك. دواتر دەیتوانی تێ بگا کە ئاخۆ گومانەکەی ئەو بەجێ بوو یان نا؟ جارێ دەیویست وەکوو هەمووان بجوولێتەوە. وەکوو هەموو ئەوانەی کە لە دەورووبەری بوون و دەتگوت پێیان وایە لەوانەیە تاعوون بێت و بڕوا بە بێ ئەوەی دڵەکانی خەڵك بگۆڕێ.

لە حاڵێکدا کە یەکتریان توند بەخۆوە دەگوشی، گەڕانەوە ماڵەکانیان. هیچ شتێکی دیکەیان لە دنیادا نەدەدی، بە رواڵەت تاعوونیان بەزاندبوو. هەرچی چارەڕەشی بوو لە بیریان چووبۆوە و هەروەها ئەو کەسانەیان لە بیر نەمابوو کە دیسان هەر بەو شەمەندەفەرە هاتبوون و کەسیان نەدۆزیبۆوە و ئامادە بوون کە لە ماڵەکانیاندا تووشی پشتڕاستکردنەوەی ئەو ترسە ببنەوە کە پێشتر بێدەنگیی درێژخایەن لە دڵەکانیاندا دروستی کردبوو.

بۆ ئەوانە کە جگە لە ئازارە بەتینەکەیان بەو لاوە هیچ هاوڕێیەکیان نەبوو، بۆ کەسانێکی دیکە کە لەو ساتەدا خۆیان دەدایە دەست بیرەوەریی بوونەوەرێکی لەدەستچوو، رەوشەکە تەواو بە شێوەیەکی دیکە بوو و هەستی دابڕان لەواندا گەیبووە ئەوپەڕی خۆی. بۆ ئەوانە، واتە دایکان، هاوسەران و ئەو

ئەڤینداڕانەی کە تەواوی خۆشییەکانی ژیانیان لەگەڵ ئەو بوونەوەرەدا لەدەست دابوو کە ئێستا لە چاڵێکی نادیاردا ون ببوو یا ببووە لوێچێك خۆڵەمێش، تاعوون هەر هەبوو و نەبڕابۆوە.

بەڵام کێ لەو تەنیاییە تێ دەگەیی؟ کاتی نیوەڕۆ هەتاو بەسەر هەناسەکانی سەرمادا زاڵ ببوو، کە لە بەیانییەوە لە هەوادا شەڕی دەکردو خۆر تیشکی بەردەوامی خۆی بەسەر شاردا دەڕشت، ڕۆژ ڕاوەستابوو. تۆپەکانی سەر قەڵاتەکان، لەسەر تەپۆلکەکانەوە، بێ وچان لە ئاسمان دا گرمەیان هات. خەڵکی شار بە پانەوە دەهاتنە دەرەوە بۆ ئەوەی ئەو ساتە چڕە ببینن کە تێیدا قۆناغی ئازارەکان کۆتایی دەهات و سەردەمی لەبیرکردن کە هێشتا نەهاتبوو بکەن بە جێژن.

لە هەموو گۆڕەپانەکان سەما و هەڵپەڕین بوو. ڕۆژبەڕۆژ هاتوچۆ زیاتر دەبوو و ترۆمبیلەکان کە زیادیان کردبوو، بە زەحمەت بە کۆڵانە قەرەباڵغەکاندا تێدەپەڕین. زەنگوڵەکانی شار لە تەواوی ساتەکانی دوانیوەڕۆدا دەزرینگانەوە و بە زرینگەیان ئاسمانی شین و زێڕینیان دەئاخنی. لە کڵێسەکاندا نزای شوکرانەبژێری دەخوێنرایەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا کۆڕەکانی ڕابواردنیش سیخناخ بوون لە خەڵك. کافتریاکان بە بێ ئەوەی لە خەمی داهاتوودا بن، دوایین خواردنەوەکانیان دابەش دەکرد. لە بەردەم هەیوانەکانیان خەڵکێکی زۆر کە ڕواڵەتێکی هەژاویان هەبوو، پاڵەپەستۆیان بوو. لە نێویشیاندا، کچ و کوڕ هەبوون کە دەستیان لە باخەڵی یەکتریدا بوو و لەوەش نەدەترسان کە خەڵك سەیریان بکا. هەمووان دەیانقریواند و پێدەکەنین. ئەو هێزە گیانبەخشەی کە لە ماوەی چەند مانگی ڕابردوودا کۆیان کردبۆوە و، ڕۆحی خۆیان بۆ کردبووە چاوەدێر، لەو ڕۆژەدا کە دەتگوت ڕۆژی زیندوومانەوەیانە، بەکاریان دێنا. بۆ سبەی ژیان خۆی بە هەموو پارێزەکانیەوە دەستی پێ دەکردەوە. جارێ ئەو خەڵکەی کە لە چین و توێژە جۆراوجۆرەکان بوون، لە تەنیشت یەکتری دادەنیشتن و برایانە لەگەڵ یەکتر دەجووڵانەوە، ئەو یەکسانیەی کە بوونی مەرگ بۆی جێبەجێ نەکرابوو، خۆشی و شادیی ڕزگاربوونی، لانیکەم بۆ ماوەی چەند سەعاتێك سەقامگیر کردبوو.

بەڵام خۆ هەموو شتێك لەو هەڵڵا بێ تامەدا کورت نەدەبۆوە. ئەوانەی کە لە کۆتایی ڕۆژدا لە پەنا ڕامبێرەوە کۆڵانەکانیان پڕ کردبۆوە، زۆربەیان، شیرنترین بەختەوەرییان لە بن دەمامکێکی ئارام دا دەشاردەوە. جووتەکان و بنەماڵەکان، تەنیا ڕواڵەتی گەشتیارگەلێکی بێدەنگیان هەبوو. لە ڕاستیدا زۆربەی ئەوان دەچوونە سەردانی ئەو شوێنانەی کە لەوێدا

ئازاریان چێشتبوو. کارەکەشیان ئەوە بوو کە ئاسەواری ئاشکرا یا نهێنیی تاعوون و ئەو شوێنەوارەی لەپاش خۆی جێهێشتبوو نیشانی تازە گەیشتوان بدەن. لە هێندێ شتدا بەوەندە قایل بوون کە رۆڵی رێنوێنیکەرانەی تاعوون دیتوویەك یا رۆڵی کەسێك بگێڕن کە گەلێك رووداویان بینیوە و بە بێ ئەوەی بیرەوەریی ترس و هەڕەشە بێننەوە بیر خۆیان باسی مەترسییان دەکرد. ئەو خۆشی و شادییانە بێ ئازار بوون، بەڵام لە هێندێ بابەتی دیکەدا ئەو شیکردنەوەیە موچڕکەی بە لەشدا دێنان، بۆ وێنە ئەو عاشقەی کە خۆی دابووە دەست دڵەڕاوکیی شیرنی بیرەوەرییەکان، دەیتوانی بە هاوڕێکەی بڵێ:" لەم شوێنەو لەوەها کاتێك دا بیرم لەتۆ دەکردەوەو غەریبیم کردبووی‌و تۆ دیار نەبووی." ئەو گەشتیارانەی کەفوکوڵ و عیشق، لەو ساتەدا دەیانتوانی رەوشی خۆیان دەسنیشان بکەن: ئەوان لە نێو ئۆقیانووسی هەڵڵا و قریوەدا، کە دەوری دابوون، کۆمەڵە دوورگەیەکی ئاواز و نهێنی درکێن بوون کە باشتر لە ئۆرکێسترای سەر چوار ڕێیانەکان، هاواڵی رزگاریی راستەقینەیان دەدا. لەبەر ئەوەی ئەو جووتە عاشقانە، شان بەشانی یەکترەوە و بە سوێرقسەییەوە، لە نێو هەڵڵا و قریوەدا لەگەڵ تەواوی سەرکەوتن و زێدەڕۆیی بەختەوەریدا، پێیان داەگرتەوە لەسەر ئەوەی کە تاعوون کۆتایی هاتووەو سەردەمی ترس تەواو بووە. ئەوان بەو پەڕی بێخەمییەوە و سەرەڕای تەواوی شتە بەڵگەهەویستەکان، حاشایان دەکرد لە ئاشنایەتیی ئێمە لەگەڵ جیهانێکدا کە تێیدا مەرگی مرۆڤەکان وەکوو مەرگی مێش و مەگەز شتێکی ئاسایی بوو، هەروەها لەگەڵ ئەو وەحشیگەرییە سەلمێنراوە و ئەو وڕێنە داڕێژراوە و، ئەو گرفتاری و زیندانەی کە پێی وابوو بۆی هەیە دەستدرێژی بکاتە سەر هەموو هەرێمێك. هەروەها حاشایان دەکرد لەوەی کە ئێمە هەر ئەو خەڵکە واق وڕماوە بین کە هەموو رۆژێ دەستەیەك لە ئەندامەکانی لە گەرووی کوورەیەکدا ببنە دووکەڵ و چەوری و، ئەوانی دیکەش دەست و پێ لە کۆت و زنجیری بێدەسەڵاتی و ترسدا چاوەڕێی نۆرەی خۆیان بن. دوکتۆر ریڤۆ کە لە دەمەدەمی ئێوارە دا بە تەنیایی، بە نێو دەنگی زەنگوڵە و تۆپ و مۆسیقا و دەنگەدەنگی ئازاردەردا بەرەو گەڕەکەکانی درەوەی شار دەڕۆیشت ئەم دیمەنانە سەرەنجیان رادەکێشا. پیشەی ئەو هەر بەردەوام بوو. لەبەر ئەوەی بۆ نەخۆشان پشوودانێك لەگۆڕێ نیە. لەو تیشکە جوان و نەرمەدا کە بەسەر شاردا دەپرژا، بۆنی جارانی

کەباب و مەشرووبی رازیانە هەڵدەستا. لە دەورەووبەری ئەو روخسارە شادەکان روویان لە ئاسمان دەکرد. ژن و پیاو بە روخساری گڕگرتۆوە و بە تەواوی کەفوکوڵ و هاواری هەوەس دەستەملانی یەکتری بوون. بەڵێ ترس و تاعوون کۆتایی هاتبوو و، ئەو باسکانەی کە مێزیان لێکدەدا، لە راستیدا دەیانگوت کە تاعوون بریتییە لە غوربەت و لێکدابڕان بە واتای پڕ بە پێستی وشە.

بۆ یەکەمین جار ریڤۆ دەیتوانی ناوێك لەو حاڵەتە ئاشنایە بنێ کە زۆر دەمێك بوو لە روخساری تەواوی رێبواراندا دەیدی. ئێستا بۆ ئەو بەس بوو کە سەیری دەورو پشتی خۆی بکا. تەواوی ئەو کەسانەی کە لەگەڵ چارەڕەشی و بەشمەینەتییەکاندا بە کۆتایی گەیشتبوون، جلوبەرگی ئەو رۆڵەیان پۆشیبوو کە پێشتر لە ئەستۆیان بوو و رواڵەتیان لەو کۆچەریانە دەچوو کە سەرەتا روخساریان و ئێستا جلوبەرگەکانیان نیشاندەری دووربوونیان لە وڵاتە دوورەدەستەکەیان بوو. لەو ساتەوە کە تاعوون دەروازەکانی شاری داخستبوو، ئەوان تەنیا لە جودایی دا ژیابوون و لەو گەرماییە مرۆییە بێبەش ببوون کە دەبێتە هۆی لەبیرچوونەوەی هەمووشتێك. لە هەر قوژبنێکی شاردا، پیاو و ژن هەرکام بەشی خۆیان لە حەژمەتی پێکگەیشتنەوەیەك دا ژیابوون کە بۆ هەمووان بە یەك شێوە نەبوو، بەڵام بۆ هەمووان بە رادەیەك مەحاڵ بوو. زۆربەی هەرە زۆریان بە هەموو توانایانەوە، لە حەژمەتی بوونەوەرێکی نادیار، تینی لەشێك و یا لە حەژمەتی مێهرەبانی یا خووخدەیەکدا هاواریانی کردبوو. ژمارەیەکیان بە بێ ئەوەی بۆخۆیان بزانن لە سۆنگەی بێ بەشی لە خۆشەویستیی خەڵك و بەهۆی ئەوەی کە ناتوانن بە کەرەسەی ئاسایی دۆستایەتی واتە بە نامە و شەمەندەفەر و کەشتی پێیان بگەن، ئازاریان دەکێشا. ژمارەیەکی دیکە کە زۆر کەم بوون لەوانەیە وەکوو تارۆ لە ئارەزووی گەیشتن بە شتێك بووبێتن کە نەیاندەتوانی دەربڕن، بەڵام بە لایانەوە تەنیا دەوڵەمەندییەك بوو کە شیاوی ویستن دیار بوو. لەبەر ئەوەش کە ناوێکی دیکەیان بۆ نەدەدۆزییەوە، ناویان نابوو "هێمنی".

ریڤۆ هەروا رێگەی دەبڕی. هەرچی زیاتر دەڕۆیشت دەورووبەری پتر قەرەباڵغ دەبوو. هەراوهوریا زیاتر دەبوو و وای دەزانی کە گەڕەکەکانی شار سات بەسات دوورتر دەکەونەوە.

وردەوردە، لە جەستە زەبەلاحەدا دەتوایەوە کە دەینووزاند. ئێستا باشتر لە هاواری ئەو جەستە گەورەیە تێدەگەیشت، لەبەر ئەوەی کە بەشێکیشی هاواری خۆی بوو. بەڵێ، هەموو پێکەوە، لە جەستەو رۆحیان دا، بە دەست عوتلەیەکی ئەستەم و غوربەتێکی چارەهەڵنەگر و تینوێتییەکی بێ سنوور ئازاریان چێشتبوو. لە نێو کۆگای مردوواندا، لوورەی ئامبولانسەکان و هەڕەشەی ئەو شتەی کە بە ناچار ناویان نابوو چارەنووس و سەمای پێداگرانەی ترس و یاخیبوونی سامناکی دڵیان، بەردەوام قریوەیەکی گەورە بوو لە دڵیاندا و ئەو بوونەوەرە تۆقیوانەی وەئاگا دێنایەوە کە دەبێ نیشتمانی راستەقینەیان بدۆزنەوە. بۆ هەمووان، نیشتمانی راستەقینە لەو دیوی دیوارەکانی ئەو شارە گنخاوەوە بوو. لە دڕکەجاڕە بۆنخۆشەکانی سەر تەپۆڵکەکان، لە دەریا، لە وڵاتە ئازادەکان و لە گرانوسەنگینیی عیشقدا. ئەوان دەیانویست بگەڕێنەوە بەرەو لای ئەو بەرەو لای بەختەوەری و بە بێزارییەوە روو لە هەموو شتێکی دیکە وەرگێڕن.

بەڵام سەبارەت بە واتای ئەو غوربەتەو ئەو ئارەزووی پێکگەیشتنەوەیە، ریڤۆ ئاگای لە مەحموودی بێزەواد نەبوو. ئەو هەروەکی رێگەی دەبڕی و لە هەموو لایەکەوە رێکدەگوشرا و بانگیان دەکرد، وردەوردە دەگەیشتە کۆڵانە چۆڵەکان و بەخۆی دەگوت کە گرینگ نیە ئەو شتانە واتایەکیان هەبێ یان نا، بەڵکو تەنیا دەبێ ببینن کە ئاخۆ وەڵامدەری هیواکانی خەڵك بووە یان نا؟

ئێستا ئەو خۆی دەیزانی کە چ وەڵامێك دراوەتەوە و، ئەو وەڵامەی لە یەکەمین کۆڵانەکانی گەڕەکەکانی دەرەوەی شاردا کە دەکرێ بڵێی چۆڵ بوون باشتر وەردەگرت. ئەوانەی کە بەکەم قایل ببوون و تەنیا ویستبوویان کە بگەڕێنەوە ماڵی عیشق و ئەڤینی خۆیان، زۆربەیان خەڵاتیان وەرگرتبوو. هەرچەندە کە هێندێك لەوانیش هەروا بە تەنیایی لەشاردا پیاسەیان دەکرد و ئەو کەسەیان نەدۆزیبۆوە کە چاوەڕوانی بوون. دیسان بەختەوەر بوون ئەوانەی کە دووجار دانەبڕابوون، وەکوو هێندێك کە بەر لە تاعوون نەیانتوانیبوو بە یەکەمین هەوڵ و تێکۆشان هێلانەی عەشقیان چێ بکەن و بە درێژایی ساڵەکان کوێرانە بە شوێن رێککەوتنێکی ئەستەم دابوون کە ئەڤیندارانی دابڕاو پێکەوە گرێ دەداتەوە. ئەوان وەکوو ریڤۆ ئەو بارسووکییەیان هەبوو کە هەموو شتێك بخەنە ئەستۆی زەمەن و بۆ هەمیشتە دابڕابوون، بەڵام ئەوانیتر وەکوو رامبێر بێ گومان، ئەو بوونەوەرە نادیارەیان دۆزیبۆوە کە پێیان وابوو لە

دەستیان داوە. ئەو رۆژە بەیانی ریڤۆ لەکاتی جوێبوونەوە لێی، گوتبووی:" غیرەتت بێ. ئێستایە کە دەبێ حەقت بێ." ئەوان لانیکەم بۆ ماوەیەك بەختەوەر دەبوون. ئێستا دەیانزانی کە ئەگەر شتێك لە گۆڕێیە کە دەکرێ بەردەوام هیوای بۆ بخوازی و هێندێ جاریش وەدەستی بێنی، ئەو شتە خۆشەویستیی ئینسانیە.

بە پێچەوانەوە هیچ وەڵامێك نەبوو بۆ ئەوانەی کە روویان کردبووە شتێك لە دەرەوەی تواناکانی مرۆڤ، کە تەنانەت نەیاندەتوانی بیهێننە پێش چاویشیان. تارۆ هەر دەتگوت گەیشتووەتە ئەو هێمنیە دژوارەی کە مەبەستی بوو، بەڵام تەنیا لە مەرگدا دۆزیبوویەوە و لە کات و ساتێکی دیکەدا بەکاری نەدەهات. ئەوانیتر، بە پێچەوانەوە، بە ئاواتی خۆیان گەیشتبوون، چونکە تەنیا شتێکیان ویستبوو کە لە ناخی خۆیان دابووو ریڤۆ ئەوانی لەبەردەم دەرگاکەیان دەدی کە لە رووناکی دەمی زەردەپەڕدا، بە هەموو تواناوە دەستیان لە نێوقەدی یەکتری هاڵاندووە و بە تاسەوە سەیری یەکتری دەکەن. ریڤۆ لەو ساتەدا کە بەرەوە کۆڵانەکەی کۆتارو گرانت دەسووڕایەوە، بەخۆی دەگوت بە هەڵە نەچووین ئەگەر بڵێین شادی، لانیکەم جاروبارەش بێ، ئەو کەسانە خەڵات دەکا کە بە مرۆڤ و ئەوینی بچووك و بەتەوژمی ئەو قایل بوون.

## (٥)

ئەم ڕووداوانە تەواو دەبن. کاتی ئەوەیە کە دوکتۆر بێرنار ریڤۆ دان بەوەدا بنێ کە نووسەرەکەیەتی، بەڵام بەر لە نووسینەوەی دوایین ڕووداو، لانیکەم دەیەوێ پاساو بۆ دەستێوەردانی خۆی بێنێتەوە و بڵێ کە هەوڵی داوە وەك شایەتێکی بێلایەن بدوێ. هەتا تاعوونەکە هەبوو، پیشەی ئەو وای دەخواست کە پێوەندیی بە زۆربەی هاووڵاتییەکانی خۆیەوە هەبێ و ئاگاداری هەستی ئەوان بێ. کەوابوو بۆ گێڕانەوەی ئەو شتەی کە دیتبووی و بیستبووی، پێگەیەکی باشی هەبوو، بەڵام ویستوویەتی ئەو کارە بە دانبەخۆداگرییەکی دڵخوازەوە راپەڕێنێ. بە گشتی هەوڵی داوە لەوەی بە چاوی خۆی دیتوویە زیاتر نەگێڕێتەوە و بیروبۆچوونێکی وا نەداتە پاڵ هاودەردەکانی سەردەمی تاعوون، کە ناچار نەبوونە هەیانبێ، و تەنیا کەڵکی لەو دەقانە وەرگرتووە کە چارەڕەشی و نەگبەتی خستوویەتییە بەردەستی.

ئەو کە لەسەر جۆرە جەنایەتێك بۆ شایەتیدان بانگ کراوە، بەو جۆرەی شیاوی شایەتییەکی نیازپاکانەیە، بە پارێزەوە هەڵسوکەوت دەکا، بەڵام لەهەمان کاتدا بە پێی یاسای هەر دڵێکی مەزن، لێبڕاوانە لایەنی قوربانیەکەی گرتووە و ویستوویەتی لەو دەگمەن ڕاستییانەی کە لە نێوانیاندا هاوبەش بووە، واتە لە عیشق و ئازار و غوربەت، بکەوێتە گەڵ مرۆڤەکان و هاووڵاتییەکانی. بەو شێوەیە تەنانەت هیچ دڵەخورپەیەکی هاووڵاتییەکانی نیە کە ئەو تێیدا بەشدار نەبێ و هیچ حاڵەتێك نیە کە ئەویش نەگرێتەوە.

بۆ ئەوەی شایەتێکی ڕاستگۆ بێت، ناچار بوو کە بە تایبەتی دیمەن و بەڵگە و دەنگۆکانیش بگێڕێتەوە، بەڵام لەسەر ئەوەی خۆی دەیویست بیڵێ و سەبارەت بە چاوەڕوانیی خۆی و ئازارەکانی،

دەبوو بێدەنگ بێ. ئەگەر کەڵکی لێوەرگرتوون، تەنیا بۆ تێگەیشتن یا تێگەیاندنی هاوولاتییەکانی و یا بۆ پێدانی بیچمێکی تا رادەیەك راشکاوانە بەو شتە بووە، کە ئەوان بە شێوەیەکی ناروون هەستیان پێ دەکرد. ئەگەر راستیتان دەوێ ئەو هەوڵە بەرژەوەندخوازانەیە زۆریش لەسەری نەکەوتووە. کاتێك دەیبینی کە بە دڵیدا هاتووە نهێنیی خۆی تێکەڵاوی دەنگی هەزاران تاعوونلێدراو بکا، خۆی بواردووە و بە خۆی گوتووە کە تەنانەت ئازارێکی ئەو نیە کە ئازاری ئەوانی دیکەش نەبێ و لە دنیایەکدا کە ئازار و ژانەکان هەموو تاکەکەسین، ئەوە خۆی وەك پوانێك چاوی لێ دەکرێ. بێ ئەملاو ئەولا ئەو دەبوو بە ناوی هەمووانەوە قسە بکا.

بەڵام لانیکەم، هاوولاتییەکمان هەیە کە دوکتۆر ریڤۆ نەیدەتوانی بە ناوی ئەوەوە قسان بکا. ئەویش ئەو کەسەیە کە تارۆ رۆژێك سەبارەت بەو بە ریڤۆی گوتبوو:" تاقە تاوانی راستەقینەی ئەو ئەوەیە، کە لە ناخەوە قایل بووە بەوەی منداڵان و مرۆڤەکان دەکوژێ، لەوە زیاتر نازانم چ ژانێکی هەیە، بەڵام سەبارەت بەوەیان ناچارم لێی خۆش بم." شیاوی ئەوەیە کە ئەو رووداوانە، لەگەڵ بەسەرهاتی ئەو کۆتایی پێ بێ، کە دڵێکی نەزان یا باشترە بڵێین تەنیای هەبوو.

کە دوکتۆر ریڤۆ لە کۆڵانە درێژو پڕ لە دەنگەدەنگەکانی سیخناخ لە بەزم و شادی هاتە دەرێ، لەو ساتەدا کە بەرەو لای کۆڵانی گرانت و کۆتار بای دەدایەوە، تووشی ریزێکی پتەوی زێرەڤانان بوو و راوەستا. قریوەقریوی دوورەدەستی بەزم و هەراکە، وای کردبوو ئەو گەڕەکە زۆر بێدەنگ و کپ بنوێنێ و مرۆڤ وای دەزانی کە ئەو کۆڵانانە هاوکات لەگەڵ بێدەنگیدا چۆڵیشن. ریڤۆ کارتی پێناسەکەی دەرهێنا. زێرەڤانەکە گوتی:

ـ نابێ دوکتۆر. شێتێکی لێیە تەقە لە خەڵکی دەکا، بەڵام لێرە راوەستە، لەوانەیە سوودێکت هەبێ.

لەوساتەدا ریڤۆ، چاوی بە گرانت کەوت کە بەرەو لای دێ. گرانتیش ئاگای لە مەحموودی بێزەواد نەبوو. پێشیان بەویش گرتبوو و دەیزانی کە تەقەکە لە ماڵەکەی ئەوەوە دێ. لە دوورەوە، رووکاری ماڵەکەیان دەدی کە تیشکی کەسیرەی خۆرەکە، زەردی هەڵگێڕابوو. چوارتەنیشتی ماڵەکە پاناوکێکی بەرین بوو کە دەگەیشتە شۆستەکەی بەردەمیان. لە نێوەڕاستی کۆڵانەکەوە کڵاوێك و لەتە پەڕۆیەکی پیس دەبینرا. ریڤۆ و گرانت لە دوورەوە دەیانتوانی ریزێکی دیکەش زێرەڤان لەو سەری کۆڵانەکەوە، ببینن کە هاوتەریبی ئەو ریزە راوەستابوون کە پێشیان بەوان گرتبوو. لە پشت ئەو ریزەوە خەڵکەکە بە پەلەپەل، لە هاتوچۆدا بوون. کاتێك بە وردی سەیریان کرد ئەوا پاسەوانی دیکەش دەمانچە بە

دەستەوە لە بەردەم ماڵەکانەوە سێرەیان لە ماڵەکە گرتووە. هەموو پەنجەرەکانی ئەو ماڵە داخرابوون. لەگەڵ ئەوەشدا لە نهۆمی دووەمەوە پەنجەرەیەکی نیوەکراوە دیاربوو. بێدەنگییەکی قووڵ کۆڵانەکەی داگرتبوو. تەنیا دەنگی موسیقایەك کە لە نێوەندی شارەوە دەهات جاروبارە دەبیسرا.

لەو ساتەدا، دەنگی تەقەی دوو دەمانچە لە بیناکەی رووبەڕۆوە هات و لەتوپەتی شووشە پەرش‌وبڵاو بوون. دوایی دیسان بێدەنگی زاڵ بۆوە. لە دوورەوە و، دوای دەنگەدەنگەکانی ئەو رۆژە، ریڤۆ باوەڕی بەو دیمەنە نەدەکرد. لە نەکاو گرانت کە بە توندی هەژابوو، گوتی:

ـ ئەوە پەنجەرەی کۆتارە، بەڵام خۆ کۆتار ون بووە.

ریڤۆ لە پاسەوانەکەی پرسی:

ـ بۆ تەقە دەکەن؟

ـ دەیخافڵێنن. چاوەڕوانن کە ترۆمبیلێك بە کەرەسەی پێویستەوە بگاتێ. چونکە هەر کەس لە دەرگای ماڵەکە بچێتە پێشێ تەقەی لێدەکا. پاسەوانێکی ئەنگاوتووە.

ـ بۆ تەقەی لێکرد؟

ـ روون نیە. خەڵکی کۆڵان خەریکی رابواردن بوون. کاتێك یەکەم تەقە کرا کەس نەیزانی چییە. لەگەڵ فیشەکی دووەم داد و هاوار بەرز بۆوە و نەفەرێك بریندار بوو و ئەوانی تر رایان کرد. بە دڵنیاییەوە شێتە.

لەو بێدەنگییەدا کە باڵی بەسەر وڵاتدا کێشابۆوە، ساتەکان بە هێواشی تێدەپەڕین. بە نەکاو دیتیان لەو سەری کۆڵانەوە سەگێك وەدەر کەوت. ئەوە یەکەم سەگێك بوو کە ریڤۆ دوای ماوەیەکی زۆر دەیدی. "ئێپانیۆل"ێکی پیس بوو کە بە دڵنیاییەوە هەتا ئەو رۆژە خاوەنەکەی لە ماڵەوەدا شاردبوویەوە. بە قەراغ دیوارەکەدا دەهاتە پێشێ. کاتێك لە دەرگاکە نزیك بۆوە، دڕدۆنگ بوو، لەسەر لاقەکانی هەڵتووتەکا و ئاوڕی دایەوە کێچەکانی بگرێ. پاسەوانەکان بە فیتووی پەیتاپەیتا بانگیان کرد. سەری بەرز کردەوە، دوایی بڕیاری دا لەسەرەخۆی بچێتە نێوەڕاستی کۆڵانەکە و بۆن بە کڵاوەکەوە بکا. هەر لەو کاتەدا لە نهۆمی دووەمەوە تەقەیەك کرا و سەگەکە گرمۆڵە بوو و کەوتە لینگەفرتە و ئاخری لەسەر لاتەنیشت کەوت‌و بە وە لەرزین کەوت. لە وەڵامدا پێنج یا شەش فیشەك لە دەرگاکانی رووبەڕۆوە هاویژرا و پەنجەرەکەی شکاند. دیسان بێدەنگی وڵاتی داگرتەوە. خۆر برێك داکشابوو و نسێ لە پەنجەرەی کۆتار نزیك دەبۆوە. دەنگی راوەستانی ترۆمبیل لە کۆڵانەکە و لە پشت سەری دوکتۆرەوە بیسرا. پاسەوانەکە گوتی:

- گەیشتنیّ.

پۆلیسەکان لە حالّێکدا کە گوریسو پەیژەو دوو بەستەی پێچراوەیان هەلّگرتبوو دابەزین. چوونە نێو ئەو کۆلاّنەوە کە بەرەورووی مالّەکەی کۆتار بەدەوری مالّەکاندا دەسووڕایەوە. ساتێك دواتر لەبەر دەم ئەو مالاّنەوە جموجۆلّ پەیدا بوون. ئەوجار چاوەڕوان مانەوە. سەگەکە جوولّەی لیّ بڕابوو، بەلاّم ئیتر لە گۆلاّوێکی رەشدا گەوزیبوو.

لەنەکاو لە پەنجەرەی ئەو مالاّنەوە کە پاسەبانەکان گرتبوویانن، تەقەی بیکەیسی دەستی پێکرد. لە ماوەی تەقەکەدا، ئەو پەنجەرەی تەقەیان لێدەکرد پەرش‌وبلاّو بوو و رووبەرێکی تاریکی لێوە دەرکەوت کە لەو شوێنەوە ریڤۆ و گرانتی لیّ راوەستابوون هیچیان نەدەدی. کاتێك تەقە وێستا، دووەمین بیکەیسی لە گۆشەیەکی دیکەوەو لە مالّێکی دوورترەوە تەقەی دەست پێکرد، فیشەکەکان یەکسەر وەپەنجەرەکە دەکەوتن، چونکە یەکێکیان لەتە خشتێکی هەلّکەند. هەر لەو کاتەدا سیّ پاسەوان بە راکردن بە کۆلاّنەکەدا تێپەڕین و بە خێرایی خۆیان گەیاندە دەرگای مالّەکە. دەمودەست سیّ پاسەوانی دیکەش وەشوێنیان کەوتن و تەقەکە راوەستا. دیسان هەمووان چاوەڕیّ مانەوە. دوو دەنگی تەقینەوەی دوور لە نێو مالّەکەوە هات، دوایی دەنگەدەنگێك هەستاو دیتیان کە پیاوێکی وردیلەی بیّ جوولّەیان لە حالّێکدا پەیتا پەیتا هاواری دەکرد، لەبری ئەوەی بە راکێش راکێش بیهێنن، هەلّیانگرتبوو و دەیانهێنایە دەریّ. وەك بلّێی بەهۆی پەیجۆیەك تەواوی پەنجەرە داخراوەکان بەسەر کۆلاّندا کرانەوە و خەلّکی بەپرسیار سەریان لیّ هێنانە دەرەوە، هەر لەو کاتەدا خەلّکێکی زۆر لە مالّەکانیانەوە هاتنە دەرا و خۆیان گەیاند پشت پاسەوانەکان. بۆ ساتێك کابرا وردیلەیان لە نێوەڕاستی کۆلاّنەکەدا بینی کە ئیتر لاقەکانی گەیبوونە عەرزی و پاسەوانەکان لە پشتەوە دەستیان گرتبوو. هاواری دەکرد. پاسەوانێك لێی نزیك بۆوە. لەسەرەخۆو شارەزایانەو بە هەموو هێزی شان و باهۆیەوە، دوو مستی لە دەموچاوی سرەواند. گرانت بە زمانێکی گیراوەوە گوتی:

- کۆتارە، شێت بووە.

کۆتار کەوتبووە سەر عەرز. دیسانیش پاسەوانەکە پێلەقەیەکی لەو گرمۆلّەبووەی سەر عەرزەکە سرەواند. دوایی دەستەیەك لە پاسەوانەکان و خەلّکەکە بەرەو لای دوکتۆر و هاوڕیّ بەسالاّچووەکەی وەڕێکەوتن. پاسەوانەکە وتی:

- رامەوەستن.

کاتێك ئەو تاقمە بە بەردەم ریڤۆدا تێپەڕین ئەو رووی وەرگێڕا.

گرانت و دوکتۆر کاتی خۆراوابوون وەڕێ کەوتن. وەك بلێی ئەو رووداوە داهێزراویی کۆلانەکەی ڕەواندبێتەوە، کۆلانەکان دیسان پڕ ببوونەوە لە هاتوهەرای خەلکی شاد و بەکەیف. لە بەردەم مالێ، گرانت مالئاوایی لە دوکتۆر کرد. دەڕۆیشت بۆ ئیشکردن، بەلام لەو کاتەدا کە لە پلیکانەکان دەچۆوە سەرێ بە دوکتۆری گوت، نامەی بۆ ژیان نووسیوە و ئێستا رازییە. هەروەها دەستی پێکردەوە. گوتی:" تەواوی سیفەتەکانم لابرد."

بە بزەیەکی بزۆزانەوە کلاوەکەی هەلگرت و کرنۆشی برد، بەلام ریۆ بیری لای کۆتار بوو و دەنگی کپی مستەکان کە دەموچاوی شێواندبوو، شان بە شانی کۆتار دەهات کە بەرەو مالی پیرەمێردە پشووسووارەکە بەڕێوە بوو. وێدەچوو کە بیرکردنەوە لە مرۆڤێکی تاوانبار ئەستەمتر بێ لە بیرکردنەوە لە مرۆڤێکی مردوو.

کاتێك ریۆ گەیشتە مالی نەخۆشە پیرەکە، شەو بەسەردا هاتبوو. لە نێو ژوورەکەوە قریوەقریوی دوورەدەستی ئازادی دەبیسراو پیرەمێرد هەر بەو رووگەشییەی جارانەوە نۆکەکانی لە قابلەمەیەکەوە دەڕشتە نێو قابلەمەیەکی دیکە.دەیگوت:

ـ مافی خۆیانە شادو بە کەیف بن. بۆ سازکردنی جیهانێك هەموو شتێك پێویستە. ئەرێ بەراست دوکتۆر هاوکارەکەت چیی لێهات؟

گوێیان لە دەنگی تەقینەوە دەبوو، بەلام ئەوانە تەقینەوەی بێ مەترسی بوون. مندالان تۆقتۆقیلەیان دەتەقاند. دوکتۆر کە گوشییەکەی لە سەر سینگی نەخۆشەکە دانابوو گوتی:

ـ مرد.

پیرە کە بڕێك داچلەکیبوو گوتی:

ـ ئاخ!

دوکتۆر گوتی:

ـ بە تاعوون.

پیرە دوای ساتێك گوتی:

ـ وایە، چاکەکان دەڕۆن. ژیان هەر ئەوەیە، بەلام ئەو پیاوێك بوو کە دەیزانی چیی دەوێ.

دوکتۆر کە بیستۆکەکەی خڕ دەکردەوە گوتی:

ـ مەبەستت چییە؟

ـ هیچ. ئەو قسەی خۆڕایی نەدەکرد. بە گشتی من خۆشم دەویست. دنیا هەر ئەوەیە. ئەوانیتر دەڵێن:" تاعوونە، ئێمە لەسەردەمی تاعووندا بووین."

تەنانەت ئەگەر پێیان عەیب نەبێ داوای میدالیاش دەکەن، بەڵام تاعوون یانی چی؟ ژیانە ژیان.

ـ بەردەوام دەرمان بدەن.

ـ ئەی، مەترسن، ئەمن بەم زووانە نامرم و مەرگی هەمووان دەبینم. ئەمن دەزانم چۆن بژیم.

قریوە و دەنگەدەنگی شادی لە دوورەوە وەڵامیان دایەوە. دوکتۆر لە نێوەڕاستی ژوورەکە راوەستا:

ـ بەلای تۆوە ئیرادێکی نیە بچمە سەر هەیوانەکە؟

ـ چ ئیرادێکی هەیە. دەتەوێ لەسەرەوە بیانبینی؟ تکایە فەرموون، بەڵام هەمیشە هەر ئەوەن کە بوون.

ریڤۆ بەرەو پلیکانەکان وەڕێکەوت.

ـ بەراستی دوکتۆر، راستە کە گەرەکیانە مۆنۆمێنت بۆ مردووەکانی تاعوون ساز بکەن؟

ـ رۆژنامەکان وا دەڵێن. پەیکەرێکی بەردین، یا بەردەنووسراوێك.

ـ دڵنیا بووم. چەند وتارێکیش دەدەن.

پیرەمێرد بە نەرمی پێکەنی:

هەر لە ئێستاوە گوێم لە دەنگیانە:" مردووەکانمان..." دواییش دەچن زگێك تێر بکەن.

ریڤۆ گەیشتبووە پلیکانەکان. ئاسمانی پان و بەرینی سارد بەسەر ماڵەکانەوە دەدرەوشایەوەو لە نزیك گردەکانەوە ئەستێرەکان لە بەردە چەخماخەیەکی رەق دەچوون. ئەو شەوە جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ ئەو شەوەی کە ئەوو تارۆ هاتبوونە سەر ئەم هەیوانە بۆ ئەوەی تاعوونیان لەبیر بچێتەوە، بەڵام ئەم شەو دەریا لەبەردەم تاشەبەردەکانەوە لەوێ شەوێ بەگوڕتر بوو. هەوا قەتیس و سووك بوو و ئەو پشووە سوێرانەی پێوە نەبوو کە بای نیوەگەرمی پایزی لەگەڵ خۆی دەیهێنا. لەگەڵ ئەوەشدا، قریوە شار لەگەڵ دەنگی شەپۆلان دەگەیشتە بەرهەیوانەکە، بەڵام ئەو شەوە شەوی رەزگاری بوو، نەك شەوی یاخی بوون. لە دوورەوە رەشاییەکی سووربا‌و بۆلوارەکان و گۆڕەپانە چراخان کراوەکانی نیشان دەدا. لە شەوێکدا کە ئێستێ ئازاد کرابوو، هەوەس کۆت و هەوساری پچڕاندبوو و ئەوەش نەڕڕی ئەو بوو کە دەگەیشتە گوێی ریڤۆ.

لە بەندەرگە تاریکەکەوە، یەکەمین ئاگرپژێنەکانی جێژنە بەرەو ئاسمان چوون. شار بە هاوارێکی بەرز و لێڵەوە پێشوازیی لێکردن. کۆتار و تارۆ و ئەو ژن و پیاوانەی کە ریڤۆ خۆشی ویستوون و لە

دەستی دابوون، یا مردوو یا تاوانبار لە بیر چووبوونەوە. پیرەمێردەکە حەقی بوو. مرۆڤەکان هەمیشە هەر ئەوەن کە بوون، بەڵام هێز و بێ خەوشیی ئەوان لەگۆڕێ بوو و، لێرەدا بوو کە ریڤۆ لە سەرووی هەر ژان و ئازارێکەوە هەستی دەکرد کە تێکەڵیان بێ. لە نێو ئەو هاتوهاوارانەدا کە لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی ئاگرپژێنە رەنگاورەنگەکان لە ئاسماندا بەردەوام روو لە زیادبوون، بوون و بە زایەڵەی دوورودرێژەوە دەگەیشتنە بەرهەیوانەکە ریڤۆ بڕیاری دا ئەو بەسەرهاتە بنووسێتەوە کە لێرەدا دەگاتە کۆتایی، بۆ ئەوەی لەو کەسانە نەبێ کە بێدەنگ دەبن، بۆ ئەوەی بە قازانجی تاعوونلێدراوان شایەتی بدەن، بۆ ئەوەی لانیکەم مۆنۆمێنتێك لەو زوڵم و توندوتیژییە بەجێ بێڵێ کە دەرهەق بەوان کراوە و، تەنیا بڵێ کە ئەوەی لە نێو نەهامەتییەکاندا فێری دەبێ ئەوەیە کە لە نێو تاکەکانی مرۆڤدا ئەوەی شیاوی پەسن و پێداهەڵگوتنە، پترە لەوەی شیاوی سووکایەتی پێکردنە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەیزانی کە ئەو بەسەرهاتە ناتوانێ بەسەرهاتی سەرکەوتنی کۆتایی بێ. تەنیا دەکرێ نیشاندەری ئەو کارە بێ کە ئەو ناچار بووە بیکا و بێ گومان دەبێ هەموو مرۆڤەکان کە ناتوانن ببنە پیاوچاك و خۆ لە نەهامەتی دەبوێرن و هەوڵ دەدەن بچنە ریزی پزیشکانەوە، سەرەڕای ئاڵۆزی و پەرش‌وبڵاویی خۆیان، بە دژی ترس و چەکی ماندوویی نەناسی ئەو، دەبێ بیکەن.

ریڤۆ گوێی لە دەنگی ئەو هاواری خۆشی و شادییە دەبوو کە لە شارەوە هەڵدەستا و وەبیری دەهاتەوە کە ئەو شادییە بەردەوام لەبەردەم مەترسی دایە. چونکە دەیزانی ئەو خەڵکە بەکەیفە نازانن، بەڵام دەکرێ لە کتێبەکاندا بیبینی کە ڤایرۆسی تاعوون هەرگیز نامرێ و لە نێو ناچێ، و دەتوانێ دەیان ساڵ لە نێو کەلوپەلی ماڵەکان لە نوێنەکاندا بنوێ، لە نێو ژوورەکاندا، لە ژێرەمینەکاندا، لە جانتاکاندا، لە دەسرۆکەکاندا و لە کۆنەکاغەزەکاندا چاوەڕوان بێ و لەوانەیە رۆژێك دابێ کە تاعوون بۆ چارەڕەشی و فێرکردنی مرۆڤەکان، مشکەکانی لەخەو هەستێنێ و بیاننێرێ کە لە شارێکی بەختەوەردا بمرن.

پرسیار: بیرۆکەی وەرگێڕانی رۆمانی ( تاعوون) لای بەڕێزت چۆن درووستبوو، بەگشتی بوونی ئەو رۆمانە بەزمانی کوردی چ گرنگییەکی بۆ خوێنەری ئێمە هەیە؟

سەرباز بووم کە تاعوونم خوێندەوە. ساڵی ٢٠٠٠. لە کەرەج. کەشی نێو رۆمانەکە نوقمی خۆی کردم. هەتا ئەم دواییانەش بەری نەدابووم. ساڵی رابردوو کتێبەکەم وەدەست کەوت. شاگەشکە بووم. دیسان خوێندمەوە. پێم حەیف بوو نەکرێتە کوردی. زۆریشی لێ دەترسام. بەڵام من وەکوو گورگ وام و لە خشپەی دەچمە پێشێ. منداڵی گوندم و ترس لە بری ئەوەی بمپرینگێنێتەوە، پتر غیرەتم وەبەر دەنێ. با لەپێشدا ئەوەش بڵێم ئەگەر بزانم دەرەقەتی دەقێك نایەم بۆ سەت ملوێن دیناریش خۆی لێنادەم ئەگەر بزانم خەساری دەکەم. هیوادارم تاعوونم خەسار نەکردبێت. دەمزانی زۆر قورسە بەڵام بەهۆی ئەوەی لە منداڵیمەوە لەگەڵ بەیت و باڵۆرە و حەیران و چیرۆکی گوێی ئاگردان گەورە بووم و گوێم بە قسە و حەقایەتی پێرەژنانی گوندی و پرتە و بۆڵەیان ئاو دراوە و مێشکم بە ئیدیۆم و قسەی نەستەقی کوردەواری زاخاو دراوە، لێم سوور بوو نامبەزێنێت. ئیتر قۆڵم لێ هەڵماڵی...

بەڵام گرینگیی رۆمانەکە بۆ خوێنەری ئێمە:

رۆمانی تاعوون رۆمانێکی فرەڕەهەندە. تێم و هەوێنی رۆمانەکە بەرگری و خۆڕاگرییە. بەشداریکردنی تاکە لە خەباتێکی بەکۆمەڵدا. هەڵبژاردنێکە لە نێوان ژیانی تاکەکەسی و خۆقوربانیکردن لە پێناوی کۆمەڵدا.

بەڵا و نەهامەتییەکی سامناك شارێك دەتەنێتەوە. کەس لە پەتای تاعوون پارێزراو نییە. ئەو شارە پێش ئەوەی بەڵای لێ ببارێت و تووشی ئەو پەتایە بێت، شارێکە، کە خەڵکەکەی نوقمی ژیانی رۆژانەیانن و ئەو پەڕی چالاکییەکانیان کار کردن و خواردن و خەوتنە. شارێك بەتاڵ لە هەر چەشنە عەشق و خۆشەویستی و بەزەیی و بیرکردنەوەیەك. مرۆڤەکانی ئەو شارە نوقمی ژیانێکی ماشێنین. بوونەتە رۆبۆت. بیر ناکەنەوە. کەس بیر، نەك لە کەسیتر، بەڵکوو لە

خۆیشی ناکاتەوە. غیابی بیرکردنەوەیە. تاعوون دێت و ویژدانی نووستووی شار رادەچڵەکێنێت. رەنگە بفەرمووی جا ئەوە چ گرنگییەکی بۆ ئێمە هەیە. سەیرکە بارودۆخی ئێستای کوردستانەکەی خۆمان چۆنە؟ ئێمەش لێرە لە ئاستی سەرەوەدا لە دوای ٢٠٠٣ـەوە پێمانوایە گەیشتووینەتە شاری ئایدیال و خەونەکان(مدینه فازله). کەس بیر لە هاتنەوەی تاعوون ناکاتەوە و بە مەحاڵی دەزانین. بەعس تاعوونێك بوو. هەتا ئەو هەبوو، هەموومان بیرمان دەکردەوە. هەموومان بە دڵسۆزییەوە ئیشمان دەکرد. بەس بڕوانە بەرهەمەکانی کۆڕی زانیاریی کورد لەوکاتدا... چ لە گەندەڵی دەبینی؟ ئەدی چ لە دڵسۆزی؟ ئەدی ئێستا؟ لەو شاری ئایدیالە خەڵەتێنەرو درۆزنەی ئێستاماندا چ شتێکمان بایەخی ماوە؟ چ شتێك رێزی ماوە؟ کارم بەسەر ئەوەوە نییە خەتای کێیە. من پرسیار دەکەم. منیش لەگەڵ بە پیرۆزکردندا نیم. لایەنگری رەخنەم،بەڵام لەگەڵ سڕینەوەی تەواوی بایەخەکانیشدا نیم. ئێستا لە نیشتمانەکەی مندا(لێرە) پۆشینی جلوبەرگی کوردی شوورەییە. هەر لەو سلێمانییە، بە گوێی خۆم گوێم لێبووە گاڵتەیان بە جامانە و جلوبەرگی شێخ مەحموودی نەمر کردووە. بۆ؟ لە یەکێك لە فیستیڤالەکاندا یەکێك لە ئەندامانی سەرکردایەتیی حیزبێکی کوردستانی هاواری کرد:(بەسە کاکە بەسە،واز بێنن لە شێعری حیماسی و نیشتمانی... سەردەمی ئازادی، شێعری دیکەی دەوێت). هەر ئەو بانگەشەکارانە کە هەست بە هاتنەوەی پەتای تاعوونی بەعس لە رەنگە نوێیەکەیدا دەکەنەوە، کاتێك لەشکری حکوومەتی ناوەندی دێت و داوای خاکی کوردستان دەکاتەوە، یا لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکاندا، دێن و جلوبەرگی کوردی دەپۆشن و سروودە حیماسییەکان لە TVـەکانەوە بڵاو دەکەنەوە و کە تاعوونەکە دەنیشێتەوە دیسان بایەخە نیشتمانییەکانمان بە هەمان روانگەی پڕ لە سووکایەتییەوە سەیریان دەکرێتەوە. بۆ؟ بۆچی مامۆستای زانکۆ پێی شەرمە بە جلی نەتەوەکەیەوە بچێتە پۆل؟

ئێمە هەمیشە تاعوون رێکماندەخاتەوە. تاعوون نەبێ لە خەوی هەمیشەییماندا بۆگەن دەکەین. بەڵام هیوادارم بەر لەهاتنی تاعوون و داخرانی دەروازەکانی شار بەسەرماندا، فریای خۆمان بکەوین و تاعوون لە خەودا بەسەرماندا نەدات. بەر لەوەی تاعوون بمانهاڕێت هوشیار بینەوە.

لەو شوێنەدا کە دوکتۆر ریڤۆ لە وەڵامی قەشە پانیلۆدا دەڵێت: ئەمن ناتوانم بانگەشەی رزگارکردنی مرۆڤ بکەم. ئەوە بەردێکی قورسە و بە من هەڵناگیرێت. ئەمن تەندرووستیی مرۆڤم گەرەکە. سەیرکە لێرەدا کامو چەندە گرینگیی بە بەختەوەری و تەندرووستیی مرۆڤ لەسەر گۆی زەوی دەدات. ئیمڕۆ لە جیهانی ئێمەدا گرووپە جیهادییەکان بانگەشەی رزگاریمان دەکەن. بەڵام لەپێناوی ئەو بەهەشتەدا کە بانگەشەی بۆ دەکەن لێرە لەسەر زەوی جەحەندەم(دۆزەخ)ـێکیان بۆ نێڵ داوین. ئەوان تەندرووستی و بەختەوەریی مرۆڤیان لە پێناوی رزگارییەکدا خستۆتە مەترسییەوە کە... بەڵام کامو دەڵێ: لێرە بەختەوەریم پێ ببەخشە.

پێموایە تا رادەیەك وەڵامی پرسیارەکەتم داوەتەوە.

پرسیار: زۆرێك لە وەرگێڕکارانی ئێمە تەنها وەك ئارەزوویەك کاری وەرگێڕانی ئەدەبی دەکەن، رەنگە زۆرجار ئاگاییو مەعریفەیان لەسەر دنیای ئەو رۆمانو تێکستە یان کولتوورو زمانو شەخسی نووسەرکە نەبێت، زیانەکانی ئەم وەرگێڕکارانە چینو تۆ ئەم حاڵەتە چۆن لێکدەدەیتەوە؟

وەرگێڕان تەنیا بە ئارەزوو ناکرێت. کەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ. وەرگێڕان شەڕێکی تاقەتپڕووکێنە و پێویستیی بە هەموو ئەو چەك و توانایانەیە کە لەو مەیدانەدا دەبێت بخرێنە کار. من خۆم کاتێ دەست دەدەمە دەقێك بۆ وەرگێڕان، ئەگەر لەگەڵ رۆح و دەروونم سازگار نەبێت و خوێندنەوەکەی چێژم پێ نەبەخشێت، ناتوانم تاقە دێڕێکیش چییە لێی وەرگێڕم. دەبێ لەگەڵیدا بژیم. لەبیرمە پێشەکیی(وەهای گوت زەردەشت)ـی نیچەم دەخوێندەوە. پێشەکیی وەرگێڕەکەی. (داریوش ئاشووری) دەڵێ: نزیك بە سی ساڵ بوو بە زمانی سەرەکی دەمخوێندەوە تازە بە ترسەوە وێرام دەستی بۆ بەرم بۆ وەرگێڕان. بەڵام ئێمە وەرگێڕمان هەیە لەگەڵ پرۆسەی وەرگێڕانەکەیدا دەقەکە دەخوێنێتەوە. برادەرێکم خەرێکی وەرگێڕانی کتێبێك بوو. لە نیوەیدا هاتە لام گوتی: چی لێ بکەم ١٢٠ لاپەڕەیم وەرگێڕاوە، ئێستا دەبینم دژی زمانی کوردی قسە دەکات...

ئەوە کوێی وەرگێڕانە؟! ئەوکەسانە ئەگەر زۆریش زمانزان بن، لانیکەم تووشی هەڵەی زۆر زەق دەبن. چونکە زاڵ نین بەسەر جیهانی دەقەکەدا و لە جیهانبینی و شێوەڕوانینی نووسەرەکەی

تێنەگەیون، بە دڵنیاییەوە دەقەکە وەها ئاڵۆز دەکەن خوێنەر نەتوانێ سەرەدەری لێ دەربکا. ئەگەر بەوحاڵەشەوە تێیدا سەرکەوت پەرجوی کردووە.

پرسیار: بێگومان ( تاعوون) یەکێکە لەشاکارە جیهانییەکانی ( کامۆ) هاوکات لەجۆری ئەو تێکستانە نین کە بەئاسانی خۆیان بدەن بەدەستی خوێنەرەوە، بەڵام تۆ تا ئەندازەیەکی باش توانیوتە لە وەرگێڕانەکەیدا سەرکەوتووبیت، بەگشتی پێمان بڵێ تۆ چ زانیاریو مەعریفەیەکت لەسەر دنیای ئەو رۆمانەو نووسەرەکەی هەیەو ئەو زەحمەتانە چیبوون کە لەکاتی پرۆسەی وەرگێڕانەکەیدا بۆت هاتنە پێشەوە؟

لە پرسیاری پێشتردا کورتە ئاماژەیەکم بە چۆنێتیی ناسینی رۆمانی تاعوون و روانگە و جیهانبینیی نووسەرەکەی، کرد. کامو نووسەرێکە سەر بە رێبازی ئەگزیستانسیالیزم. ئەو بڕوای بە ئازادیی کردەیی(پراکتیکی) هەیە. بە لای ئەوەوە ئازادی لە کردەوەدا مانای هەیە. ئەوان پراگماتیستن. هەر وەك چۆن لە جیهانی دەقەکەشدا دەبینین، دکتۆر ریڤۆ کە دەکرێت کامو خۆی یا سێبەری رۆحی خۆی بێت، بەبێ هیچ دڵەڕاوکێ و ترسێك لە تاعوون قۆڵی هیممەت هەڵدەماڵێت و دەست دەکات بە پشکنین و چارەسەرکردنی نەخۆشەکان، بیر لەوە ناکاتەوە خۆی دەرباز بکات و بۆ جارێکیش ترسی ئەوە بە دڵ و مێشکیدا ختوورە ناکات کە لەوانەیە ئەویش تووش بێت. هەتا دوایین چرکەساتەکانیش ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدات. ژان تارۆ، خەڵکی ئەو شارە نییە. ئەویش وێڕای د.ریڤۆ شان دەداتە بەر قورسایی ئەو ئەرکە مرۆییە و ناوەندەکانی یارمەتیدان لەگەڵ ریڤۆ دادەمەزرێنێت. رامبێری رۆژنامەنووس کە لەگەڵ داخرانی دەروازەکانی شار، هەموو هەوڵ و تواناکانی بۆ خۆدەربازکردن لەشاری تاعوونلێدراو دەخاتە گەڕ بەڵام لە کۆتاییدا، تەنیا چەند ساتێك بەرلەوەی پاسەوانە قاچاخچییەکان، ئاودیوی بکەن، پەژیوان دەبێتەوە و دێتە یارمەتیی برادەرەکانی. ئەو جیهانە، جیهانێك نییە لانیکەم بۆ ئێمەی کورد نامۆ بێت.

سەبارەت بە زەحمەتەکانی ئەم وەرگێڕانە، ئەوکەسەی بەهەر مەبەستێك رۆژێك لە رۆژان تاقە دێڕێکی لەهەر زمانێکەوە وەرگێڕابێت، دەزانێت هیچ وەرگێڕانێك بێ چەرمەسەری نییە.

بەتایبەتی وەرگێڕانی دەقێك كە سەر بە نەتەوەیەكە، كە لە زمان و كولتوور و كەلەپوور و خەیاڵدا، هیچ خاڵێكی هاوبەشیان نەبێت. ئەوەی وەكوو بەهێزترین خاڵی هاوبەش پێكەوەمان گرێدەدات، مرۆڤ بوونمانە. بەتایبەتی خۆدۆزینەوە لەنێو جیهانی دەقەكەدا، بەهۆی ئەو ئازار و نەهامەتییانەوە كە بەسەر ئێمە هاتوونەو ئێمەش وەكوو شاری (ئۆران) تاعوونمان بەسەردا هاتووە و ئێستاش بەشی هەرەگەورەی نیشتمانەكەمان هەر لەبن بارستایی تاعووندا دەناڵێنێت. بۆیە لێك نزیكین. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی ئەوەی هەر زمانێك لە داڕشتن و گەیاندنی واتا و مانادا خاوەنی پێكهاتەی تایبەت بەخۆیەتی، لەگەڵ ئەوەشدا كۆمەڵێك واتا و ئیدیۆم هەن كە خۆبەدەستەوە نادەن، ناچار دەبێت پەنا بەریتە بەر داهێنان. خۆی وەرگێڕان جۆرێكیشە لە خولقاندنەوەو ئافراندنەوە. لێرەدایە كە كاری وەرگێڕ لە پیشە و زمانزانی دەترازێت. لێرەدایە وەرگێڕ جگە لە زانینی زمان دەبێت خولقێنەر بێت. بە تایبەتی لە داڕشتندا دەبێت هەوڵ بدرێت كە گونجاوترین وشە نەك هەر لەباری واتاییەوە بەڵكو لەرووی موسیقای ناوەكیشەوە، هەڵبژێریت. ناسینی موسیقای وشە، وشەی خۆش ئاواز، پێویستیی بە ژیانێكی بەردەوام لەگەڵ شێعردا هەیە. لەگەڵ ئەدەبدا. ئەوە رای خۆمە. ئەگەر وەرگێڕ موسیقای ناوەكیی وشە نەناسێت كە زۆربەی هەرە زۆری وەرگێڕانەكەمان لەو خاڵە گرینگە خافڵن، بە دڵنیاییەوە دەقە وەرگێڕدراوەكەیان خوێنەر ماندوو و شەكەت دەكات. وەك ئەوە وایە بە پێی پەتی بەنێو كێڵگەیەكی ناڕێكی پڕ لە دڕك و پێكوڵدا بڕۆیت. بەڵام هەڵبژاردنی وشەی موسیقایی وادەكات كە خوێنەر هەست بكات بەسواری بەلەمێك بەسەر شەپۆلی نەرم و هێمنی دەریادا دەڕوات.

پرسیار: وێڕای هەوڵی شەخسی خۆت و ئەركی بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوكردنەوە، بەڵام خوێنەر هەست بەكۆمەڵێك كەموكووڕی دەكات لە رۆمانە وەرگێڕاوەكەدا، رەنگە خەلەلی چاپكردن ئەو كەموكووڕیانەی درووستكردبێت، بەگشتی پێمان بڵێ ئەو كەموكووڕیانە چین خۆت هەستت پێكردووەو پێمان بڵێ بۆچی زۆربەی جاران كتێبەكان بەخواستی خاوەنەكانیان چاپ و بڵاو ناكرێنەوەو كەموكوڕییان تێدەكەوێت؟

با له کۆتایی پرسیارەکەتەوە وەڵامت بدەمەوە. بۆ کتێبەکان بە خواستی خاوەنەکانیان چاپ ناکرێن. نامەوێ کەس خەتابار بکەم. بەڵام لە باشووری کوردستان بەگشتی هەوڵێکی کوشندە لە ئارادایە بۆ کوشتنی شێوازە(ستایل) جۆراوجۆرەکان. وەرە با ٥٠ کتێبی جیاواز لە وەرگێڕگەلی جیاواز بە یەك بگرین. زمانەکەیان و شێوازی داڕشتنەکەیان. هەست بە کەمترین جیاوازی لە شێوازی نووسینیاندا دەکەیت. بۆ؟ لەبەر ئەوەی لەبری ڕێنووسەکە زمانەکەیان یەکدەست کردوون. ئەگینا تۆ لەسەر ئەو باوەڕەیت کە ئێمە هەمووومان وەکوو یەك قسە دەکەین؟ من زۆر جاران کە قسەیەکم بۆ دەگێڕنەوە، تاڵ بێت یان نەستەق، بەمەرجێك خاوەنی قسەکەم پێشتر ناسیبێت و قسەم لێ بیستبێت، بەبێ ئەوەی ئاماژەی پێ بکرێت ئەگەر دڵنیاش نەبم لانیکەم مەزەندەی ئەوە دەکەم ئەو قسەیە هی ئەوە. ئێمە هەرکاممان دایکێك گەورەی کردووین. هەمووومان کوردین بەڵام ئەوەی پێی دەگوترێت لەبز(لەحن) لەهەرکامێکماندا جیاوازە، تەنانەت لە منداڵەکانی یەك بنەماڵەشدا. بە باوەڕی من شێوازی نووسین و لەبزی ئاخافتنی هەر کەسێك هێندەی دەنگی ئەو کەسە لەکاتی گۆرانی چڕیندا لە ئەویتر جیاوازە. بەڵام لێرە دەبێت نووسینەکانمان بەگشتی یەك لەبز و ستایلیان هەبێت. ئەوە ناوچەگەرێتییەکی سامناك و مەترسیدارە. سەیرکە وەرگێڕانی فارسەکان، ئەگەر تۆزێك بە سەرنجەوە لێی وردبیتەوە شێوازی وەرگێڕانی (محەممەدی قازی و نەجەفی دەریابەندەری و مەهدیی سەحابی و ڕەزا سەید حوسێنی و سالح حوسێنی و...) تەواو لێك جیاوازن. هیچ بڵاوکەرەوە و ناوەندێکیش ئەو ئیزنە بەخۆی نادات سەروگوێی زمانەکەیان تێك بشکێنێت بۆ ئەوەی پێیوابێت خزمەت بە زمان دەکات. ئەوە خزمەت بە زمان نییە. دوور نارۆین، با ئاوڕێك لە وەرگێڕە پێشەنگەکانی خۆمان بدەینەوە، سەیری وەرگێڕانەکانی (هەژار موکریانی و هێمن و عەبدوڵا حەسەنزادە و شوکور مستەفا و عەزیز گەردی...) بکە، بزانە چۆن هەست بە جیاوازییەکانیان دەکەیت. هیچکامیشیان نەك غەڵەت نین بەڵکوو سەرچاوەیەکن کە ئێمە بەردەوام دەبێت پشتیان پێ ببەستین. نەك وەکوو برادەرێکی نەخوێندەواری بێ ئاگا لە زمان گوتبووی:"ئەو زمانەی هەژار و هێمن و عەبدوڵا حەسەنزادە پێی دەنووسن کۆن بووە". بۆیە دەڵێم نەخوێندەوارە، لەبەر ئەوەی نەیزانیوە گەورەترین وەرگێڕی فارس محەممەدی قازی لە

وەرگێڕانی (دۆن کیشۆت)دا دەگەڕێتەوە بۆ زمانی ئاخافتنی سەدەی چواری کۆچی کە (بەیهەقی) پێی نووسیوە. شاملوی مەزنیش هەر دەگەڕێتەوە سەر ئەو زمانە. ئەمن لەگەڵ ڕێنووسی یەکدەستدام. پێمخۆشە لە سەرانسەری کوردستاندا یەك ڕێنووسمان هەبێت بەڵام بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ یەکدەستکردنی ستایل و لەبزی تاکەکەسیدا نیم. لەگەڵ ئەوەدا نیم شێوازەکان بتوێنینەوە، ئەوە خزمەت نییە.

بەڵام لێرە نابێت خوێنەر هەست بەوە بکات من خەڵکی موکریانم و تۆ خەڵکی ... و ئەویتر خەڵکی فلان ناوچەی کوردستانە. کتێبەکە لەهەر شارێك چاپ بکرێت دەبێ وەرگێڕەکە بە شێوەزاری ئەو شارە بنووسێت یا دەقەکەی لێدەکرێتە شێوەزاری ئەو شارە. بیانووەکەش ئەوەیە کە خەڵکی شارەکەی ئێمە لە شێوەزاری شار و ناوچەکەی ئێوە تێناگەن. هیچ وانییە. با بێین فەرهەنگۆك بۆ وشەکانمان بنووسین کە ئەوە زمانیش دەوڵەمەندتر دەکات. نەك قەتیسکردنی لە لەهجەی ناوچە و شارێکدا. ئەمن ڕاشکاوانە دەڵێم خوێندەواری ئێمە نەك لە شێوەزاری موکریان بەڵکوو لە زمانی ئەو پیرەژنە گوندییانەی دەوری شارەکانی خۆیشیان تێناگەن. کامە خوێندەواری ئێمە لە وشەی نێو گۆرانییە فۆلکلۆرییەکان ورد دەبێتەوە؟ کێهە نووسەرمان سەر بەماڵی دەوڵەمەندی بەیت و حەیران و لاوکەکاندا دەکات بۆ ئەوەی وشە و داڕشتنی پەتییان لێ فێر بێت؟ ئەوە تاوانی ئێمەی وەرگێڕ و نووسەرە خوێنەرمان قەڵب و تەوەزەل بارهێناوە. پێوەر و بنەمای من بۆ نووسین وهەڵبژاردنی وشە، بەڕاستی خوێندەوارەکانمان نییە. بەڵکو لە خەیاڵی خۆمدا ئەوکاتەی خەریکی وەرگێڕانم، بەردەنگی من پیرە پیاو و پیرە ژنە نەخوێندەوارەکانی کوردستانە. ئەوانەی کە ئێمەی خوێندەوار دەبێت زمانیان لێ فێر بین. مامۆستا هێمن لە پێشەکیی "تاریك و روون"ـدا باس لەوەدەکات کە شێعرەکانی خۆی بۆ ئەو پیرەپیاوە نەخوێندەوارانە دەخوێندەوە کە لە بەربەڕۆچکەکان خۆیان وەبەر تیشکی خۆر دەدا. ئەگەر ئەوان پەسندیان کردبا ئەوا خۆیشی پەسندی دەکرد. کێ دەتوانێ بڵێ دەقەکانی هێمن کۆن بوونە؟ من ناڵێم وەرن فەلسەفەش بە زمانی نەنکمان بنووسین. بەڵام دەکرێت هەر لەو وشانە کەڵك وەرگرین کە لەوانەوە فێریان بووین و بۆ چەمکە نوێیەکانیش بگەڕێینەوە سەریان. با بزانین هەژار بۆ وەرگێڕانی (چوارینەکانی خەیام) چۆن کەڵك لەو زمانە وەردەگرێت. مەگەر

چوارینەکانی خەیام ناچنە نێو خانەی بیری فەلسەفییەوە؟ با، بەڵام هەژار هاتووە زمانە تایبەتەکەی بۆ وەرگێڕانی ئەو فەلسەفە و حیکمەتە دۆزیوەتەوە. هەر بۆیەش دەرەقەتی هاتووە و بگرە لە زۆر جێدا پەیامەکەی هەژار فەلسەفیتریشە. هەر ئەدەبیبێکی دەمارگرژانە رقی لە هەژار نەبێ و فارسی لە من باشتر بزانێ، وەبالّم بۆ دەکێشێ. بەڵام ئێستا خوێندەوارەکانمان خوویان بە هەڵدانەوەی لاپەڕەی قامووس گرتووە بۆ دۆزینەوەی سادەترین مانای وشەکان و کە لاپەڕەکەش دادەنەوە ماناکەیان لەبیر دەچێتەوە. وەرگێڕمان هەیە زیاتر لە ٣٠ کتێبی چاپ و بڵاو بووەتەوە، وشە بە وشەی فارسییەکەی لە رووی قامووسەوە دەکاتە کوردی، بەو حاڵەشەوە هەر فارسییەکەی لە کوردییەکەی بەهێزترە. ئاخر یەکێك لە گەورەترین کێشەکانی وەرگێڕی کورد ئەوەیە کوردی باش نازانن، نەك ئەو زمانەی لێی تەرجەمە دەکەن.

پرسیار: بەگشتی ئەو خەسڵەتانە کامانەن کە وەرگێڕی سەرکەوتووی پێدەناسرێتەوە، ئاخۆ تەنها شارەزابوون لەزمانێکی جیهانیدا بەسە بۆ ئەوەی دەست ببرێت بۆ وەرگێڕان؟
بە باوەڕی من هەموو وەرگێڕێکی کورد، پێویستە بە قووڵی نەك رووکەشیانە موتاڵای فولکلۆری کوردی بکات و بەوردی بیخوێنێتەوە. بەیت و حەیرانەکان خەزێنەیەکی گەورەی زمانن. خوێندنەوەی بەردەوامی ئەو دەقە کوردییانەی کە پاراون. پێشەکیی شەرەفنامە و دەقەکەی، "لەکوێوە بۆ کوێ" پێشەکییەکی تاریك و روون، حەمەدۆك، وەرگێڕانەکانی شوکور مستەفا، وەرگێڕانەکانی د.عەزیز گەردی و ئەو رۆمان وچیرۆکانەی کە لە کتێبخانەی کوردیدان. ئێمە کۆمەڵێك نووسەری باشمان هەیە کە رۆمان و چیرۆکەکانیان وەکوو قوتابخانەیەك دەکرێت تێیاندا فێری زمان بین. هەرچی بە کوردی قسەی کرد یا لە مەکتەب و زانکۆ کوردیی خوێند کوردیزان نییە. کوردیزانینیش جۆرە عیشقێکە. خۆ ماندووکردنی گەرەکە. با باوەڕ بەوە بێنین وەرگێڕان بە یارمەتیی قامووس ناکرێت و ئەو وەرگێڕانەی کە بە یارمەتیوەرگرتن لە قامووس دەکرێت، نەك سەرکەوتوو نابێت بەڵکوو کەس تەنانەت وەرگێڕەکەشی تاقەتی نابێت بیخوێنێتەوە.

باشترین وەرگێڕانیش ئەوەیە کە، لە دەقی وەرگێڕداودا هەست بەوە نەکەیت وەرگێڕداوە. سەرکەوتوویی دەقی وەرگێڕدراو ئەوکاتە دەسەلمێندرێت کە خوێنەر وابزانێت نووسراوە. ئەوەی (رەزا سەید حوسێنی) دەڵێ:"لە دەقی وەرگێڕدراودا نابێت هەست بە حوزووری وەرگێڕ بکەیت". کە تۆ دەقەکەت خوێندەوە و هەستت بە ناسرووشتیبوونی زمانی داڕشتن و ئاخافتنەکەی کرد ئیتر ئەوە وەرگێڕان نییەو کارەساتە.

شارەزابوون لە زمان، مەرجی پێویستە بەڵام هەموو مەرجەکان نییە. مەرجی یەکەمە. ئەو هەمووە خەڵکەی فارس هەیە ئینگلیزییش دەزانن بەڵام چەند وەرگێڕێکی سەرکەوتوویان هەیە. بۆ؟ لەبەر ئەوەی جگە لە زانینی زمان وەرگێڕان پێویستیی بە کۆمەڵێك تایبەتمەندیی دیکە هەیە. یەك لەوان ناسینی رەهەندەکانی زمانە. ناسینی تواناکانی زمانە. ناسینی مۆسیقای وشەیە. ناسینی کولتوور و کەلەپووری خۆی و ئەو گەلەیە کە لە زمانەکەیانەوە وەردەگێڕێت. توانای نووسینە. ژیانە لەگەڵ وشەدا. لەهەمووی گرینگتر ئازایەتییە لەوەدا کە ئەگەر دەرەقەتی دەقێك نەهات بوێرێت بڵێ بەردێکی قورسە و بە من هەڵناگیرێت. لەوەش گرینگتر عیشقە. عیشقی وەرگێڕان. بە گشتی وەرگێڕی کورد، دەبێ وێڕای پاراستنی ئەمانەتی دەق و گەیاندنی پەیامی سەرەکیی دەقەکە تا ئەو جێگەیەی بۆی دەلوێ و تواناکانی زمانەکەی ئیزنی پێدەدەن، دەبێ بتوانێ رۆحێکی کوردانەی بەبەردا بکات. ئەویش نەك بە گۆڕینی کەشی نێو دەقەکە بەڵکوو ئەمەیان بە داڕشتنی خۆماڵییانەی بەدوور لەهەرچەشنە داتاشینێکی دەستکردانەی وشە دەکرێت.

پرسیار: تۆ پێشتر جگە لەوەرگێڕانی رۆمانو بەرهەمی ئەدەبی کارت لەبابەتی فەلسەفیو سیاسیو فکریشدا کردووە، هەر یەك لەوجۆرە وەرگێڕانانەش شێوازی زمانو دەربڕینو گوزارشتو وێناکدنی جیاوازی دەوێت، گەر بکرێت باسی ئەو حاڵەتەمان بۆ بکە، واتە جیاوازی لەرووی زمانەوە بۆ وەرگێڕانی بوارە جیاجیاکان؟

با ئەوەمان لەبیر بێت کە تەنانەت لە رۆمانیشدا ناتوانیت هەموو رۆمانێك بە یەك زمان وەربگێڕێت. زمان مەبەستم شێوازی ئاخاوتنە. هەر رۆمانەی شێوازی خۆی هەڵدەگرێت کە ئەگەر وردبین نەبیت دەیشێوێنیت. ئەگەر تۆ هەموو بەرهەمەکانت بە یەك لەبز و شێوازی

وەرگێڕا، مانای ئەوەیە تەواوی ئەو نووسەرانە وەك یەك دواون. تۆ بڵێی کافکا و کامو و هیدایەت و مەحموودی دەوڵەت ئابادی و هووشەنگی گوڵشیری و مارکیز و ساراماگۆ وەك یەك بنووسن؟

زمانی ئەدەبی زمانێکی فرە ڕەهەندە. زمانێك نییە تەنیا بۆ گەیاندنی مەبەستێك. لە ئەدەبیاتدا زمان لە حاڵەتی ئامرازبوون دێتە دەرێ. وشە خۆی دەبێتە مەبەستی سەرەکی. بەڵام لە دەقی مێژووییدا زمان ئاوێنەی واتایە. وشە ئامرازی گواستنەوەیە. لەسەرێتی ماناکە بگوازێتەوە و بەس. بەڵام زمانی ئەدەب خوێنەر تووشی ڕامان و بیرکردنەوە دەکات و بەرەو ڕەهەندەکانی مانای دەبات. ئەوەیە جیاوازییەکانیان.

پرسیار: یەکێك لە خەلەلەکانی ئەدەبی ئێمە نەبوونی وەرگێڕانی پێچەوانەیە، واتە دەقێك لەکوردییەوە وەرگێڕدرێت بۆ سەر زمانێکی جیهانی، تۆ ئەم خەلەلە بۆچی دەگەڕێنیتەوە، ئاخۆ لەئەدەبی ئێمەدا کۆمەڵێك تێکست نین شایانی ئەوەبن بچنە ناو کولتووری بیانییەوە؟

ئەو بۆشاییە، بۆشایی نەبوونی هۆشیاریی نەتەوەیی و نابەرپرسیارەتیمانە. هێشتا هەستمان بەوە نەکردووە کە پێویستە گەلانی دیکە هەروەك چۆن ئێمە لە ڕێگەی وەرگێڕانی دەقەکانیانەوە دەیانناسین، ئەوانیش ئێمە با لەڕێگەی ئەدەبیاتمانەوە بناسن. ئەو بۆشاییە هی ئەوە نییە ئێمە دەقی شیاوی وەرگێڕانمان نەبێت. ئێمە دەقی زۆر گەورەمان هەیە. دەقی سەرکەوتوو کە دڵنیام ئەگەر بیانییەکان بتوانن بیانخوێننەوە سەریان سووڕ دەمێنێت. کورتە ئاوڕێك لە ڕابردوومان بدەینەوە، ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەی کە ڕێیانکەوتووەتە کوردستان و ئەدەبی زارەکیی ئێمەیان ناسیوە سەریان لێی سووڕ ماوە. ئەوەتا ئۆسکارمان دێت بەیتەکانی ناوچەی موکریان کۆدەکاتەوە و دەیاننووسێتەوە. ئەدی ئێمەی لەگوێی گادا خەوتوو بۆچی خۆمان ئەوکارە ناکەین؟ سوارەی ئیلخانەیزادەی شاعیر لە نووسینێکیدا لەسەر تراژیدیای بەیتی(سەیدەوان) دەڵێت: بەیتی سەیدەوان لە هاملێتی شکسپیر گەورەترە. بەڵام کەس نایەت ئەو بەیتانە و بەرهەمە ئەدەبییەکانی ئێستامان وەربگێڕێتە سەر زمانی گەلانی دیکە. بۆچی؟ چونکە خۆمانمان پێ سووکە. خۆمان لەسەر ئەو باوەڕەین کە لە خەڵکانی دیکە کەمترین. ئەوە ئەوان بەو باوەڕە چەوتەیان گۆشیان کردووین کە خۆمان پێ کەم بێت. هەر وەکوو چۆن ژنان لە

ڕەوتی زەمەندا کۆمەڵگای پیاوسالاری و کولتوور و ئایین وای لێکردوون خۆیان لەناخەوە باوەڕ بە کۆیلەبوونیان بێنن. باوەڕ بەوە بێنن کە لە پیاو کەمترن. ئێمەش وامان لێهاتووە. خۆمان پێ کەمە و هیچیتر. سەیر نییە، نەتەوەیەك، کە بێزی لە جلوبەرگی خۆی هەڵدەستێت و بە هێمای نەخوێندەواری و دواکەوتوویی دادەنێت چۆن دەتوانێت بیر لەوە بکاتەوە کە دەقی شیاوی وەرگێڕانی هەیە؟ چۆن دەتوانێ ڕێز لە ئێستای خۆی بگرێت ئەو نەتەوەیەی بە چاوی سووك لە رابردووی دەڕوانێت. ئەو نەتەوەیەی کە ئەگەر پرۆفیسۆرێکیش جلوبەرگی کوردیی لەبەردا بێت، خەڵکەکەی پێیانوایە نەخوێندەوارە و پێیان سەیرە چۆن لە جلی کوردیدا دەتوانێت بیر بکاتەوەو رۆشنبیریی هەبێت، ئەوە خۆ بەکەمزانین نییە ئەدی چییە؟

پرسیار: وەك زۆربەی کایەکانی ئەدەبو هونەر، خەریکە بواری وەرگێڕانی ئەدەبیش زۆری‌و بۆری تێدەکەوێت، لەم ڕێگەشەوە زۆر دەقی بیانی شێوێنراون بەڵام نەبوونی رەخنەو قسەلەسەرکردنی ئەو دیاردەیە بواری زیتری بەوان داوە، لێرەبەدوا دەزگایەکی چاودێری ئەو بەرهەمانە بەگرنگ نازانیت بۆ ئەوەی بەر بەو بێسەرو بەرییە بگیرێت؟

کام ڕەخنە؟ کامە ڕەخنەگر؟ ئەوەی من دەیبینم زیاتر نان بە قەرز دانە. ئەوانەی خەریکی شێواندنن من بەش بەحاڵی خۆم ناوێرم رەخنەیان لێ بگرم. دەرەقەتی دەسەڵاتی ئیدارییان نایەم. دەزگای چاودێریی دڵسۆز لەکوێ بێنین؟ ئەوانەی ئێستا هەن برۆ بزانم دەوێریت پێیان بڵێی تۆ دڵسۆز نیت؟ چۆن پێیان دەڵێی؟ دەزانم یەکێك لە ڕێگەکان ئەوەیە بەرهەمە لاوازەکانیان بخەیتە بەردەستی و پێیان بڵێی ئەوەتا ئەوە بەڵگەیە. بەڵام دەتوانی لەوە زیاتر چ بڵێی؟

کتێب هەیە بیخوێنیتەوە گریانت دێت. وەرگێڕان نییە کارەساتە. کتێبی ١٥٠٠ لاپەڕەیی کراوەتە ٦٠٠ لاپەڕە و هیچ ئاماژەیەکیشی پێ نەکراوە کە کورت کراوەتەوە. سەرچاوەیەکی زانکۆییشە. لە فارسییەوە کراوەتە کوردی. لەگەڵ ئەوەشدا پڕ پڕە لە تێنەگەیشتن لە زمانە سەرەکییەکەی. کەسیش بۆی نییە ڕەخنەی لێ بگرێت. چونکە هی فلانە مامۆستایە. ناوەکە گرینگترە لە ناوەرۆکەکە.

پرسیار: دووا پرسیارم ئەوەیە بەگشتی چیبکرێت بۆ ئەوەی بزووتنەوەی وەرگێڕان لە وڵاتی ئێمەدا بەشێوەیەکی تەندرووست پێش بکەوێت؟

با تیتۆڵێك لە خەڵكانی پێشكەوتووی تێگەیشتووی پێشگەیشتوو دادڕین. ئەوەش نایەتەدی مەگەر تاکی کۆمەڵگامان هۆشیار بێتەوە. تاك دەبێت لەهەمبەر خۆیدا هەست بە بەرپرسیارەتی بکات. لەگەڵ ئەوەدا کە خەسڵەتەکانی تاکێتیی خۆی بپارێزێت، بەبێ ئەوەی لە کۆمەڵ و باوەڕە باوەکانی کۆمەڵدا بتوێتەوە، هەست بەوە بکات کە لە هەمانکاتدا کە ئەو تاکێکی سەربەخۆیە، خۆیشی هێمای کۆمەڵەکەیەتی. هەست بەوە بکات خۆی کۆمەڵە و کۆمەڵیش ئەو. با بێین تیتۆڵێکیش لە پێشەنگەکانی خۆمان دادڕین. ئەوان لە نەبوونی ئیمکاناتدا چییان خولقاند. بۆچی هەتا ئێستاش هیچ وەرگێڕانێك خۆی لەقەرەی (داغستانی من) و (حەمەدۆك) و (شەرەفنامە) نەدایەوە؟ ئەوان وەکوو ئەوبرادەرەی ئاماژەم پێکرد بەو زمانە کۆنەوە ئەو شاکارانەیان خولقاند، ئەدی بۆچی ئێمە بەو زمانە نوێیەشمان تۆزی پێیانمان نەشکاند؟

ناشوێرم بڵێم با لە زانکۆکان وەرگێران بکرێتە وانەیەکی رەسمی. بەڵام ئاخر ئەوانەی وانەکە دەڵێنەوە کێن؟ کوا هەژارەکان و مەلا شوکرەکان و ....

لە کۆتاییدا پێویستە بڵێم لەگەڵ ئەو هەمووە کەموکووڕیەشدا لەگەڵ تەواوی ئەو رەخنانەشدا کاری زۆر گەورە کراوە، من وەك خۆم دەستخۆشییان لێ دەکەم. با فێری ئەوەش بین لەهەر شوێنێك و هەرکەس کاری باش و بەسوودی کرد، رێزی بگرین و دەستخۆشانەی پێ بڵێین. رەخنەکانیشمان لەرووی دڵسۆزییەوە بن نەك شکاندن و ناوزڕاندن.

❊ ❊ ❊

بەرهەمەکانی وەرگێڕ:

١. ڕۆمانی ژان (نووسینی مارگریت دۆراس).... (دەزگای موکریانی)
٢. پێشەوای ڕابوون (کتێبێکە لەسەر کۆماری کوردستان) .... (دەزگای موکریانی)
٣. ژن لە فەلسەفەی سیاسیی ڕۆژئاوادا .... (دەزگای موکریانی)
٤. کۆیلەکردنی ژنان (نووسینی جۆن ستیوارت میل) .... (دەزگای موکریانی)
٥. ئێمیلی ژان ژاك ڕۆسۆ .... (دەزگای وەرگێڕان)
٦. تاعوونی ئەلبێر کامۆ .... (دەزگای موکریانی) چاپی سێیەم (ڕۆژهەڵات)
٧. دیوی کوێستان) ڕۆمان، ، یەشار کەمال سێ بەرگ .... (دەزگای موکریانی)
٨. سەفەر و ئاسکۆڵەکەی بەختم گوزەل (ڕۆمانێکی مەحموود دەوڵەت ئابادی) .... (دەزگای موکریانی)
٩. سێبەری هەڵۆ (ڕۆمانێکە ئاوڕی لە نهێنییەکانی ژیانی ناپلیۆن بوناپارت داوەتەوە)... (چاپخانەی ڕۆژهەڵات)
١٠. لە لینینەوە بۆ پووتین ( مێژووی سیاسیی ڕووسیا لە ١٩١٧ـەوە تا ٢٠٠١) .... (دەزگای موکریانی)
١١. ئیمپراتۆریی بیزەنتی (مێژوو) .... (دەزگای موکریانی)
١٢. کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست (مێژوو) .... (دەزگای موکریانی)
١٣. ئاغاکانی ئاقچاساز (ڕۆمان، یەشارکەمال) دوو بەرگ .... (دەزگای موکریانی)
١٤. کیژانی کابول (ڕۆمان) .... (ناوەندی ئاوێر)
١٥. یاخی (ڕۆمان/ یەشار کەمال)...(ناوەندی ئاوێر)
١٦. کەوتن (ڕۆمان. ئەلبێر کامو) (دەزگای چینی)
١٧. ئاسییە (ڕۆمان).... (دەزگای چینی)
١٨. یەکەم عەشق (ڕۆمان) ,,,,,(دەزگای چینی)
١٩. لافاوە بەهارییەکان... (دەزگای چینی)
٢٠. گاوان
٢١. بالوول لە کتێب و هەقایەتاندا.... (دەزگای موکریانی)
٢٢. نان و ماچ (کۆچیرۆك، بەرهەمی هاوبەش لەگەڵ جەواد حەیدەری)

۲۳. فیمینیزم (بەرهەمی هاوبەش لەگەڵ کارزان کاوسێن)

**کتێبی ئامادەی چاپ:**

۲٤. مێژووی گەمژەیی (کارنامەی مێژوو) .... (دەزگای موکریانی)

۲٥. سەفەر لە ژووری نووسیندا (رۆمان) .... (دەزگای موکریانی)

۲٦. پێ پەتییەکان. (رۆمان) چاپخانەی رۆژهەڵات